سەرگوزەشتە


منتدى إقرأ الثقافي


# پەڵەخوێنەکانی سەربەفر

نوسینی: ئەدیب یاڵچنقایە
لە تورکییەوە: ڕێبوار هەمەوەندی

ئەم سەرگوزەشتەیە باس لە ڕووداو و کارەسات و داستانەکانی شەڕەکانی ساڵی ١٩٩٦ بۆ ١٩٩٧ دەکات کەلە چیاکانی دەرسیم هاتونەتە ئاراوە، بەسەرهات و ڕووداوەکانی ئەم کتێبە لەسەرزاری پاڵەوانەکانی یەکەمی ناو ئەو شەڕەوانەوە گێڕدراونەتەوە، بەڵام بۆ پوخت کردنی ئەم بەرهەمە لەبارەی هەندێک ڕووداو و شوێن و ناو و کات گۆڕانکاری کراوە، جگە لەو وردە کارییە تەکنیکیانە هەموو ڕووداوەکان وەکو خۆی نوسراونەتەوە، لەناخی دڵمەوە زۆر سوپاسی هەموو ئەو هەڤاڵانە دەکەم کە بۆ نوسینەوەی ئەم سەرگوزەشتەیە هاوکارییان کردم.

**نێوان مانگەکانی تەموز و تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٤**

**تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠١٣**

**چەولیک ( بینگۆل )**

**ئەدیب یالچنقایە**

## پێشەکی

**پەڵە خوێنەکانی سەر بەفر یان گەریلاکانی ناو ئاگر**

وەرگێرانێکی تازەی وەرگێری بە توانا و شیرینووس ڕێبوار هەمەوەندیم خوێندەوە "پەڵە خوێنەکانی سەر بەفر "ئەو ڕۆمانەی، باسی ژیان و دژواری و سەختیەکانی گەریلا گیانبازەکانی هەرێمی دەرسیم دەکات، ئەو هەرێمەی دەسەڵاتدارانی تورک هەمیشە بە چاوی ڕقەوە سەیری دەکەن، کە ئەم ڕۆمانەم دەخوێندەوە خەیاڵ جاروبار دەمیبرد بۆ یاداشتەکانی ساکینە جانسز یان کتێبی چادرەکان، ئەدیب یاڵچنقایە ئەم ڕۆمانە ڕاستی و پڕ گیانبازیەی نووسیوە کە "ڕووداوەکانی ساڵانی ١٩٩٦ و ١٩٩٧ ی چیاکانی دەرسیمن "من گووتم ئەوە چ دڵێکە ئەم ڕاستیانە دەگێڕێتەوە و نابێ بە ناو، چ دڵێکە لەبەردەم گیانبازی و ئازایەتی ئەو کیژ و کوڕە کوردە زازا و عەلەویانەدا خۆی بۆ دەگیرێ. ئەو کیژ و کوڕانە چ بیرو باوەڕێک هێناونی بۆ نێو ئەو دۆزەخە، جگە لە بیر و باوەڕی پەکەکە و خەمی ئازادی و ئاپۆچێتی، ڕۆمانەکە هێندە مەستی کردبووم لە هەندێ شوێن پێ بە پێ لەتەک گەریلاکاندا بووم، وەک ئەوە وابوو منیش لەو هەرێمە بم و شاخ و شیوو دۆڵەکان تەی بکەم.

کۆی ڕۆمانەکە قسە کردنە لە گەریلای جەربەزە و نەبەزیوو، گەریلای بە چۆکا هاتوو کە دیارە وەک پێویست بە پەروەردە ڕانەگەیووە، یان هاوڕێی نیوە ڕێ بووە، دڕندەیی سوپای تورک کە بە چەک و چۆڵی ئەڵمانی و ئەمەریکی و ناتۆ خەڵکانێک دەکوژێت جگە لە ئازادی و بوون و خۆ خاوەنی داوای هیچی تر ناکەن، دەکرێ مرۆڤ لەسەر هەریەک لەمانە هەڵوەستە بکات، بۆ من جگە لە هەڵوەستە هیچی تر ناکەم، چونکە لێدەگەڕێم خوێنەر خۆی ئەم شاکاری قارەمانەتی و بەرخودانە بخوێنێتەوە، بە ئومێدی ئەوەی ئەم سەرنجانەی من هۆکاری زیاتر خوێندنەوەی ئەم ڕووداوانە بن، هەڵبەت ئەوەش گرنگە بزانرێ کە پێشتر ڕۆمانەکە بە تورکی نوسراوە.

**ڕۆمانەکە لەسەر چی وەستاوە:**

بەڕێ ئەوەمان وت کە ئەمە هەموو ڕووداوی ڕاستین و جگە لە گێڕانەوە هیچی تریان لەبارەوە نەکراوە. "مەگەر تەکنیک و بە ڕۆمانکردن "جگە لەوەش ئەوە نەبێ کە ڕەنگە نووسەر لە باری دەرونیدا زۆر جار خۆی ڕۆچووبێتە نێو ناخی کەسەکانەوە. کەسە چاک و خراپەکان، ئەمەش بۆ هەر نووسەرێک کە دەیەوێت ڕووداوێک لە چوارچێوەی دەقێکی ئەدەبیدا دابڕێژێتەوە پێویستیەکی گرنگە. لەتەک ڕۆچوون بە ناخ و هەستی کەسەکانیشدا، نووسەر بیری نەچووە زۆر بە وردی باسی ناوچەکە، شاخ و داخەکان، کەسەکان، زستانی سەخت هەروەها ستەمکاری تورک دەرهەق بە کورد بکات و لەوێشەوە ئێمەی گەڕاندوەتەوە بۆ کوشت و بڕ، "جینۆسایدی دەرسیم "جینۆسایدی دەرسیمی تێکەڵ بەو ژیانە سەختەی ئێستای کورد و گەریلا کردووە. لە دەرسیمی ١٩٣٨ دا سوپا دڕندەکە شانازیان بە پەڕاندنی سەری قوربانییە سڤیلەکانەوە دەکرد. لە ئێستاشدا سەربازەکانی تورک شانازی بە لەت و پەت کردن و چاو دەرهێنانی ئەو گەریلایەنەوە کە بە شەهیدی دەکەونە دەستیان. هەروەها باسی ئەو زەحمەتی و نادادی و برسێتیەی دەوڵەتی تورک هەمبەر کوردستان گرتویەتیە بەر. لەوێدا قسە لە زۆر شت دەکرێت ئێمە بە کورتی لەسەر چەند لایەنێک هەڵوەستە دەکەین:

**بیرو باوەڕ و بەردەوامی:**

ئەگەر بیرو باوەڕ و ئاپۆچێتی و کوردایەتی نەبێت زۆر ئەستەمە مرۆڤ لە نێو زەبرو زەنگی دوژمن و سروشتا بتوانێ بەرگە بگرێت و بە چۆکدا نەیەت، ئەوە بیرو باوەڕە کە کچان و کوڕانی ١٨ ساڵ و کەمتر و زیاتر لە نێو ماڵ و ئامێزی دایک و باوک و جێگەی گەرم و نەرم بەرەو ئەو چیا سەختانە دەبات، لەم ڕۆمانە ڕاستەقینەیەدا زۆر لە سەر ئەو بابەتە هەڵوەستە کراوە. بیرو باوەڕ مرۆڤ بۆ ماوەی چل ڕۆژ بێ نان و خۆراک دەهێڵێتەوە بێ ئەوەی بیر لە بڕیاری بە چۆکدا هاتن و خۆ بە دەستەوە دان بکاتەوە، بێ ئەوەی ئەو شوێنە بە جێبهێڵێت کە بۆی دیاری کراوە. نمونەی بەرچەم، شاهین، قارەمان، دیار، ناریا و ساریا و زۆری تر. یەکەکە لە بارەی بیرو باوەڕەوە تەنیا حزبی خاوەن ئیرادەی

ئێستای سەر گۆی زەویە کە سەرەڕای هەموو تەنگ پێهەڵچنینێک بەردەوامی بە خۆی دەدات و هەنگاوی گەورە دەنێت.

**پەروەردە بە گشتی:**

کە باسی پەروەردە دەکرێت، قسە لە سەر پەروەردەی سیاسی، سەربازی، جەستەیی، هەروەها پەروەردەی گیانی "رەوانی "دەکرێت. پەکەکە حزبی دیسپیپلین و پەروەردەیە، حزبێکە دوو بارە مرۆڤ دروست دەکاتەوە، ئەم پەروەردە هەمەییە لە ڕۆمانەکەدا لە زۆر شوێن هەڵوەستەی لە سەر دەکرێت و لە زۆربواری گفتوگۆو گەنگەشەدا دێتە بەرباس، ئەوە جگە لە ڕەخنە و ڕەخنە لەخۆ گرتن، جگە لە ئاکاری بەشداری گفتوگۆ و قسە کردن کە جۆرێک لە دەستوری وەرگرتووە، نوسەر دەیەوێ بەردەوام ئەمەمان بیر بخاتەوە و پێمان بڵێت کە پەروەردە چ ڕۆڵێکی ئەرێنی لە ژیانی مرۆڤەکاندا دەبینێت.

**خیانەت و خیانەتکاری:**

بەرخودان هەیە، ئازایەتی هەیە، بیرو باوەڕ هەیە، پەروەردەی هەمە لایەن هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا خیانەت هەیە، خۆ بەدەستەوەدان و سیخوڕی هەیە، جاشێتی هەیە، حەیدەرەکان و عەلی موساکان هەن، چەند گرنگە مرۆڤ لەسەر کەم و کوڕی و کێماسیەکانی خۆیان هەڵوەستە بکەن، ئەمە بۆ بزوتنەوەیەک بۆ حزبێکی شۆڕشگێڕ زۆر گرنگترە لەو نێوانەدا خائینیش هەن، ئەو جۆرەش هەن کە مرۆڤ لە خەبات و بەرخودان و جوامێری خاو دەکەنەوە، ناکرێ بڵێین ئەستەمە دزە بکرێتە نێو ئاپۆچیەکانەوە، دزە دەکرێت، بەڵام دیارە لە نێو ئاپۆچیەکاندا تا سەر جێی نابێتەوە، هەندێک لە خائینەکان بۆ ئەوەی لای دوژمن خۆیان شیرین بکەن، کارێک دەکەن کە دوژمن پەی پێنابات، ئەوان دەکەونە ڕەوشێکی ناجۆرەوە چیرۆکی ڕێبەری برازای شێخ ڕەزای دەرسیم هەمان ئەو خیانەتەیە کە تا ئێستا لە نێو کوردان هەیە، هیچ نەتەوەیەک هێندەی کورد مرۆڤی ئازاو عەگیدی نین، هیچ نەتەوەیەکیش بەو جۆرە خائینی تیا سەوز نابێت، ڕەنگە ئەمەش بەشێکی پەیوەست بێت بەو دابەشکاری و ستەمەوە کە

دەرهەق کورد و خاکەکەی کراوە بۆ ئەوەی خائینەکان باشتر بناسرێن، لەم کتێبەدا دوو نمونەی دیارو چەندین وێنەی دیکەمان نیشان دەدرێت، حەیدەر و عەلی موسا لەو خائین و خۆفرۆشانەن کە هەر بەوە لێناگەڕێن خۆیان بدەنەوە دەستی دوژمن، هەڤاڵەکانیان دەکوژن و دواتریش دەبنە چاوساغ و ڕێنوێنی فاشیستەکان.

## دڕندەیی و شێواندنی تەرم:

لەو داستانە ڕاستیەی دەرسیمدا باس لە بێئاوەزی دڕندەیی سەربازەکانی تورک دەکرێت بەرانبەر تەرمی گیانبازەکانی پەکەکە لە دوای ئەوەی بە شەهیدی دەکەونە دەستیان، دەسکاری کردنی لاشەی ٣٦ شەهید دوای ئەوەی کاڵاکانیان لە بەریان دەکرێتەوە، ئەو پەڕی ناشرینی سوپایەک دەردەخات.کە گوایە لە ناتۆدایە و دەبێ لانی کەم ئاکاری مامەڵە کردنی لەتەک شەهید و دیلدا جیاواز بێت، بڕینی ئەندامەکانی جەستە و هەڵدڕینی سک و هەڵکۆڵینی چاو ئەمانە ئەو ڕەوشتە داعشیانەن کە نیدی میدیای جیهانی و دنیای دەرەوە و ناتۆ بە گشتی لە ئاستی کەرو کاسن، لە دوا شەڕیشدا پاش ئەوەی بەشێک لە گەریلاکان بە شەهیدی دەستی سوپای تورک دەکەون لە سەر چیای "دۆلۆبابا "ئەفسەرەکە دەڵێ هەر بە کوشتن وازیان لێمەهێنن لاشەکانیشیان بسوتێنن، بە گشتی خوێندنەوەی ئەم داستانە ئەو پەڕی تێرۆرسیتی و بێ ئاکاری سوپای تورک نیشانی خوێنەر دەدات، سوپایەک کە هەموو سیماکانی تیرۆریستی لە خۆیدا هەڵگرتووە.

## دوا قسە:

لەم داستانەدا جگە لەوەی لە نێو داستانەکاندا گێڕانەوەی داستانێکی دیکەی ئەو گیانبازانە هەیە و ئاریا و ساریا دەیخوێننەوە کە بێستا پێیداون، دوای ئەوەی کەمێکی دەخوێننەوە لە دواتریشدا بەهۆی ئەوەی ئاو دەیبات هەڤاڵ بەرچەم خۆی بۆیان تەواو دەکات، دەیان هەڵوەستە و چرکە ساتی گرنگ هەن کە شایانی کردنە فلیمن تا دنیا بزانێ ئەو گیانبازانە چۆن داکۆکی

له بوون و مانەوە دەکەن، بۆ من ناوی شوێنەکان و پیرۆزگا و ئەفسانەی ناونانەکانیش جێگەی هەڵوەستەن، کە ئەمە لە پارچەکانی دیکەش هەروایە، هەروەها نزیکایەتیەکی سەرنجڕاکێش لەم پەیوەندیەدا هەیە، "دۆلۆبابا، تونی باباعومرە. ئەربەبا، باوەگوڕگوڕ، باوەشاسوار، بابە ڕوشە "و هتد.

وێڕای دەستخۆشیم بۆ کاک ڕێبوار هەمەوەندی چاوەڕوانی وەرگێڕانی دیکەی ئەوم.

**لەتیف فاتیح فەرەج**

بەرچەم لە ئەشکەوتی جنۆکەکان هاتە دەرەوە، بەبێ ئەوەی گوێبداتە ئەو گەریلایانەی کە گرووپ، گرووپ خڕببونەوە، بەلایاندا تێپەڕی، کەمێکی تر پەروەردە دەستی پێدەکرد، بەڵام لەوە دەچوو کە بەرچەم هیچ نیەتی نەبێت بەشداری پەروردەکە بکات، هۆیەکەشی ئەوەبوو کە کەمێک لەمەوبەر لەناو ئەم ئەشکەوتەدا کەلە مێژووی مرۆڤایەتی کۆنترە لەگەڵ هەڤاڵ بێستایدا گەنگەشەیەکی زۆر جدی کردبوو تەنانەت دڵی یەکتریشیان شکاندبوو، هەربۆیە توڕە و بەقین بوو، دەموچاوی دابووبەیەکدا، سەرەڕای ئەوەی تاقمی مەغزەنەکانی بەقەدەوەبوو، بەڵام چەکەکەی بەشانەوە نەبوو، ئەوەی گەریلایەتی کردبێت دەزانێت کە ئەمە مانای چییە، ئەگەر چەکەکەت بەتایبەتی لەلای یەکێک دانەنابێت کە بەرچەم هەرگیز ئەمەی نەدەکرد مانای وابوو کە چەک کراوە.

لەدوورەوە هەڤاڵ پەلۆیان لێی دەڕوانی لەدڵی خۆیدا وتی ئەرێ ئەم کچە چی تاوانێکی ئەنجامداوە؟! لەڕاستیدا ئەوەی بەم حاڵەوە بەرچەمی دەبینی بیری لەهەمان شت دەکردەوە، هەڤاڵەکانی ئەوێی هەندێک بە مەراق و بەزەردەخەنە و کەمێکیش بە سەرسوڕمانەوە لەویان دەڕوانی، بەڵام بەرچەم بەبێ ئەوەی تەماشایان بکات و گرنگیان پێبدات لەڕێکردنی خۆی بەردەوام بوو، سەرەڕای ئەوەی ماوەیەک ڕێی کردبوو، بەڵام هەستی دەکرد کە هێشتا لەدواوە هەڤاڵانی لەو دەڕوانن، هەرچەندە خواستێکی نهێنی دەیویست ئاوڕی پێبداتەوە و تەماشای دوای خۆی بکات، بەڵام ئەمەی نەکرد، هەنگاوەکانی خێراتر کرد، لەدەرەوەی کەمپەکە لەو هەورازەی کە بەستەڵەک بوو ڕووبەڕووی هەڤاڵ عەلی موسا بۆوە کە لە کۆنترۆڵکردنی خاڵی ئێشکگرەکان دەگەڕایەوە.

عەلی موسا لێی پرسی "بۆکوێ دەچیت؟ "بەرچەم تەماشای عەلی موسای کرد، بەرچەم هەرلە نوکی پەنجەوە هەتا کەللە سەرە کەچەڵەکەی لە عەلی موسا ورد بۆوە، بەرچەم زۆر دڵنیابوو لەوەی کە دوو جۆر پیاو هەیە، یەکێکیان ئەوانەن کە بەزەییان بە ژنان دێتەوە و بەچاوی بەرماوەی ئازارەوە لێی دەڕوانن و بە بریندار و بەو مەلە باڵشکاوانەیان دەزانن کە ناتوانن بفڕن،

ئەم جۆرە پیاوانە تەنازولی ئەوە ناکەن کە تەماشای دەموو چاوی ژنیش بکەن، ئەوکاتەی ژنێک دەبینن سیمایان دەگۆڕدرێت و جدییەتییەکی سەختەکارانە نیشان دەدەن، ئەمانە ئەوانەن کە وەک نوێنەری ئەو تێزەن کە دەڵێت ژن نیوەی مرۆڤە، مەخابن ئەو جۆرانەش لەناوماندا ماخولانیانە، هەندێک پیاویش هەن بەتەواوەتی مامەحەمەچێتی دەکەن، لەهەرکوێیەک ژنێک ببینن بێشک خەندەیەکی بۆ دەکات و بەبێ هیچ هۆکارێک گاڵتەیەکی لەگەڵ دەکات، ئامانجیان ئەوەیە کە خۆیان وەک کەسێکی شیرین نیشان بدەن و سەرەڕای ئەمەش بەبێ هیچ هۆکارێک مزارێک ئەدۆزنەوە و دەکەونە ناو چەلەحانێوە، ئەم جۆرە پیاوانە بەبێ ئەوەی درک بەخۆیان بکەن چواردەورەکەیان زۆرلێیان بێ حەوسەڵە دەبن.

بەرچەم دەیزانی کە عەلی موسا لەجۆری شێوازی پیاوانی دووەمە هەربۆیە هەرگیز حەزی لێنەدەکرد، ئێستا لەم حاڵەتەیدا کە ئەوەندە تووڕەیە و ئارەزووی ئەوە دەکات کەلەناو هەڤاڵەکانیدا دووربکەوێتەوە و بەتاقی تەنیا بمێنێتەوە لەناکاو تەقینەوەی بە ڕووی عەلی موسادا و لەوەش زیاتر ئەو پرسیارە بێ مانایەی کە بۆکوێ دەچێت؟ ناڕەحەتی کردبوو، بەرچەم بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن وەڵامی عەلی موسا بداتەوە، لەئاکامدا پێیووت:

"بۆچی بەلاتەوە زۆر گرنگە کە بزانیت بۆ کوێ دەچم؟"

"یەعنی چی؟"

بەرچەم پرسیارەکەی یەکەمی دووبارە کردەوە:

"بۆچی بەلاتەوە زۆر گرنگە کە بزانیت بۆکوێ دەچم؟"

"نەخێر من هەروا پرسیم!"

"پرسیاری هەروا و پێکەنینی هەروا و گاڵتەکردنی هەروا و قسەکردنی هەروا ئەرێ تۆ جگە لە هەروا کاری ترت نییە؟!"

عەلی موسا ڕەنگی دەموچاوی تێکچوو، گوێیەکانی سوور هەڵگەڕان، بەم ڕەوشە شڵەژاوببوو، بەدەم ورتە ورتەوە دەیویست مەسەلەکە بگۆڕێت و پێیووت:

"کەمێک لەمەوبەر هەڤاڵە گەریلا نوێیەکانم بینی پرسیاری دوو کچە

گەریلاکانم لێکردن ویستم لەتۆش پرسم نەتبینیون، خۆت دەزانیت هەردووکاین وەکو منداڵ وان، ناریا و ساریا ناوەکانیشیان لەیەک دەچێت بە وەزن و قافییەن".

"دووبارە دەستتکردەوە بە قسەکردنی هەروا!"

عەلی موسا هەستی کردبوو هەتا قسەبکات دەچێت بەناخی زەویدا هەربۆیە پێیووت:

"لەوە دەچێت ئەمڕۆ حەوسەڵەت نەبێت، واباشترە من بڕۆم".

بەخێرایی لە بەرچەم دوور کەوتەوە.

کاتێک عەلی موسا بە هەورازەکەدا هەڵگژا بەرچەم لێی دەڕوانی، ئەوەندە تووڕە ببوو دەستەکانی دەلەرزین، بەرچەم بەدەم بۆڵەبۆڵەوە دەستی کردەوە بەڕێکردن، کاتێک گەیشتە لای شەلالەکە ڕۆژهەڵاتبوو، کەشوهەواش زۆر سارد بوو، بەڵام هەموو ئەمانەی بەلاوە گرنگ نەبوو، تەماشای شەلالەکەی کرد کە جوانترین دیمەنی دەربەندی عەلی بوو، پێویستی بە کاتێکی زۆر بوو بۆئەوەی توڕەیەکەی دامرکێنێتەوە، بەڵام ئەمجارەیان وایلێنەهات، سەرما توڕەیی و دڵشکاوێکەیشی کردبوو بە بەستەڵەک، بیری لەوە دەکردەوە بۆچی هەمیشە تەنها لەگەڵ هەڤاڵ بێستادا شەڕ دەکات، لەڕاستیدا ئەو مەسەلەیەی لە نێوانیان هاتبووە ئاراوە شتێکی واش نەبوو کەبەو جۆرە گەورە بکرێتەوە، بەخۆی وت لەوە دەچێت کێچێکمان کردبێت بە دێو.

ئێستا بەرچەم بەوە ناڕەحەت ببوو کە کەسێکی لەگەڵدا نەبوو کە باسی هەست و نەستەکانی خۆی بۆ بکات و دەردی دڵی خۆی بۆهەڵڕێژێت، ئەم تەنیاییە زەحمەتە و لەوانەیە لەم حاڵەتانەدا مرۆڤ لە کۆنترۆڵ دەربچێت، ئەندێشە و خەیاڵیش هەرچەندە ئاڵۆزیش بن مرۆڤ هەوڵدەدات کە کەسێک بدۆزێتەوە تاکو قسەی خێری بۆبکات، لەم تۆرانەدا ئەمە ئەوە ناگەهێنێت کە مرۆڤ خۆپەرستانە ڕەفتار دەکات یان خۆی خۆشەویست دەکات، بەرچەم لەو ڕۆژەوەی خۆی ناسیبوو درکی بە شتێک کردبوو، دەیزانی کە هەمیشە وابەستەی ئەو ڕاستیانە بووە کەبە گشتی لەلایەن خەڵکی ترەوە قەبوڵ کراون، هەرگیز بە ڕەفتار و دونیای ناخی خۆی لە خەڵکی جیا نەدەکردەوە،

لەهەمانکاتدا نەیدەهێشت ببێت بەکەسێکی سادەش، بێگومان بوون بە کەسێکی جیاواز لەوە خراپتر نەبوو کە لە کەسێکی تر بچیت.

کۆمەڵە گریمانە و پرسیارێک هەبوون کە مێشکیان جەنجاڵ کردبوو، هەربەهۆی ئەمەشەوە بوو کەبە تەنیا مابۆوە، تەنانەت هەر لەبەرئەوەش بوو کە نەیدەزانی کە ئایا ناحەق لەهەمبەر کراوە یان دەبێت لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات، ئەوەی ڕاستی بێت شەڕەکەی ئەمڕۆ لەبەر خاتری چەکێک هاتبووە ئاراوە، خوشکە گەورەکەی کە ناوی بێستایە و لەهەمانکاتیشدا فەرماندەی بوو داوای لێکردبوو کە بۆچەند کاتژمێرێک چەکەکەی بدات بە گەریلایەک، دوایش ئەم هەراوزەنایەی نێوانیان هاتبووە ئاراوە، بەرچەم وەک بورکانێک تەقیبۆوە، ئێستا بیری لە ڕەفتارەکەی خۆی دەکردەوە کەلەناو ئەشکەوتەکە نواندبووی، دوو بۆچونی جیاواز لەناو مێشکیدا لەناو خۆیان شەڕیان دەکرد، یەکێکیان دەیووت کە بەرچەم ناحەق بووە و ئەویتریان دەیووت بەرچەم لەسەر حەق بووە، هەروەها لەهەمانکاتدا لەدڵی خۆیشیدا دەیووت لەوانەیە لەبەرئەوەی بێستا خوشکە گەورەمە بۆیە ئەم نازانە دەکەم، بیری لەوکاتانەی کردەوە کە تازە ببوو بە گەریلا، خەندەیەکی شیرین بەسەر لێوەکانی نیشانەوە، پاشانیش شەرم دایگرت.

بەرچەم لە ناوچەی هۆزاتەوە بەڕێکەوتبوو بۆ ناوچەی دەربەندی عەلی، بەسەردان هاتبوو تەنانەت مەبەستی ئەوەش نەبوو کە ببێت بە گەریلا، بیستبووی کە خوشکە گەورەکەی واتا بێستا کە ببوو بە گەریلا لەو ناوچەیەیە ئەویش چوو بوو بۆئەوێ تاکو بیباتەوە بۆماڵەوە، ئەو ڕۆژەی گەیشتبووە دەربەندی عەلی لەهەمبەر شەلالەکە واتا ئەو شوێنەی کە ئێستا لێی بوو لەلایەن دادەی و چەند گەریلایەکەوە پێشوازیان لێکردبوو، ئەوەندە بەجوانی و بە ڕێز و خۆشەویستییەوە پێشوازیان لێکردبوو تەنها سێ ڕۆژی بەس بوو کە درک بکات کە حیسابەکەی ماڵەوەی لەگەڵ ئەمەی ئێرەدا ناگونجێت، دوای سێ ڕۆژ بەرچەم لەبیری دەکات کەهاتووە بەدوای دادەی و خۆی دەسەپێنێت کە وەک گەریلایەک قەبوڵی بکەن، دادەشی پێیوابوو کە ئەم خواستەی بەرچەم خواستێکی کاتییە کەلەئاکامی هەستی سۆزەکیانەوە سەرچاوەی گرتووە،

هەرچەندە ئێستا هەوڵێکی زۆری دابوو تاکو ڕەوانەی بکاتەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەخستبوو.

سێ ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕی بوو، ئێستا دادەی بووە بە فەرماندەی کەرت، خۆیشی چەندینجار ئەرکی بەرپرسیارێتی جیاوازی وەرگرتبوو، تەنانەت فەرماندارێتیشی کردبوو، بەرچەم تەمەنی ٢١ ساڵ بوو، سەرەڕای ئەوەی خڕیلە و باڵا کورت بوو، بەڵام گورجوگۆڵ بوو، کەسێکی باوەڕپێکراو بوو، لەبەر ئەوەی کەسێک بوو زوو ڕایخۆی دەهێنایە زمان و هەڵوێستی نیشان دەدا و زووش شت فێر دەبوو هەموو ئەمانە ببوون بە هۆکار کە هەڤاڵەکانی ڕێزی لێبگرن، سەرەڕای ئەوەی زوو زوو هاواری بەسەر چواردەورەکەی دەکرد، بەڵام بەهۆی کەلە ڕەقێکەیەوە توانی بووی کە لەلای هەڤاڵەکانی خۆی خۆشەویست بکات، هەڤاڵ پالۆ ناوی نابوو گوڵە بەعزەکە، لەبچوکترین شتدا دڵی دەشکا و ماوەیەک هیچ قسەی نەدەکرد، هەڤاڵ شاهینیشیان پێیدەوت "سحیرباز". لەسەرەتا بەم نازناوانە زۆر قەڵس ببوو، تەنانەت بەبێ ڕێزیش ناوزەندی دەکرد، بەڵام کاتێک هەڤاڵ شاهین شیکاری بۆ ئەم مەسەلەیەی سیحربازە کردبوو کەلە سەردەمی چاخی ناوین بەژنانێک دەوترا کە لێپرسینەوەکەر و ژنانێکن کە کاهینن و تەنانەت لە کلیسەکاندا هەزارەها ژنیان بەهۆی ئەو توانایانەیانەوە کوشتووە کە گوایە بە شێوازی سیحربازانە ژیاون، هەربۆیە بەرچەم دوای ئەم شیکار و زانیاریانە بە نازناوی سیحرباز دڵخۆش ببوو، بەدەر لە هەموو ئەم شتانەش ئەوەی هۆکار بوو کە بەرچەم لەناو هەڤاڵەکانیدا ڕێزداری بکات چاونەترسی و شۆڕشگێڕێتی و پابەندبونەکەی بوو بە تەڤگەر و هەڤاڵەکانیەوەی، لەناو گەریلادا هۆکاری گەورە بوونەوەی پلەوپایە هەر ئەو هۆکارانانەن.

بەرچەم تەماشایەکی سەعاتەکەی دەستی کرد، کاتێکی زۆر بەسەرچوو بوو، دەیزانی ئەگەر ماوەیەکی زۆر لەکەمپەکە دوورە پەرێزبێت بەکارێکی ناشاز لێی دەڕوانن، لەوشوێنەی لێی درێژ ببوو بەشێوەیەکی نەویستانە خۆی ڤیتکردەوە، لە ئەشکەوتەکە هاتەدەرەوە و ڕێگەکەی گرتەبەر، لەهەمبەر شەلالەکە ڕاوەستا و چاوی لێبڕی، سەرەڕای ئەوەی کەشوهەوا زۆریش

ساردبوو هەستی کرد کە وەرزی بەهار نزیک بۆتەوە، مانگێکی تر سەرلەنوێ سرووشت نوێدەبێتەوە و ئەم زستانەی کە بۆ گەریلا وەک زیندان وایە کۆتایی پێدێت.

بەرچەم بەرەو کەمپەکەی نزیک دەربەندی عەلی کەوتەرێ، لەرێگە چاوی کەوت بە شاهین کەپێشوتر لە کەمپەکەدا دوو گەریلای نوێی پێیان ناساندبوو کە ناویان ئاریا و ساریا بوو، کەوتەوە بیری کە عەلی موساش باسیانی کردبوو، کاتێک شاهین بەرچەمی بەتەنیا بینی لێی پرسی کەبۆچی لەناو پەروەردەدا نییە؟ لەبەرئەوەی هیچ وەڵامێکی نەبوو سەری خۆی دانەواند و پێیەکی لە خاکەکە گیرکردوو کەوتە کۆڵینی خۆڵەکانی ژێر پێی، جارێکی تر هەمان شتی دووبارە کردبۆوە کە هەمیشە دەیکرد. شاهین حاڵی بوو کە شتێکی ناخوازیار و ناشاز هاتۆتە ئاراوە، شاهین لێی پرسی:

"هیچ بووە؟"

"نەخێر لەگەڵ بێستا کەمێک گەنگەشەمان بوو".

"لەبەرچی بوو؟"

"بەردەوام چەکەکەم لێدەسێنێت و دەیدات بە گەریلایەکی تر!"

شاهین زەحمەتی نەکێشا لە حاڵی نەبوونی مەسەلەکە، بۆئەوەی لەبەرچاوی ئەم دوو گەریلا نوێیەدا زیاتر شەرمەزار نەبێت مەسەلەکەی گۆڕی، هەربۆیە پێیووت:

"ئەمانە دوو هەڤاڵە نوێیەکانمانن یەکتریتان ناسی؟"

بەرچەم خۆی پێناساندن، چاو شین و پرچ زەردەکەیان ناوی ساریا بوو، دەموچاوی ئەوەندە سپی و ناسک و پرشنگدار بوو هەرلە ئێستاوە دیاربوو کە بەرگەی ئەم هەلومەرجەی سەر شاخ و گرد و نشێوانە و سەرما وگەرما ناگرێت، ئاریایان سیمایەکی منداڵانەی هەبوو، چاوەکانی دەدرەوشانەوە و ئەسمەر و کەمێک باڵا کورت بوو، تایبەتمەندی ئاریایان ئەوەبوو کە هەمیشە دەم بەخەندەبوو، ددانەکانی وەک بەفر سپی بوون و کچێکی شیرین و جوان بوو، کەپێدەکەنی وەک گوڵ دەکرایەوە، بەرچەم بە جوانێکەی سەرسام مابوو، پێشوتر کەسێکی تری نەبینی بوو کە پێکەنین ئەوەندەی ئەم کچە لێی

بوەشێتەوە و جوانی بکات.

کاکەی ساریا کەسێک بووە لە تێکۆشەرە کۆنەکان، ماوەیەکی دوورو درێژ کاکی لە زیندان مابۆوە، کە ئازادیش ببوو خۆی گەیاندبووە سەر چیا، لە قسەکانی دواییاندا ساریا هێنابوویە زمان کە لەوکاتەوەی قۆناغی سەرەتایی خوێندووە بەردەوام کتێبی تریشی خوێندۆتەوە و تەنانەت لەبارەی ژیانی گەریلاوە ئەوەندە شت دەزانێت کە گەریلا کۆنەکانیش ئەوەندەی ئەم شارەزا نین، ئاریایان بە پێچەوانەی ساریا کەسێکی کەمدوو بوو لە چواردەورەکەی دەڕوانی و بە قسەکان پێدەکەنی و ئەگەر پرسیاری لێنەکرایە قسەی نەدەکرد، ئەوکاتانەی قسەوباس دەهاتە ئاراوە و لەبارەی مژارێکەوە قسەدەکرا کە نۆبە دەهاتە سەر ئەم بێزار دەبوو، تەنانەت بە دووبارە بوونەوەی قسەکانیش نارەحەت دەبوو، سەرەڕای ئەمەش بە سەبر بوو گوێی بۆ چواردەوری خۆی دەگرت، شاهین و بەرچەم و دوو گەریلا نوێیەکەیان بە هێواشی و بەکاوخۆیان بەرەو کەمپەکە کەوتنە ڕێ، پاشانیش چوونە سەر گردێکی بەرز و دانیشتن، لێرەوە دەیانتوانی کەمپەکەیان و چیاکانی ئەوبەریشیان ببینن.

شاهین وتی "ئێرە دەربەندی عەلییە، ئێرە ئەو ناوچەیەیە کە سنورەکانی هۆزات و چەمیشگەزەک و ئۆڤەجیک بەیەکەوە گرێدەدات، بۆئێمە شوێنێکی ستراتیژییە". پاشان شاهین بیری کردەوە لەوانەیە ئەم دوو هەڤاڵە بە وشەی ستراتیژی نامۆ بن، بەڵام لەم بارەیەشەوە هیچ زانیارییەکی نەهێنایە زمان، شاهین پێیانیوت "ئێوە ئەم شتانەتان دەزانی؟ "سارییایان وتی "بەڵێ دەزانین هەروەها زێی قوتوش هەیە سەرەڕای ئەوەی ئەویش شوێنێکی فراوانیشە، بەڵام گەریلا زیاتر دەربەندی عەلییان پێباشترە". شاهین لێی پرسی "چۆن ئەم شتانە دەزانی؟ "ساریا وتی "ئێمە خەڵکی دێرسیمین". شاهین باسی چیای مارانی کرد بەهۆی مارەوە و چیای گامیر لەناکامی سەرماوە ناوەکەی سەرچاوە دەگرێت و کە بەگوێرەی چیرۆکەکان بێت گوایە ئەوەندە سارده تەنانەت کاتی خۆی گامێشیشی ڕەق کردۆتەوە، ناوی مونزوور بەهۆی ئاوەکەیەوە کە وەک شیر وایە، زێی تاغار بەهۆی سەرشێتی شەپۆلەکانی و چیای بۆزان بەهۆی گونجاوی شوێنە چاودێریکانێوە و هەروەها چی دەزانی لەبارەی ئینجە بەل و زێی ئاشتی

هەموویانی بۆباسکردن.

ئاریا و ساریا زۆر بە جوانی گوێیان بۆ شاهین گرتبوو، بەڵام ئەو شوێنەی مایەی مەراق ئەوان بوو دەربەندی عەلی بوو، شاهین بەردەوام بوو لە قسەکانی و پێیانیوت "دەروازەی دەربەندی عەلی لە گوندی دەرە دەست پێدەکات، ئەم ناوەش یان بەهۆی گوندە وێرانبۆکەیەوە سەرچاوە دەگرێت یان بەهۆی ئاسەواری کۆشکە کۆنەکەوە، لەیەکەم نیگادا زەحمەتە و مەحاڵە تەخمینی ئەوە بکرێت کە دەربەندەکە لەم دەروازەیەوە دەست پێدەکات، دوای تێپەڕبوون لە دەروازەی دەربەندەکە هەست دەکەیت کە ئەم دەربەندە هەروا ساکار نییە، سەرەتا ڕێگەیەک کەلە بەرد چنراوە دێتە ڕێت، دوای ئەوەی ٥٠ مەترێک ڕێ دەکەیت ئەمجارەیان زێیەکی درێژ دێتە پێشت، هەتا بە کەناری زێیەکە ڕێبکەیت تەنگی زێیەکە گەورە دەبێتەوە و ڕەنگی ئاوەکەشی دەگۆڕێت، دوایش ڕێی بەرەو چەمیشگەزەک دەست پێدەکات، لەناو ناخی دەربەندی عەلیدا دەیان سەرچاوەی ئاوی تری لێدەبێتەوە هەروەها چیا و ڕێگەوبان و ئەشکەوتێکی بێشوماریش هەن، ئەو شوێنەی کە قوڵایی زێیەکەیە بەستەڵەک ناگرێت، کاتێک بەفر لە چیای ماران دەگاتە سێ مەترێک ئەو شوێنەی قوڵایی زێیەکەی لێوە نزیکە تەنانەت قولانجێک بەفریش ناگرێت لەهەمانکاتدا لێرە بەفر زوو دەتوێتەوە بەواتایەک وەرزی بەهار زوو دێت، با مانگی ئادار بەسەربەرین ئەم بەفر و زێ و چەمانە گەشکە دەیانگرێت، قسەیەک هەیە دەڵێت لەیەککاتدا چەند وەرزێک دێنە ئاراوە، ئێرەش ئاوایە، گەڵای دارەکان سەرەتا لە دەربەندی عەلی چرۆ دەکەن، لەپێش هەموویانەوە داری بادەم ئەم مژدەیان دەداتێ، دوای ئەوەی خونچەکان دەکرێنەوە و گوڵ دەگرن بەدوای یەکدا دارەکانی تریش ڕەنگی خۆیان دەگۆڕن".

ساریا وتی:

"ئەرێ کەی هەڤاڵانی کەمپەکە بڵاوە دەکەن؟" شاهینیش وتی:

"ئەوکاتەی کە دارەکان گەڵایان گرت، هەتائەوکاتە پێویستە پەروەردەیەکی باش ببینن!"

"هەڤاڵ بێستا باسی چیرۆکێکی بزنی کرد، لەوە دەچێت بزن لەم ناوە زۆر

بێت!" شاهینیش وتی:

"مەسەلەی بزن لە هەڤاڵ بەرچەم بپرسە، ساڵی ڕابوردو لەگەڵ بزنێک بە دوورو درێژی قسەی کردبوو".

ساریا و ئاریا تەماشایەکی بەرچەمیان کرد، بەرچەمیش وتی:

"ڕاستە چیاکانی ئێرە پڕ دەبێت لە بزن و بەرانە کێوی و ئاسک، پێویستە بەراز و ئەو ورچانەی کە سەری عەمبارەکانمان هەڵدەدەنەوە لەیاد نەکەین هەروەها سمۆرە و کەروێشکیش زۆرن".

شاهین وتی "گورگ و ڕێویش زۆرن، ئەی ئەفسانەکانی مارەکانی چیای مارانتان بیستووە؟ "ساریا وتی:

"بەڵێ دەزانم، لە گوندەکەی ئێمە شوانێک هەبوو کە عاشقی بزنەکان بوو، شەو و ڕۆژ باسی بزنەکانی دەکرد، هەرکاتێک بێزار و بێتاقەت بوینایە دەچوینە لای، پێماندەوت مام موسلم چیرۆکێکمان بۆباس بکە، ئەویش چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە، بەگوێرەی قسەکانی ئەو بوکێک لەگەڵ منداڵێکدا ڕوبەڕووی مارێک دەبنەوە، مارێکی ترسناک بووە، مام موسلم دەیووت ئەژدیها، ژنەکە ترسابوو، لەخوا پاڕابۆوە و لەناکامدا حەزرەتی خزریش هاتووە بە هانایانەوە، حەزرەتی خزر فەرمانی کردووە کەبە قودرەتی خوا مارەکە ببێت بە بەرد، خوایش بەردی گرتۆتە هەرسێکیان و بونە بە بەردو تاکو ئێستاش هەرسێکیان لە شێوەی بت لەوێ ماونەتەوە، ئەگەر مار بەیەکێکەوە بدات پارچەیەک لەو بتانە دەکەنەوە و ورد وردی دەکەن و لەناو تاوە سووری دەکەنەوە و ئەیخەنە سەر برینەکەی، بەگوێرەی قسەکانی مام موسلم بەم شێوەیە برینەکان چاک دەبنەوە".

شاهینیش وتی:

"ئەو موسلمەی باسی دەکەیت کەمێک کەچەڵە و قاچێکی شەلەو لەدوای هەر قسەیەکی سمێڵی بادەدات وانییە؟ پێشموابێت ڕاوچیشە؟"

ساریا وتی:

"بەڵێ ئەوە دەیناسیت؟"

"کێ نایناسێت ئەو بۆخۆی ئەفسانەیە".

بەرچەم سەرمای بوو، بێ ئۆقرەبوو، دەیویست بەزووترین کات قسەکانی شاهین تەواو بێت و بگەڕێنەوە بۆ کەمپەکە، بەڵام شاهین ئەمجارەیان باسی لە دار و بولبول و کەناریا و باسی لە باڵندەکان و مەلە ڕەنگاو ڕەنگەکانی کرد، بەرچەم ناچاربوو کە چاوەڕێی تەواو بوونی قسەکانیان بکات، ئەوان بێئاگابوون لە بەسەرچوونی کاتدا، بەردەوام بوون لە گێڕانەوەی داستانەکان و سەرگوزشتەکان و گاڵتەکردن و پێکەنین، بەڵام سەرما ئیتر تینی بۆئەوانیش هێنا، سوور بونەوەی سەر لووت و گۆناکانی ساریا و ناریا بەس بوون بۆ حاڵی بوون لەوەی کە ئیتر سەرما تینی بۆهێناون، بەرچەم لە شوێنکەی خۆیەوە ماخولانی بوو، خوارەحمی کرد شاهین تەماشای سەعاتەکەی کرد و تێگەیشت کەکاتی کۆبونەوە هاتووە، هەربۆیە پێیووتن "دەی بابڕۆین بۆ کەمپەکە"، ئەو ڕێگەیان گرتەبەر کەلە نێوان دارە توو و چنارەکاندا بوو، بەدرێژایی ڕێگەکە هیچ قسەیان نەکرد، کاتێک گەیشتنە بەردەم ئەشکەوتی جنۆکەکان بەرچەم چاوی بەچواردەوری کەمپەکە گێڕا، دەبوایە قسەی لەگەڵ بێستا بکردایە، خۆی کرد بەناو ئەشکەوتی جنۆکەکان، هەموو سەکۆکانی ناو ئەشکەوتەکە چۆڵ بوون، دوای کۆبونەوەکە بێدەنگی باڵی بەسەر ئێرەدا کێشا بوو، دوای کۆتایی پەروەردەکە هەموو گەریلاکان لەدەرەوە خۆیان بەشتی ترەوە سەرقاڵ دەکرد، کاتێک بەرچەم لە ئەشکەوتەکە چاوی بەکەس نەکەوت چوو لە شوێنێک لەناو ئەشکەوتەکە دانیشت، لەبارەی ئەم ئەشکەوتەوە دەوترێت گوایە سەردەمانێک لێرە جنۆکە ژیاوون و هەموو ڕۆژێک مەڕ و ماڵاتی خەڵکی گوندەکانیان دزیوە و خواردوویانە، هەرچەندە شوان و پیاوە ماقوڵانیان هەموو شتێکیشیان لەهەمبەر ئەمە کردبێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبونە و بێچارە ماونەتەوە و ئێستاش بەرچەم لەم ئەشکەوتە ترسناکە بیری لەوە دەکردەوە کە ئێستا ڕووبەڕووی بێستا بێتەوە چی پێبڵێت.

ناڕەحەتییەکی تر سەرودڵی بەرچەمی گرت، لەدڵی خۆیدا وتی "خوای گەورە ئەو جنۆکانە بنێرە بامنیش بەرن"، دوایش بەم قسەی خۆی پێکەنی، لەم ئەشکەوتە بەلای کەمەوە بەردەوام ٢٠٠ گەریلایەک پەروەردەی تیا دەبینی، بەڵام ئێستا بەختەوەر بوو بەرچەم چونکە ئەشکەوتەکە کەسی تیانەبوو،

ئەگەر گەریلایەکی تیابوایە و بەم شێوەیە بەرچەمی ببینیایە وایدەزانی کە ئەم کچە شێت بووە.

دوای ئەوەی بەرچەم تەماشای ژووری دووەمی ئەشکەوتەکەشی کرد پاشان چووە دەرەوە، لەناو ئەشکەوتەکەدا ئەشکەوتێکی تری بچووک هەبوو کە شوێنێکی نهێنی بوو چاوی بەوێشدا گێڕا بێستا لەوێش نەبوو، هاتەدەرەوە و لەبەردەم ئەشکەوتەکە ڕاوەستا، ئەمجارەیان بەرچەم تەماشای شوێنی چێشتخانەکەیانی کرد کەلە نێوان توولە ڕێکە و زێیەکەدا بوو، پاشان بەسەر ئەو پردە تێپەڕی کەلە داری شۆڕەبی دروست کرابوو هەر ئەم پردەش ڕێگەکەی دەبردە سەر زێیەکە، کە تەماشای ناو چێشتخانەی کرد بێستای لەوێش نەدی، بەقەد پاڵی چیاکەوە کونێک هەبوو کە چەند مەترێک گەورەبوو ناویان نابوو چێشتخانە، گەریلاکانی ئەوێ سەرقاڵی خواردن درووست کردن بوون، کاتێک دوو کەڵەسەری هەڵواسراوی سەر قەنارەکەی بینی ئیتر تێگەیشت کە ئێوارە چی خواردنێک دەخۆن، ئەو ڕۆژە هەڤاڵە قۆزەکەیان هەڤاڵ دڵگەش ئێشکگری چێشتخانە بوو، بینی کە دڵگەش زۆر لەو هەڤاڵانەی دەکات کە خواردن بخۆن کە بەینی لەگەڵیان خۆش بوو، دڵگەش زیاتر زۆری لە عەلی موسا دەکرد تاکو شتێک بخوات، چی کاتێک بەرچەم بچوایە بۆئەو شوێنەی کە عەلی موسا لێی بەرپرس بوو بەسەر ئاگرەکەوە مەنجەڵی دەبینی کە گۆشتی بەرازی تێدا دەکوڵێنرا، ئیتر دەستبەرداری ئەوەبوو کە بەدوای دادەی بگەڕێت، بە دەموچاوێکی گرژەوە بەرەو ئەو شوێنە چوو کە کۆبونەوەی تێدا ئەنجام دەدرا، جارێکی تر ڕوبەڕووی شاهین بۆوە.

شاهین لە بەرچەمی پرسی:

"ئەرێ نازانیت بێستا لەکوێیە؟"

"نەخێر نازانم منیش بەدوایدا دەگەڕێم".

"ئەگەر بینیت پێی بڵێ ئەو کتێبەی باسی سەرگوزەشتەی زستانی ساڵی ١٩٩٦ دەکات بیدات بە ساریا و ئاریا".

گەریلاکان یەک لەدوای یەک بەرەو شوێنی کۆبونەوەکەیان ڕێیان گرتەبەر، لەشێوەی پێنج ڕیزی لەدوای یەکدا ڕاوەستان، هەڤاڵانی کچیان دواهەمین

گەریلابوون کە گەیشتبوونە شوێنی کۆبونەوەکە، کەمپەکە کپ و خامۆش بوو، هەموویان چاوەڕێی هاتنی فەرماندەکەیان بوون، باگەر فەرماندەی گشتیان بوو چەکەکەی بەدەستێوەی بوو لەناکاو خۆی گەیاندە لایان، باگەر لەبەردەم ئەم هێزە کە ژمارەیان ١٧٠ گەریلایەک بوو ڕاوەستا و بەدەنگێکی گڕ وتی ڕاوەستن. ئامادەبن.

دوای ئەوەی دروشم وترایەوە و سەرژمێری کرا کۆتایی بە گردبونەوەکەیان هات، هەروەکو پیشەی هەموو ڕۆژێکیان دوای ئەم گردبونەوەیەیان گەریلاکان کەوتنە شایی کردن، بێستاش لەنێوان هەڤاڵەکانیدا بوو دیلانی دەکرد، کاتێک چاوی کەوت بە بەرچەم کە بەرامبەر ئەشکەوتەکە دانیشتبوو هاواری لێکرد و بانگی کرد، سەرەتا بەرچەم گوێی لەم بانگکردنەی بێستا نەبوو، بێستا زیاتر دەنگی لێهەڵبڕی، بەرچەم گوێی لە بێستا بوو، بەشێنەیی خۆی گەیاندە لای دادەی، پەنجە توتەی دادەی گرت، لەلایەکەوە بەرچەم دەیویست لەگەڵ دیلانەکەدا خۆی بگونجێنێت و لەلایەکی تریشەوە بەقنەچاو تەماشای دادەی دەکرد، دوای ئەوەی چەند گەریلایەک کەوتە نێوانیانەوە ڕوبەڕووی یەک بوونەوە، بێستا خەندەیەکی شیرینی بۆکرد، بەرچەمیش شەرمی کرد و خۆی لەگێلیدا، هەردووکیان مەستی دیلانەکە بوون، هەڵپەڕکێکەیان بەجۆش بوو، ئێستا هەردووکیان دەم بە خەندە و دەم بە پێکەنین بوون.

# ٢

ئەندامانی دەستەی فەرماندارێتیان لەژێر گڵۆپە ماندوو خەواڵۆکەدا کەلە ژووری بەڕێوبەرایەتیان داگیرسابوو کۆببونەوە، هەوڵیان دەدا چوارچێوەی ئەو نوسینە داڕێژن کە بەناوی فەرماندارێتیانەوە بڵاویان دەکردەوە، لەم کۆبونەوەیەدا فەرماندەیەکی زۆری تیپ و کەرت و مەفرەزەکان بەشداربوون کەلەناویاندا شاهین و ئایهان و فورات و ڕەزاشی تیابوو، زۆپا سوورهەڵگەڕاوەکەی ناوەڕاستیان ئەوەندە گڕوتینی گەرم بوو وەک ئەوە وابوو کەلە بیریان چوبێت لەدەرەوە وەرزی زستان بەهەموو سەختیەکی خۆیەوە بەردەوامە، جگە لە بۆنی جگەرەی تووتن شتێکی ئەوتۆ لەئارادا نەبوو کە ناڕەحەتیان بکات، یەکێک لە گرنگترین مژاری کۆبونەوەکەیان ئەو ئۆپەراسیۆنانەی سوپای تورک بوو کەلە بەهاردا دەستیان پێدەکرد، مانگێکی تر ئۆپەراسیۆنە سەربازێکانی دەوڵەتی تورک دەستیان پێدەکرا، بەدەربەندی عەلیشەوە هەموو هەرێمی دەرسیم دەکەوتە ناو شەڕ و پێکدادانێکی سەختەوە، دەبوایە هەتا مانگی مایس هەموو هێزەکانی خۆیان بپارێزن و ئەگەر بۆیان بگونجایە و پێیان بکرایە هێزەکانیان لە شەڕ و پێکدادان بەدوور دەگرت، هەربۆیە ئێستا پێویستیان بەوە بوو کە داڕشتنەوەی نوێ بکەن و سەنگەری نوێ بۆ گەریلا درووست بکەن.

باگەریان وتی:

"ئەمجارەشیان هێزی دوژمن دێت، چالاکیە گیانبازێکەی هەڤاڵ زیلان هەموو هێزەکانی دەوڵەتی تووشی شۆک کرد، هەربۆیە دەیانەوێت ئەم بەهارە تۆڵە بکەنەوە".

لە بارەی ئەم گریمانەیەوە فەرماندەکانی چواردەوری باگەر لە باگەر جیاوازتر بیریان نەدەکردەوە، پێشنیارەکانی هەموویان لەبارەی ڕەوشەکەوە کەم تا زۆر وەکو یەک بوون، پێیان باش بوو کە لەهەرێمەکەدا بڵاوە بە هێزەکەیان بکەن و سەنگەری پتەو ئامادە بکەن و بۆنەوەی ئۆپەراسیۆنی هێزی دوژمن بێ ئەنجام بێت حەشارگەی باشیش درووست بکرێت، لەئاکامی کۆبونەوەکەیاندا بڕیاردرا کە دوو تیپ ڕەوانەی هەرێمێکی تر بکەن، باشترین شت بۆئەوەی هێزەکانی ئۆپەراسیۆنی دوژمن تەنها خۆیان بە دەربەندی

عەلییەوە سەرقاڵ نەکەن تەنها ئەو بڕیارانەیان بوو.

ئەو بارانەی دوای نیوەی شەو دایکردبوو چەم و زێیەکانی شێتو هارکردبوو، ئاسمان ڕەنگی خۆڵەمێشی گرتبوو، سەرەڕای ئەو ناڕەحەتیانەشی کەلە ئاکامی باران دەهاتنە ئاراوە بارینی باران بەختەوەری بوو، ئەم باران بارینە نیشانەی ئەوەبوو کە کۆتایی بە شەوانی درێژ و نووتەک دێت.

بەیانی زوو گەریلاکان بەسەر توولە ڕێیە قوڕاوێکاندا ڕایان دەکرد و هەوڵیان دەدا کە بەزووترین کات خۆیان بگەهێننە شوێنی گردبونەوەی گشتیان، دوای ئەوەی ڕۆژباش لە چاودێری شوێنی گۆڕەپانەکەیان کرد ئیتر چوونە ڕیزەکانی خۆیانەوە، بەم شێوەیە بێدەنگی باڵی بەسەریاندا کێشا، کاتێک باگەر بینی هەموو گەریلاکان ئامادەن چوو بۆ گۆڕەپانی گردبونەوەکە، باران دەباری، دڵۆپە ئاوەکانی سەر قژی دەتکانە سەر ڕیشە لوولەکەی و بەبێ ئەوەی گوێ بەم تەڕ بوونە بدات دەستی کرد بە قسە کردن، وتی:

"ئیتر کاتی حەوانەوە تەواوبوو هەمووتان خۆتان بۆ شەڕ ئامادەکەن!"

دوای ئەم دێڕە کورتەی کە وتی تەماشایەکی گەریلاکانی کرد، دوایش باسی لە مەترسێکانی وەرزی بەهار کرد و پێیانیوت بۆنەوەی جارێکی تر ئەو زیان و زەرەرانەی لە ساڵی ١٩٩٦ هاتبوونە ئاراوە دووبارە نەبنەوە و ڕێگری لێبکرێت و لەم پێناوەشدا بۆچی ساڵی ١٩٩٧ بە ساڵی کۆتایی ڕاگەیاندووە و پاشان بەدوور و درێژی باسی ئەوەی کرد هەتا مانگی مایس بۆئەوەی زەرەر بە هێزی گەریلا نەکەوێت بەنیازن ڕێگەچارەیەکی چۆن بگرنەبەر، لەدوای قسەکانی بڕیارەکانی خۆیانیان ڕاگەیاند، بەگوێرەی بڕیارەکەیان دوو تیپ بە فەرماندارێتی فورات و ئەیهان لە کەمپەکە جیا دەبنەوە و ئەوانەشی دەمێننەوە لە چواردەوری دەربەندی عەلی جێگیر دەبن.

دوای کۆتایی کۆبونەوە گشتێکە ئەو گەریلایانەی لەگەڵ ئەیهان و فورات ناویان نوسرابوو ڕیزێکی تایبەتیان بەست، ماڵئاوایی کردن هەمیشە شایەنی خەمبوو، غەمگینێکەی ئەوەبوو کە لەوانەیە جارێکی تر چاویان بەیەک نەکەوێتەوە یان لەوانەبوو زۆربەیان شەهید بن کە ئەمەش زۆر دڵتەزێن بوو، کە تەوقەی ماڵئاواییان لەگەڵ یەکتر دەکرد زۆر لە ڕووخسار و قەدوباڵای

یەکتریان دەڕوانی و هەتا لەدەستیشیان بهاتایە نەیاندەهێشت کەس هەست بەم بارگرانی دەروونیانەیان بکات.

دوای دوو کاتژمێر لە بڵاوەکردنیان باران ڕاوەستا، لەهەر گرووپێک یەك یان دوو گەریلایەک بۆ خواردن وەرگرتن لە چێشتخانەکە ڕیزیان بەستبوو، گرووپێکی تری گەریلا لەبەردەم ئەشکەوتی جنۆکەکان لەناوخۆیان قسەیان دەکرد، دەتوانرا لە دوورەوە گوێ لە قسەکانیان بگیردرێت، لەناویاندا زیاتر دەنگی پالۆ یان دەهات کە بەدەنگە گڕەکەی قسەی دەکرد و کەسیش بەتەواوەتی لێی حاڵی نەدەبوو، زاتەن هەرکاتێک ئەو قسەی بکردایە ئەوانی تر ناچاردەمان کە تەنها گوێ لەوبگرن، ئەگەر کەسێک نەیناسیایە و لەدوورەوە گوێی لە قسەکانی بگرتایە و لە جوڵانەوەکانیشی بڕوانایە لەکاتی قسەکردنیدا ئەوکەسە بە ۳۰ جزمەی قورعان سوێندی دەخوارد کە ئەم پالۆیە هەموو دەرد و سەر ئێشەی دونیای چێژتووە، کاتێک قسەی دەکرد تووڕە دەبوو جارناجارێک چاوی لەژێر پێی دەخشاند و زۆرجاریش بەدەم قسەکردنەوە جوێنی دەدا، ئەوەندە بە خێرایی قسەی دەکرد ئەگەر کەسێک پێشوتر گوێی بۆ قسەکانی نەگرتبێت یەک وشەی لێ حاڵی نەدەبوو.

باگەر لە دوورەوە لەوانی دەڕوانی، بەتایبەتی دەیویست گوێ لە پالۆ بگرێت بەتایبەتی لە تێزەکانی پالۆ کە لەناو لۆژیکەکانی دونیادا هیچ بونێکیان نەبوو، هەموویان دەیانزانی کە زۆرجار پالۆ تێزی فێڵبازانەی دەووت، ئەوەی مایەی مەراق بوو لەڕاستیدا ئەمە نەبوو، باگەر زیاتر مەراقی ئەوە بوو کە ئایا پالۆ بەچی شێوازێک تێزە فیلۆزێکەی خۆی دەڕازێنێتەوە، کاتێک یەکەم تێزی پالۆ لەنێو قسەکانی گەیشتە گوێی باگەر نەیدەزانی کە ئایا بەم قسانە پێبکەنێت یان تووڕە بێت، باگەر گوێی لێبوو پالۆ بە هەڤاڵەکانی وت "هەموو شۆڕشگێڕێک دەبێت بەشێوەیەکی یەکسان وەک یەک خوێن و فرمێسکی چاوەکانی بڕێژێت"، باگەر بەخۆی وت "ئەرەوەڵا پالۆ یەکەم شەکری خۆی شکاند". لەوە دەچوو پالۆ هێشتا دڵی ناوی نەخواردبێتەوە بۆیە دووەمین تێزی خۆی هێنایە زمان، بە هەڤاڵەکانی وت "پێش ئەوەی بچنە ناو شەڕەوە دەبێت حیسابی پاشەکشێ بکەیت ئەگەر ئەمە نەکەیت مانای وایە پێش ئەوەی شەڕ بکەیت شەڕەکەت

دۆڕاندووه". باگەر ئەمجارەشیان لەدڵی خۆیدا وتی "ئەها پالۆ شەکرێکی تری شکاند". پالۆ بەتەواوەتی ئاگای لەخۆی نەمابوو، کەس ورتەی لەدەمەوە نەدەهات. باگەر بانگی کرد، بەڵام گوێی لێنەبوو. باگەر دووەمجار بە دەنگێکی بەرزتر و گڕتر هاواری لێکرد ئەمجارەیان پالۆ هێوربۆوە هەربۆیە کە ئاوڕێکی دایەوە گوێی لە دەنگی باگەر بوو کە بانگی دەکرد.

ئێستا پالۆ بیری لەو قسانەی دەکردەوە کە کەمێک لەمەوبەر کردوبویانی، دەیزانی بۆهەر تێزێکی ناڕاست ڕەخنە دەکرێت، بیری دەکردەوە دەبێت چی وتبێت؟! ئەی ئایا باگەر گوێی لە هەموو قسەکانی بوو؟ هەرچەنێکی کرد خۆیشی نەهاتەوە بیری کە کەمێک لەمەوبەر چی وتووە! بەنیگەرانییکەوە بەرەو باگەر کەوتەڕێ.

ئەگەر جارناجارێک قسەوباسی وەک فیۆلۆزی نەکردایە باش بوو چونکە خۆی لەبارەی سەربازییەوە زۆر کەمڵ بوو، وەستایەتی و ئازایەتییەکەی لەکاتی شەڕدا مایەی دەستخۆشی هەموو هەڤاڵەکانی بوو. لەدوای هەر چالاکییەک و شەڕ و پێکدادانێکدا تەنها ڕووبەڕوی یەک ڕەخنە دەبۆوە ئەویش بێ شیرازەیی و چاونەترسییە زیادە ڕۆیەکەی بوو. هەرچییەکی دەکرد لەیەخەی ئەم ڕەخنانە ڕزگاری نەدەبوو. لەهەمانکاتدا کەسێکی سەرنجراکێشەر بوو. ئەگەر بە گشتیش نەبوایە لەناو هەڤاڵەکانیدا خۆشەویست بوو. بەدرێژایی تەمەنی گەریلایەتی شەهادەتی هەڤاڵانێکی زۆری خۆی بینیبوو هەربۆیە دڵی وەک بەردی لێهاتبوو. ئەفرەتێکی زۆری بەرامبەر بە دوژمن و ئازار و تۆڵەسەندنەوەی هەڤاڵانی بەدرێژایی تەمەنی گەریلایەتی لەناخیدا کۆکردبۆوە. هەموو ئەمانەش وایلێکردبوو هەست و نەستی وا ڕەق ببێت کەبە هیچ شتێک نەرم نەبێتەوە. مردنی بەشتێکی سادە دەزانی، بەڵام ئەمەش هۆکاری خۆی هەبوو. یەکێک لەو هۆکارانە ئەوەبوو کە هەڤاڵێکی زۆری خۆشەویستی شەهید ببوون. پالۆ هەمیشە بە هەڤاڵەکانی دەووت "من بەگوێرەی پێویست بەڵکو کەمێک زیادیش ژیانم بردەسەر ئێستا لەزیادە ماوەمەتەوە! "بەهۆی جدی نەگرتنی ژیان و چاونەترسی زیادەڕۆیەکەیەوە هەمیشە بەڵای ڕوبەڕوو دەبۆوە. هەربۆیە هەتا ئێستا پالۆ سێجار لەکار و فەرماندارێتی لادراوە و تەنانەت لێپرسینەوەی

جدیشی لەگەڵ کرابوو، بەڵام ئێستا تەنها فەرماندەی کەرت بوو. ئێستا پالۆ لەگەڵ ئەو هەڤاڵانەی کە وەک خۆی بوون و مردنیان بە جدی نەدەگرت چاوەڕێی هاتنی وەرزی بەهار بوون. بەگوێرەی ئەو دەبوایە گەریلا سێ شت زۆر بە جدی بگرێت، ڕێکردنێکی باش، دووەم بەکارهێنانی چەک زۆر بەباشی، سێیەمیشیان چاونەترسی، ئەو گەریلایانەی لەناو کەرتەکەی پالۆ جێیان بگرتایە دەبوایە ئەم سێ تایبەتمەندیانەیان هەبوایە بەپێچەوانەوە لەگەڵ پالۆ توشی کێشە دەهاتن.

پالۆ خۆیگەیاندە لای باگەر، هێشتا بیری لەوە دەکردەوە کە کەمێک لەمەوبەر چی وتووە، بەخۆی دەووت تۆ بڵێی تێزەکانم بەلارێدا لایانمدابێت؟ باگەر لێی پرسی "شاهین لەکوێیە؟ "پالۆ زۆر بەخێرایی تەماشای چواردەوری خۆی کردوو پاشان وتی "نازانم"، باگەر پێیووت "عەلی موساش لەگەڵ خۆت بەرەو لەگەڵ هەڤاڵ فەرحان قسەبکەن ئەویش تازە گەریلایە، هەوڵدە کەمێک زیاتر بیناسە، دیارە کەمێک ڕەفتاری گوماناوی هەیە! "پالۆ لەدڵی خۆیدا وتی ڕەفتاری گوماناوی؟ بەخەندەیەکەوە تەماشای باگەری کرد، باگەر زۆر شارەزای ئەم جۆرە سیمایەی پالۆ بوو، هەربۆیە پێیووت "نامەوێت بچوکترین بێڕێزی بکرێت، لەکەسێکی زۆرباش دەچێت، هەندێک لەهەڤاڵان دەڵێن کە ڕەفتاری گوماناوی هەیە، بەڵام من قەناعەتم بەمە نییە، بۆئەوەی تەدبیری زیاتر وەربگیردرێت پێویستە قسەی لەگەڵ بکرێت و باشتر بیناسین، هەرگیز بیر لەوە نەکەیتەوە کەلەهەمبەری بێڕێزی بکەیت، دوای نەڵێیت پێیان نەووتم!"پالۆ خۆی جدیتر کرد، هەستی دەکرد کە بەشتێک تۆمەتبار کرابێت لە دڵی خۆیدا وتی دەڵێی دڵم دەخوێنێتەوە، دوای ئەم قسانەیان پالۆ لەگەڵ عەلی موسا چوون بۆ ناو ئەشکەوتی جنۆکەکان، ئەشکەوتەکە زۆر تاریک بوو هەتا کارەبایەکەیان چاک نەکردایەتەوەو گڵۆپەکەیان دانەگیرساندایە نەیاندەتوانی هیچ ببینن، پالۆ چووە سەرووی ئەشکەوتەکەوە کە ژوورێکی بچوکی لێبوو کە بۆ کۆگا بەکاریان دەهێنا ماتۆڕی کارەباکەی داگیرساند، فەرحان بێ ئاگابوو لەهەموو شتێک تەماشای پالۆی دەکرد، پالۆ نەیهێشت زیاتر فەرحان مەراق بکات دەستی کرد بە قسەکردن، بەڵام یەکەم قسەی وەک خەنجەر جەرگ

بڕبوو ڕاستەوخۆ پالۆ لە فەرحانی پرسی "تۆ سیخوڕی؟! "فەرحان بەم پرسیارە سەرسام بوو، نەیدەزانی کە چۆن وەڵام بداتەوە، بەدەنگێکی گڕ و باوەڕییەکی زۆر بەخۆی پێیووت "نەخێر ". بەڵام پالۆ بەم قسەیەی قەناعەتی نەکرد، وەک لێکۆڵینەوەیەکی کلاسیکی پۆلیسیانە پالۆ دەستی خستە ناو گیرفانی و یەک، دووجار بە چواردەوری فەرحان سوڕایەوە، پاشان پالۆ وتی "تۆ وادەزانی من کەسێکی زۆر خۆشباوەڕم وانییە؟! "فەرحان هێشتا سەرسام بوو، بەڵام لە ڕووخساریدا گاڵتەجارییەک بەدیدەکرا، وەڵامی پالۆی نەدایەوە، پالۆ پێیووتەوە "دەبێت ڕاستیم پێ بڵێیت! "ئەویش وتی "دەتەوێت چیت پێبڵێم؟ "پالۆش وتی "چۆن کرای بە سیخوڕ و بەچی ئامانجێک هاتووی بۆ ئێرە؟! "فەرحان تەماشای عەلی موسا و پالۆی کرد، سەرەتا پێیوابوو ئەمە شۆخییە، بەڵام کەلە پالۆی ڕوانییەوە بینی کە زۆر جدییە و توڕە دیارە، هەستی بە جدییەتی مەسەلەکە کرد، فەرحان پێیووت "تۆ بەچی ئامانجێک هاتووی بۆ ئێرە منیش بۆ هەمان ئامانج هاتووم ". پالۆ بەم وەڵامە زیاتر توڕەبوو، پالۆ بەوە توڕە ببوو کە دیارە بە چاوێکی جدییەوە تەماشای ناکات، هاواری بەسەردا کرد "لەوەزیاتر شێتم مەکە لەبارەی تۆوە هەموو شتێک دەزانین ". "مادام هەموو شتێک دەزانیت چیت لەدەست دێت بیکە "، پالۆ نەیدەتوانی توڕەبوونی خۆی هێور بکاتەوە، دەستەکانی دەلەرزین، لەناکاو زللەیەکی لە فەرحان دا، عەلی موسا شڵەژا، تەماشایەکی بەردەم ئەشکەوتەکەی کرد، کەسی نەبینی، فەرحان بەم زللەیە گەشکە گرتبووی، تەماشایەکی پالۆی کرد، ڕەوشەکە بەتەواوەتی ئاڵۆز ببوو، ئیتر پالۆ لەوەزیاتر نەیدەتوانی هیچ بکات و نەشیدەتوانی پەشیمانی بنوێنێت، هەستی بە پەشیمانی کردبوو، تەماشای فەرحانی کرد، فەرحان بەشێوەیەکی بێدەنگانە دەگری، گوێیان لە پێ دەنگی کەسێک بوو کە دەهات بۆلایان، پالۆ کەمی مابوو کەواز لە فەرحان بهێنێت و هەڵبێت، بەڵام هیچی پێنەکرا و کەوتە چاوەڕوانییەوە، ئەوەی لێی دەترسا هاتەدی، ئەو دەنگە دەنگی پێی باگەر بوو هاتە ناو ئەشکەوتەکەوە، هەرکە گەیشتە لایان هەستی بەگریانەکەی فەرحان کرد، لەناکاو ناو ئەشکەوتەکە وەک ڕۆژی حەشری لێهات، باگەر ئەوەندە بە دەنگێکی بەرز هاواریکرد بەسەر

پالۆدا دەنگی گەیشتە دەرەوەی ئەشکەوتەکە. پالۆ دەیزانی کە تاوەنبارە بۆیە سەری هیچ بەرز نەکردەوە. باگەر بەو تورەبونەوەیەوە فەرحانی لەگەڵ خۆی بردە دەرەوەی ئەشکەوتەکە.

ماوەیەک پالۆ لە ئەشکەوتەکەدا بە تەنیا مایەوە و بیری لەوە دەکردەوە کە ئایا بۆچی هەمیشە تووشی سەرئێشە دەبێت؟! ئەوکاتانەی کە بیری لە ڕەفتارەکانی خۆی دەکردەوە دەیزانی هەڵەیە، بەڵام هیچیشی لەم بارەیەوە نەدەکرد تەنها چارەی دەدا بەیەکدا، لەهەمانکاتدا بیری لەوە دەکردەوە کە ئایا ڕێگە چارەیەکی تر نییە لە دەرەوەی جدیەتی کە چواردەورەکەی گوێی بۆ بگرێت و کارێکی باشی پێئەنجام بدات؟! پالۆ لە ئەشکەوتەکە چووە دەرەوە و چاوێکی بەوناوەدا گێڕا، تەماشای ئەو گرووپە گەریلایەی کرد کەلەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد. شاهین بەلایدا تێپەڕی، کەلێی تێپەڕی ئاوڕێکی بۆدایەوە و پێکەنی، بیری لەوە دەکردەوە کە ئایا بۆچی شاهین پێکەنی، مەحاڵ بوو باگەر هەموو شتێکی بۆ شاهین باسکردبێت، بەشێوەیەکی بێ ئارەزویانە دوای شاهین کەوت و چووە نزیک گرووپەکەوە.

شاهین لە گرووپەکە نزیک ببۆوە بەپێکەنینێکەوە پێیانیوت "باسی چی دەکەن؟ "گەریلایەکیان وتی "هیچ، چاوەڕێی هاتنی بەهار دەکەین، بائەم بەفرانە بتوێنەوە ئەوکاتە هەناسەیەکی ڕەحەت هەڵدەمژین ". شاهینیش وتی "ئەی بۆچی ناڵێن کەی لەدەستی ئەم خولی پەروەردانە ڕزگارمان دەبێت؟ "پالۆ هەڵیدایەوو وتی "بەڵێ مەبەستیان قسەی حەقە بۆیە ڕەقە ". شاهین وتی "بەگوێرەی ئەو ڕێنماییانەی تازە هاتوون دوای قۆناغی کەمپەکەش لە پەروەردە بەردەوام دەبین، لە ئێستاوە دڵی خۆتان خۆش مەکەن ". پالۆ بەم قسانەی شاهین پێکەنی و دوایش وتی "ئێمە لەم جۆرە ڕێنماییانەمان زۆر بینیوە، توخوا لەکاتی شەڕدا چۆن شتی وادەبێت. شەڕ و پەروەردە کوجا مەرحەبا. ئەمە مەحاڵە ". شاهینیش وتی "کێشە نییە کێ ئامادەیە بەشداری کاروانی حەجاج بکات؟ "هەموو گەریلاکان دەستیان هەڵبڕی، بەڵام سێ گەریلای دواوە بەشێوەیەک ڕەفتاریان کرد کە گوێیان لە قسەکانی شاهین نەبووە، شاهین دەستی بۆ ئەو سێ گەریلایە درێژکرد کە دەستیان بڵند نەکردبۆوە و

پێیانیوت "ئێوه خۆتان ئاماده کەن"، کاتێک شاهین ویستی لەلای گرووپەکە جیابێتەوە ساریا دەنگی لێکرد و پێیووت "کوا ئێوە ڕۆمانێکتان پێدەداین؟" شاهین لەناو گرووپەکە وەک ئەوەی بە شوێن یەکێکدا بگەڕێت وابوو چاوی دەگێڕا، شاهین پرسی "هەڤاڵ بێستاتان بینیوە؟" ساریا وتی "بەڵێ بینیمان، سەنگەرەکەی نیشان داین"، ساریا بەپەنجە ئیشاراتی کرد بۆ بەرزایەکەی پشت چێشتخانەکە، بەڵام لەم شوێنەوەیان ئەوێ بەدینەدەکرا، شاهین وتی "سەنگەرەکەتان شوێنێکی خۆشە، ئەوێ ئەو چاڵەیە کەلەناکامی تەقینەوەی تۆپ هاتۆتە ئاراوە، ئەوکاتەی کەناچار دەبین بەرگری لە کەمپەکە بکەین ئێوە دەچنە ناو ئەو سەنگەرەوە"، ساریاش پێیووت "بەڵێ دەزانین"، بێگومان پشت بەستن بەو زانیاریانەی لە هەڤاڵ بێستاوە وەریگرتبوو بەشانازیەوە ئەم وەڵامەی دایەوە، شاهین وتی "کەواتە بێستا بدۆزنەوە و داوای ڕۆمانەکەی لێبکەن"، دوای ئەوەی شاهین ئەو سێ گەریلایەی کە دەستیان هەڵنەبڕی بوو ڕەوانەی کاروانی حاجێکانی کرد لە ڕێگە ڕووبەڕووی وەحشەت بۆوە واتا ئازاد.

ئازاد کە بە وەحشەت ناوبانگی دەرکردبوو، بەقەد باڵەکەوە لەدامێنی چەند بەردێک دانیشتبوو، ئەو دڵۆپە بارانەی کەلە نێوان بەردەکانەوە دزەیان دەکرد و دەکەوتنە خوارەوە تەڕیان کردبوو، لەبەردەمیان هەڵدەلەرزی و تەقەی دانەکانی دەهات و چاوەکانیشی لەیەک نابوون، بەڵام لەوە دەچوو ئازاد بەم ڕەوشە کەیف خۆش بووبێت چونکە بەبێ ئەوەی گوێ بدات بەتەڕی سەری لەژێر ئەو دڵۆپە ئاوانە خۆی ڕاگرتبوو کە کەمێک لەچاو دڵۆپەکانی تری چواردەوری زیاتر دەچۆڕانە خوارەوە، مەحاڵ بوو کە بزانرێت وەحشەت بەنیازی چییە، بەڵام دیاربوو کە بەنیازی سەرشێتییە.

لەناکاو وەحشەت چاوەکانی کردەوە، لەژێر ئاوە چۆڕاوەکان خۆی دوور خستەوەو شانەیەکی کەمێک گەورەی لە گیرفانی دەرهێنا، قژەکەی کەبەهۆی ئاوە چۆڕاوەکانەوە بەتەواوەتی تەڕ ببوون بەشانەکەی دەستی دایهێنا، دوایش بۆئەوەی زیاتر تاڵە قژەکانی جوانتر ڕێک بخات شانەیەکی زۆر بچووکی ڕەشی دەرهێنا و قژی پێڕێک خست، قژی ئەبریسکایەوە و بۆدواوەی هەڵدایەوە، لەمافیە ئیتالێکانی ناو فلیمە ئەمەریکێکانی دەکرد، دەستی کرد بە ڕێکردن،

بەڵام شاهین چاوی پێکەوت و کەوتەدوای، وەحشەت ڕاستەوخۆ بەرەو شوێنی حەوانەوەی هەڤاڵە کچەکان ملی نا، پشتی نا بەو دارەوەی کە تەنها ١٠ بۆ ١٥ مەترێک لە شوێنی حەوانەوەی شوێنی هەڤاڵانی کچانەوە دوور بوو، وەحشەت لێرە کەوتە چاوەڕوانیەوە، شێوازی وەستانەکەی خۆی دەگۆڕی، وەک ئەوە وابوو کە بۆ وێنەگرتن پۆز لێبدات، نیەتی وەحشەت ئاشکرا ببوو، شاهین دەیزانی کە دەبێت دەرسێکی بدرێتێ، بەڵام پێش ئەوەی ئۆپەراسیۆنەکانی هێزی سوپای تورک دەست پێبکەن دەبوایە ئێستا زیاتر سەرقاڵی کۆنترۆڵی کەمپەکە بێت بۆیە هیچی پێنەووت.

کاتێک شاهین گەیشتنە لای چادەرکان سەرەتا خۆی کرد بەناو چادرەکەی عەلی موسا کە گرووپەکەی ئەوی لێدەمایەوە، کەس لەناو چادرەکەدا نەبوو، لەسەر زۆپاکەی ناو چادرەکە مەنجەڵێک دانرابوو کە گۆشتی بەرازی تیا ئەکولا، ئەو دەیزانی هەتا هەڤاڵ دڵگەشیان نۆبەی بەرپرسی چێشتخانیان بێت ناتوانرێت ڕێگە لە لێنانی گۆشتی بەراز بگیردرێت، شاهین بەم دیمەنە پێکەنی، چاوی بەناو چادرە چۆڵەکەدا گێڕا، کەجانتاکەی عەلی موسای بینی بەبێ هیچ تەرەدودێک چوو کردیەوەی، ناو جانتاکە پڕبوو لە ئەشیای وەک چای وشک، شەکر، جگەرەی بیانی، دەرزی، دەزو، سابون، شامپۆ و قەڵەمی هەمەجۆرە و کۆمەڵە شتێکی تری زۆریش، شاهین لەدڵی خۆیدا وتی موبارەک جانتاکەی دەڵێی زبڵدانە.

لەچادرەکە چووە دەرەوەو بەرەو گۆڕەپانی کۆبونەوەی گشتیان کەوتەڕێ، باگەر بانگی هەموویانی کرد بۆ کۆبونەوە، دیاربوو شاهین نەیدەویست بچێت بۆ مەیدانی کۆبونەوەکە، دەیویست بچێت لەگەڵ وەحشەت شۆخییەک بکات، ئەگەر پالۆ و نەعمان و بەرچەمیشی لەگەڵ خۆی ببردایە بۆ ئەم شۆخییە دەیزانی کە شۆخێکەیان جدی تر دەبێت، هەربۆیە سەرەتا بانگی پالۆی کرد بۆلای خۆی، باسی بیروبۆچونەکانی خۆی لەبارەی ئازادەوە بۆکرد و پێیووت کە ئازاد بەرێت بۆقاتی هەرە خوارووی ئەشکەوتەکە.

دیار بوو کە پالۆ حەوسەڵەی شتێکی وای نەبوو، هەربۆیە بە شاهینی وت: "من لەم کارەدا نیم".

"تۆ ئەو بێنە بۆ ناو ئەشکەوتەکە ئیتر حەق هیچی ترت نەبێت".

"من ئیتر تەداخولی کاروباری لێپرسینەوە ناکەم".

"لێپرسینەوەی چی؟"

"ئەگەر سیخوڕیش بێت من تەداخول ناکەم! ئەگەر کێشەیەک هەیە لەئارادا با هەڤاڵ باگەر چارەسەری بکات!"

"سیخوڕی چی و باگەری چی؟ وەللای هیچ حاڵی نەبووم".

کاتێک پالۆ زانی کە شاهین ئاگەداری مەسەلەکە نییە پاشان مەسەلەکەی بەتەواوەتی بۆگێڕایەوە بێگومان بەشێوەیەک کە بەزەیی پێدابێتەوە، دەنگی ئەوەندە دەلەرزی خەریک بوو دەست بکات بەگریان، بەڵام بەشێوەیەک باسی مەسەلەکەی دەکرد بۆ شاهین ئەگەر کەسێک نەیناسیانە و گوێی لەم قسانە نەبوایە دەیووت کە وادیارە ئەم پیاوە تاکو ئێستا دەیان سیخوڕی لەناو شۆڕش ئاشکرا کردووە و کەسیش بەچاوی سوود بەخش لێی ناڕوانێت. شاهین پێکەنی، شاهین بە پێکەنینێکەوە پێیووت:

"توخوا لەبەرخاتری منیش ئەم سیخوڕە کەشف بکە".

ئەم قسەیەی شاهین کە بە ئیسلوبێکی گاڵتەجارییەوە کردی دڵی پالۆی پێشکاند، پالۆ پێیووت:

"زۆرباشە تۆش گاڵتەمان پێبکە هەرتۆ مابووی".

"وەڵا بەم قسەیەت دڵم قرچەی لێوەهات، ئێمە بەنیازین شۆخی لەگەڵ وەحشەت بکەین بۆئەوەی جارێکی تر لەبەردەم هەڤاڵە کچەکان سەرقاڵی پۆزلێدان نەبێت، ئەمە هەموو مەبەستی منە".

هەرچەندە لەوە دەچوو کە پالۆ بەم کارە ڕازی بوبێت، بەڵام لەهەمانکاتدا لەوەش دەترسا کە ئەمجارەش بەم کارەیەوە پالۆ کێشەیەکی تر بۆ خۆی دروست بکات، ئەمە یەکەم شۆخی نەبوو کە لەگەڵ وەحشەتی بکەن، پاڵەوانی هەموو شانۆکان و گاڵتەجارێکانیان وەحشەت بوو واتا ئازاد. خۆشباوەڕێکەی و هەستیارێتێکەی ئازاد کە جوانکارێکانی ئەو بوون هەروەها خۆ مەزنکردن و خۆ دەرخستنی لەناو گەریلا کچەکاندا سەرەڕای ئەم لاوەکییە لاوازیانەشی هەڤاڵان بەو شێوەیە قەبوڵیان کردبوو، سەرەڕای ئەوەی جارێک ناردبویانەوە

بۆماڵی خۆیان کەچی ئازاد هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی گەریلایەتی بکات هەربۆیە توانی بووی جارێکی تر بگەڕێتەوە ناو هێزی گەریلا، باگەر ناوی ئازادی نابوو "شێتەکەی کەمپەکەمان"، هەموویان وەحشەتیان بەو شێوەیە قەبوڵ کردبوو، بەڵام ئەگەر جارناجارێک نەترساندرایە لەوانەبوو لە شیرازەی خۆی دەربچێت.

پالۆ خۆی وانیشاندا کە تازە لە مەبەستی شۆخێکە حاڵی بووە هەربۆیە وتی "لەوە دەچێت وەحشەت شایەنی ئەم شۆخییەبێت"، کاتێک لەوێ جیابۆوە ڕوبەڕووی باگەر بۆوە، باگەر لێی پرسی "بۆکوێ دەچێت پالۆ؟ "بەدڵخۆشییەکەوە وتی "شۆخییەک لەگەڵ وەحشەت دەکەین"، باگەر ڕاوەستا و تەماشای شاهینی کرد، بە دەموچاوە گرژاوێکەیەوە ئەوەی نیشاندا کە ئەم شۆخییەی هیچ بەدڵ نییە، بەڵام لەهەمانکاتدا هیچیشی بە شاهین نەووت، زاتەن باگەر نەیدەویست کەبەبێ هۆکار ڕەخنە لە شاهین بگرێت، بەڵام زۆر بەقین بوو دیار بوو پێویستی دەکرد داخی خۆی بەیەکێک بڕێژێت، ئاوڕی لە پالۆ دایەوەو پێیووت "ئەرێ ئەم بەیانییە تۆم هۆشیار نەکردەوە؟"پالۆ تەماشای شاهینی کرد دەیویست پێی بڵێ هاوکاریم بکە، بەڵام هیچ نیشانەیەکی هاوکاری لە شاهینەوە بەدی نەکرد، سەری نەوی کرد و لەبەر خۆیەوە وتی ئەمەش بەسەرمندا ساغ بۆوە، باگەر لێی پرسی "بۆچی؟ ""نا مەبەستم هیچ نییە هیچ ناڵێم"، ئەمجارەیان باگەر لە شاهینی پرسی "سەرگردەکەت کۆنترۆڵ کرد؟ "ئەویش وتی "نەخێر کەمێکی تر کۆنترۆڵی دەکەم"، باگەر پشتی تێکردن، کەچووە ناو ئەشکەوتی جنۆکەکانەوە شاهین بۆکۆنترۆڵکردنەکە بەرەو گردەکە کەوتە ڕێ.

شوێنی ئێشکگریان قەد پاڵێک بوو بەقەد هەورازەکانی چیای مارانەوە، هەموو لایەکی بەفر تەنی بووی، لێرە ئاسان بوو کە تەمومژی ئەو بەرزاییە ببینرێت، لێرەوە زۆربەباشی دەتوانرا ئەو مەترسیانە ببینرێن کەلە چواردەورێوەی دەهات، ئێرە باشترین و گونجاوترین شوێن بوو بۆ چاودێریکردنی ناوچەکە بە گشتی، کاتێک شاهین گەیشتە لایان زانی کە ئێشکگرەکان لە مێژەوەیە خۆیان ئامادەی گەیشتنەکەی شاهین کردووە،

یەکێک لە هەڤاڵە نێشکگرەکان بە دووربین چاوی بەدەورو بەر دەگێڕا، دوو گەریلاکەی تریشیان کتێبیان دەخوێندەوە، دوای ئەوەی شاهین سڵاوی کرد پاشان لەبارەی گۆڕانکاریەکانەوە پرسیاری لێکردن، پێیان وت کە هەموو شوێنێک ئارامە و شوێنی خاڵی چاودێری هێزی دوژمنیش کەلە ئاکرەک و بۆزان بوو هیچ جموجۆڵێکیان نییە، شاهین پێیانیوت زۆرباشە و بەباشی چاودێری بکەن، پاشان دووربینەکەی لە هەڤاڵەکەی وەرگرت و خۆیشی چاوێکی گێڕا، پێیانیوت کە هەڤاڵانی چاوساغ و ڕێزان لە کەمپەکانی ترەوە دێن بۆ ئێرە و ئاگەداربن، لەلایەکەوە بە دووربین چاوی بە چواردەورەکە دەگێڕا لەلایەکی تریشەوە قسەی دەکرد، کاتێک دووربینەکەی خستە سەر کەمپەکەیان قسەکانی خۆی بڕی و ڕووی لە هەڤاڵانی نێشکگرەکان کرد و پێیانیوت "پێش کاتژمێرێک لەمەوبەر کامتان چاوتان بە دووربینەکە دەگێڕا؟ "گەریلایەکیان کتێبەکەی لەناو دەستی لوول کرد و پێیووت "من بووم"، "ئێستا قەڵەباڵغییەک لە کەمپەکە دەبینرێت، هەڤاڵان پێشوازی لەچەند کەسێک دەکەن و باوەش بەیەکدا دەکەن، بەڕای ئێوە ئەمە مانای چییە؟ "گەریلا نێشکگرەکان تەماشایەکی یەکتریان کرد، هەرسێکیان بەتەواوەتی نەیاندەزانی کە مانای چییە، هەڤاڵانی چاوساغ و ڕێزانەکان گەیشتبوونە کەمپەکە و هەڤاڵانی نێشکگریش هەستیان پێنەکردبوو، شاهین هیچی پێنەووتن، بەڵام کاتێک لەوێ جیابۆوە پێیانیوت سبەی هەرئێوە نێشکگرن.

کە شاهین گەڕایەوە بینی کە عەلی موسا لەبەردەم چادرەکە ڕاوەستاوە، شاهین لێی پرسی "لە ژوورەوە چی هەیە؟ "عەلی موساش پێیووت "هەڤاڵانی ڕێزانی ئۆڤەجک لەگەڵ باگەر قسە دەکەن"، "ئەی باشە تۆ چی دەکەیت لێرە؟ ""چاوەڕێی ئەوان دەکەم لەلای ئێمە دەمێننەوە"، دوای ئەوەی شاهین لەوێ جیابۆوە ڕێزانەکان لە چادرەکە هاتنە دەرەوە، فەرماندەی ڕێزانەکان ناوی بەدران بوو، لەبەردەم چادرەکە باگەر تەوقەی لەگەڵ کردنەوە و پێیانیوت کەکەس شوێنی کەمپەکەی تری هەڤالان نەزانێت، عەلی موسا میوانەکانی برد بۆ شوێنی کەرتەکەی خۆی، هەموو گەریلاکانی ئەوێ بەسەر پێوە پێشوازیان لێکردن، کەمتەرخەمیان لە ڕێزوحورمەت بەرامبەر بە میوانەکان نەکرد،

خواردنی ئێوارەیان خستە بەردەمیان، قسەوباسیان کرد، باسی یادەوەرێکانی خۆیانیان کرد، دوایش باسهاتەسەر ئەوەی کە هێزی ئۆفەجک لەکوێ کەمپیان درووست کردووە، هێزی ئۆفەجک ئەو گرووپانەبوون کە چەند ڕۆژێک لەمەوبەر لێرە جیاببونەوە، بەدران وتی ژمارەیان نزیکەی ٦٠ گەریلایەک دەبێت و شوێنەکەیان زۆرباشە و دژ بە هێرش و بۆردۆمانی ئاسمانی سوپای تورک حەشارگەی باشیان درووست کردووە، لەناکاو بەدران ڕووی کردە عەلی موسا و پێیووت "تۆ شارەزایەکی باشی ئەوێیت، ساڵی ڕابوردوو بەیەکەوە مابوینەوە"، کە ئەم قسەیەی کرد پەشیمانی دایگرتەوە، بەڵام کارلەکار ترازابوو، لەبەرئەوەی عەلی موسا کەمێک لەمەوبەر پرسی بووی کە ئایا کەمپەکە لە نێوان ناوچەکانی چەت و گامر دەمێنێتەوە، بەدران تەماشایەکی گەریلاکانی کرد، جگە لە عەلی موسا کەسیان ئەوێیان نەدەزانی، کەمێک دڵی ئاوی خواردەوە، بەڵام پەشیمانی دەچێژا لەبەرئەوەی ئەمەی بۆ عەلی موسا درکاندبوو، کە کەمێک لەمەوبەریش باگەر هۆشیاری کردبۆوە شوێنی ئەو کەمپە لەلای هیچ کەسێک نەدرکێنێت.

٣

باگەر تەمەنی ٣٣ ساڵ بوو، ڕیشە ماش و برنجێکەی و سپیایەکانی ناو قژی بەتەمەنتری نیشان دەدا، نزیکەی ١٠ ساڵ بوو ژیانی گەریلایەتی خۆی لەناو شەڕ و پێکدادان و سەر چیا سەرکەشەکانی کوردستان بەسەربردبوو، بەهۆی ئەو ئازارانەی چێژابووی لەهەمانکاتدا بەهۆی ئەو بەرپرسیارێتییەی لەسەر ئەستۆی بوو بەتەواوەتی کاریگەری لێکردبوو هەربۆیە لە تەمەنی خۆی زیاتر گەورە دەبینرا.

باگەر ئەوەندە گوێی نەدەدا بەوەی کە گەورەتر لە عومری خۆی دەبینرێت و نەیدەکرد بە کێشە، ئەوەی بیری لێدەکردەوە ئەرکەکانی سەرشانی بوون، لەگەڵ هاتنی ئەم وەرزی بەهارە کەلە چاوەڕوانیدا بوون، کاتێک دونیا تاریک داهات هەروەکو زۆرجاری ئەمجارەش نەخەوتبوو، لە ناو چادرە نایلۆنەکە هاتەدەرەوە و ڕاوەستا، کە سروەی با دەیدا لە دەموچاوی واهەستی دەکرد کە

(با) هەموو بۆن و مەرامی شاخ و چەم و درەخت و و زێیەکانی کۆکردۆتەوە و هێناویتی بۆئەم کەمپەی نزیک دەربەندی عەلی.

کەمپەکە بێدەنگ بوو، شەوێکی زۆر تاریک و نووتەک بوو، ڕووی لە هەوراز و سەرگردەکان کردبوو کە وەک ناولەپی دەستی شارەزایان بوو، سەرەڕای ئەوەی جگە لە تاریکی هیچی تر نەدەبینرا، بەڵام ئەو هێشتا بەردەوام بوو لە تێڕوانین، دەیویست هەناوی تاریکی ببینێت، لەنزیک بەشی ڕاستی کەمپەکەدا لەنزیک چەمەکە بەرز بوونەوەی دەنگە دەنگ باگەری لەناو هەناوی تاریکێکان دەرهێنا، تەماشای خوارەوەی کرد، لەبەرتاریکی هیچی نەدی، کاتی ڕۆیشتنی ئەو هەڤاڵانە بوو کەبۆ دڵنیایی لە ناوچەکە جەولەیان دەکرد هەروەها کاتی چوونی هەڤاڵانی چاودێرانیش بوو کە بچن بۆسەر گردەکان، جگەرەیەکی داگیرساند، تیشکی چەرخەکەی کەمێک بەردەم ڕیشی ڕووناک کردەوە، چەند هانگاوێکی نا، ٥٠ مەترێک لەنزیکێوەی هەڤاڵی ئێشکگر هاواری بەسەردا کردوو پێیووت "وشەی نهێنی"، ئەویش بە هێمنییەکەوە پێیووت منم، دیاربوو گەریلا ئێشکگرەکەش دەنگی ناسیبوو بۆیە هیچی تری لێنەپرسی، دوای ماوەیەکی تر دووەمین جگەرەشی داگیرساند و گەڕایەوە ناو چادرە نایلۆنەکەی.

چاودێرانی سەرگردەکان پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە گەیشتبوونە شوێنی خۆیان، ئەو هەڤاڵانەشی جەولەیان دەکرد هەتا تەختایەکەی شەلالەکە چوبون و گەڕابونەوە، گەریلاکان بەیانی زوو لەخەو هەڵسابوون، دوای کۆبونەوەی مەیدانیان قاوەڵتیان کرد و چایەکانیشیان خواردەوە، هەرگیز کولتوری قاوەڵتیان لەدەست نەدەدا، لەکەمپەکەیاندا بەردەوام تۆراغ و چایان هەبوو، پێش ئەوەی کاتی پەروەردە دەست پێبکات بەماوەیەکی کورت کە گوێیان لە دەنگێک بوو کەلە گرمە دەچوو، هەموویان کەوتنە گوێ گرتن، دوای ئەوەی زانیان کە دەنگی کۆپتەرە هەموویان کەوتنە ناو جموجۆڵەوە، گەریلاکان کەوتنە خۆیان و لەماوەیەکی زۆر کورتدا چوونە سەنگەرەکانی خۆیانەوە، لەسەر هاتنی کۆپتەرەکە لەناو خۆیان قسەیان دەکرد، یەکێکیان وتی "لەوانەیە بۆکەشف کردن بسوڕێتەوە"، یەکێکی تریان وتی:

"نەخێر ئەمجارە جدی دیارن".

"بەڕای من چەند موشەکێک دەوەشێنن و دەڕۆن".
"ئەگەر بۆکەشف کردن بهاتنایە بەو ژمارە زۆرەوە نەدەهاتن".
"ئەو گرووپەی دوێنێ بەڕێکەوتن لەوانەیە کەشف بوبێتن".
باگەر و شیاهین بەیەکەوە قسەیان دەکرد، باگەر لێی پرسی:
"گوێت لە بێتەلەکە گرت؟"
"نەخێر".
"لەوانەیە سەرباز دابگرن، چەند گەریلایەک لەگەڵ خۆت بەرە و بەرەو ژوور هەڵگژێن، بزانن لەکوێ سەرباز دادەگرن، لەوانەیە تەنها لەشوێنی چاودێری سەرباز دابگرن، وریابە لەوانەشە جلوبەرگی سپی بەفریان لەبەر خۆیان کردبێت".
شاهین بەخۆی و ۳ گەریلاوە بەسەر تەختایی سەرووی شەلالەکە بەڕێکەوتن و لەگەڵ هەرسێ گەریلاکەدا زۆر بە وریایی بە بەرزایەکەدا هەڵگژان، بەردەوام بە دووربین تەماشای چواردەورەکەیان دەکرد، شاهین زۆر بە وریایی دەجوڵایەوە، نەیدەهێشت هیچی لەژێر دەست دەربچێت، کاتێک گەیشتە سەر گردەکە بینی لەئاستی زێی کلافۆز کۆپتەرەکان بەرەو دەربەندەکە دێن، نزیکەی ۱۰ کۆپتەرێک بەئاسمانەوە بوون، ئەمە کەشفێکی هەروا هاکەزایی نەبوو، شاهین درکی بە جدیەتی نیازی دوژمنەکەیانی کرد، دوای ئەوەی کۆپتەرەکان بەسەر زێیەکاندا چەند جارێک سوڕانەوە بەقەد گاپێڵەکانی چیای ئینجەبێل کەوتنە سەرباز داگرتن.
چەند کۆپتەرێکی کۆبرا و فڕۆکەی جەنگی بەسەر دەربەندی عەلی دەسوڕانەوە، کۆپتەرە بارهەڵگرەکانیش لەسەر گردە دوورەکان سەربازیان دادەگرت، لەهەمانکاتدا باگەر فەرماندەکانی کۆکردبۆوە و لە ناو ئەشکەوتی جنۆکەکان سەرقاڵی کۆبونەوەبوون، دیاربوو باگەر زووتر پێشبینی ئەم هێرشە کتوپڕییەی کردبوو هەروەها درکی بە مەبەست و ئامانجەکانی دوژمن کردبوو هەربۆیە بەسەر پیلانی دوژمنەکەیاندا زاڵتر دیاربوو هەربۆیە بە فەرماندەکانی وت:
"ئامانجی دوژمن ئەوەیە کەلە سێ سوچکەکەدا یەک بگرنەوە، بەڵام

ئامانجی ئێمەش دەبێت ئەوەبێت کە هەتا ئێوارە نەهێڵین ئەم خواستەیان بێتەدی، ئەگەر لە تەختایەکەی سەرووی شەلالەکە ڕوبەڕووی دوژمن ببینەوە نارەحەتیمان بۆ درووست دەبێت، ئامانجی سەرباز داگرتن لە شوێنەکانی وەک بۆزان و کۆزلو و ئەشکەوتی ماران شتێکی ئاشکرایە، دەبێت گردەکانی دەوروبەری سێ سوچکەکەیان لێبگرین و دەبێت هەتا ئێوارە نەیەڵین بگەنە خواستەکەی خۆیان، کە تاریک داهات جارێکی تر لێرە کۆدەبینەوە".

کاتێک دوای قسەکانی باگەر هیچ فەرماندەیەک بیروبۆچونێکی جیاوازی نەهێنایە زمان دووبارە باگەر کەوتەوە قسە و ئەمجارەیان پێیانیوت:

"زاتەن شاهین پێشوتر سەنگەری ئامادەکردووە، بەقەد لێژایی گردەکەوە هەڤاڵ بێستا گرووپێک لە بۆسەدا دادەنێت، هەڤاڵ پالۆش چەند گەریلایەک لەگەڵ خۆیدا دەبات تاکو هاوکاری چاودێرانی سەرگردەکە بکەن، بەهەر شێوەیەک دەبێت با ببێت ناهێڵین دوژمن لەناو قولایی زێیەکە خۆیان جێگیر بکەن، هەڤاڵ بەرچەمیش لەگەڵ هەڤالان ئاریا و سارپادا کاری چاوساغی دەگرنە ئەستۆ".

لەدوای قسەکانی باگەر هەموویان بۆئەنجامدانی ئەرکەکانیان لە ئەشکەوتەکە هاتنە دەرەوە، باگەر بێتەلەکەی گرتە دەستەوە، ئەو دڵنیابوو لەوەی کە هیچ کێشەیەک لەبردنە ڕێوەی شەڕەکە نایەتە ئاراوە.

باگەر کەوتە یاریکردن بە شفرەکانی بێتەلەکەی، دەیویست گوێ لە بێتەلی هێزەکانی دوژمن بگرێت، لەناکاو هەستی کرد کە ئاریا و سارپا بە چاوێکی پڕ مەراقەوە لێی دەڕوانن، خۆیشی هۆیەکەی نەزانی کەبۆچی دڵی خورپەیەکی کرد، لەهەمبەر هێزێکی وای گەورەی دوژمندا شەڕکردن بەچەند گەنجێکی وەک ئەم هەڤاڵانە لەوانەبوو ئەمە گەورەترین بێ شانسی گەلی کورد بێت، لەناکاو گوێی لە چەند دەنگێکی پچڕ، پچڕ بوو کە لێی حاڵی نەدەبوو هەروەها چەند جارێکیش بێتەلەکە زیکەزیکی لێوەدەهات، دوای ئەوەی چەند جارێک دوگمەی بێتەلەکەی بادا ئیتر زیکەزیک نەماو گوێی لە دەنگێکی بێتەلی دوژمن بوو کە بەباشی دەتوانرا لێی حاڵی ببێت، دەنگی بێتەلەکەی زیاد کرد، لە بێتەلەکەوە دەنگێک دەیووت "نابێت ئەمجارەیان بەخت یاوەریان بێت چۆنم پێتان وتبوو

هەروا بکەن ". دەنگێکی تر لە بێتەلەکەوە هات دەیووت "چەند باڵندەیەک کەوتە داوەکەوە ڕاویان بکەین؟ "ئیتر بەردەوام لە بێتەلەکەوە باگەر گوێی لە هاوار و جوێن و ڕێنمایی و فەرمانەکان بوو. باگەر بەم جۆرە قسانە ڕاهاتبوو. بە ئەزموون بوو. ئەوان دەیانزانی کە بەردەوام گەریلا لە بێتەلەوە گوێیان لێدەگرن و گوێ بیستیانن هەربۆیە زۆرجار بۆ هەڵخەڵەتاندنی هێزی گەریلا ئەو جۆرە قسانەیان دەکرد. هەمیشە شەڕی دەروونی دوژمن لەهەمبەر هێزی گەریلادا لەڕێگەی دەنگی بێتەلەکانیانەوە دەیانبرد بەڕێوە. باگەر ئەم قسانەیانی زۆر بە جدی وەرنەدەگرت. بەڵام لەهەمانکاتدا دەیزانی کە ئەم ئۆپەراسیۆنە مەترسیدارە. ساڵی جارێک یان دووجار دوژمن ئۆپەراسیۆنی بۆ دەوروبەری دەربەندی عەلی ئەنجام دەدا. بۆئەوەی ئەنجامیش بەدەست بخەن سوپای تورک بەردەوام بە هێزێکی ۱۰ هەزارییەوە ئەم ئۆپەراسیۆنانەیان ئەنجام دەدا. بێشک دوژمن بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەسەر گەریلادا بەدەست بخەن و هێزی گەریلا لەناوبەرن ئەوەی لەدەستیان بهاتایە دەیانکرد.

کات درەنگ ببوو. ئەو زانیاریانەی گەیشتن بە باگەر ئەگەر کەمێکیش بێت ئاوێکی سازگاری بەسەر کڵپەی مەراق و ئەندێشەی باگەردا کرد. ئەگەر شتی خراپ لەئارادابوایە باگەر ئەوەندە بە شێنەیی نەدەجوڵایەوە. بەرچەم بۆئەوەی زانیاری لە بارەی گۆرانکارێکان بەدەست بخات و لە جدییەتی مەسەلەکە سەر دەربکات ڕێگە چارەیەکی ئاسانی بۆخۆی دۆزیبۆوە ئەویش ئەوەبوو کە تەماشایەکی ڕووخساری باگەر بکات لەهەموو مەسەلەکە حاڵی دەبوو. کە دونیا تاریک داهات گەریلاکان لە شوێنی خوێندنگەکەیان کۆبونەوە. هەموو گرووپەکان بەبێ هیچ کەموکوڕییەک ئامادەبوون. باگەر پێیانیوت "هەتا دەتوانن ئازوقە لەگەڵ خۆتاندا هەڵگرن دەی دەکەوینە ڕێ ". لەماوەی نیو کاتژمێردا جانتاکانیان پڕکرد لە ئازوقە. ئامادەباشێکان تەواوکران و کەوتنە ڕێ. جگە لە چەند فەرماندەیەک کەسی تر نەیدەزانی کە گەریلاکان بۆکوێ دەچن. تەنها چەند کاتژمێرێک ڕێیان کرد. هەموویان چاوەڕێی ئەوەبوون کە ڕێگەوبانێکی سەخت و دژوار ببڕن. بەڵام دوای ماوەیەک باگەر وتی گەیشتینە شوێنی مەبەست. دوای ئەم ڕۆژە پڕ لە شڵەژاوییە و ئەم کەشوهەوا ساردە

و ماندوبونەیان گەریلاکان خوازیاری ئەوەبوون کە شوێنێکی گەرم پەیدا بکەن و خۆیان تێیدا درێژ بکەن، شوێنی حەشارگەکەیان یەکەمجار بوو کە گەریلاکانیش ببینن کە ئەشکەوتێکی تازە بینراوبوو، دوو ساڵ لەمەوبەر شاهین ئەم ئەشکەوتەی بەرێکەوت دۆزیبۆوە، ئێرەشی تەنها نیشانی باگەر دابوو، باگەریش بە هیچ شێوەیەک ئێرەی بەکار نەهێنابوو، بۆ ڕۆژی تەنگانە هەڵیگرتبوو، گەریلاکان دڵخۆش بوون بەوەی کە بەبێ ئەوەی تووشی زیانی گیانی ببنەوە گەیشتبوونە شوێنی گونجاوی خۆیان، لەهەمانکاتیشدا زۆر دڵخۆش بوون بەوەی کە هاتونەتە ناو ئەشکەوتێکی بەم شێوەیە.

سەرەتا یەکێکیان دەچووە ناو ئەم ئەشکەوتەوە و کۆنترۆڵی دەکرد، ئەگەر کێشە نەهاتایەتە ئاراوە ئەوا گەریلاکان بەدوای یەکدا دەچوونە ناوەوە، کونی ئەشکەوتەکە ئەوەندە تەنگ بوو کە تەنها کەسێک بەزۆر دەیتوانی بچێتە ناوەوە، لەپێش هەموویان بەرچەم چووە ناو ئەشکەوتەکەوە، لە ناو ئەشکەوتەکە چاوچاوی نەدەبینی، هەربۆیە نەدەتوانرا کەلەبارەی چۆنیەتی ناوەوەی ئەشکەوتەکە زانیاری بەدەست بخرێت، بەرچەم لەناو ئەشکەوتەکە دەستەکانی خۆی درێژ کردبوو دەچووە پێشەوە، دڵی لێی دەداو دەترسا لەوەی کەلەناکاو دەستی بەرشتێکی نەخوازیار و ترسناک بکەوێت.

باگەر هاواری لێکردوو پێیووت مەترسە زیاتر بڕۆ، بەرچەم چەرخەکەی داگیرساند، ڕوبەڕووی هیچ مەترسیەک نەبۆوە، دوای ئەوەی بەدوای یەکدا گەریلاکان چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە باگەر ماوەیەک لە دەرەوە مایەوە، کوونی ئەشکەوتەکە بەقەد پاڵێکەوە بوو، نزیکەی یەك کیلۆ متر لە سەرووی زێیەکەوە بوو، ئەگەر کەسێک لەقەد زێیەکەوە تەماشای سەرووی بکردایە مەحاڵ بوو کە ئەم کوونی ئەشکەوتە ببینێت، بەقەد پاڵەکەوە چەندین داری سنەوبەری تاکوتەرای پێوەبوو، باگەر وەک ئەوە وابوو کە تازە بە تازە هەستی بەم دارە سنەوبەرانە کردبێت وابوو هەربۆیە بە شاهینی وت کە ئەویش لە دەرەوە مابۆوە کە دارێکی سنەوبەر ببڕیت لەبەردەم کوونی ئەشکەوتەکە قیتی بکاتەوە، بەم شێوەیە ئەگەر لە نزیکیشەوە لێی بڕوانرایە کوونی ئەشکەوتەکە نەدەبینرا، باگەر ئاسودە بوو، جگە لە ئێشکگرەکان هەموویان دەیانتوانی

بنوون، شەویان بە ئاسودەیی بردەسەر، بەدرێژایی شەو خەوتبوون و ماندوویی ئەو ڕۆژەیان لەقەد خۆیان تەکاند و بەیانیش زۆر بە گەرموگوڕییەوە بەئاگاهاتن.

بەیانی کە باگەر بەئاگاهاتەوە ڕاستەوخۆ سەری لە کوونی ئەشکەوتەکە دەرهێنا و چاوێکی بە چواردەورەکەی گێڕا، چاوی بە شتێک نەکەوت کە نیگەرانی بکات، بەهۆی تیشکی دەرەوەکەمێک ناو ئەشکەوتەکە ڕووناک ببۆوە، ئەشکەوتەکە نزیکەی ٥٠ مەترێک لەناوەوە درێژ بوو، دەستپێکەکەی ناوەوەی پان بوو، بەڵام بەرەو کۆتاییەکەی هێواش، هێواش تەنگ دەبۆوە، نێوان بنمیچ و زەوێکە ئەوەندە بوو کە دەستت درێژ بکردایە دەستت بەر بنمیچەکە نەدەکەوت، لەبەرئەوەی ئاوی باران دزەی نەکردبووە ناو ئەشکەوتەکەوە ناوەوەی وشک بوو، ئەوەی کە ناڕەحەتی درووست دەکرد تەنها خۆڵە کەڵەکە بۆوەکەی ناو ئەشکەوتەکە بوو، لەبەرئەوەی دەبوایە بەناچاری چەند ڕۆژێک لێرە بەرنەسەر هەموویان سەرقاڵی پاککردنەوەی شوێنەکانی خۆیان بوون.

ئەم کاری خاوێنکردنەوەی خاکوخۆڵی ناو ئەشکەوتەکە گەریلاکانی ڕوبەڕووی مێژوویەکی مرۆڤایەتی هەرێمی دێرسیمی کردبۆوە، لەژێر خاک و خۆڵەکاندا ئێسکو پروسکی مرۆڤیان دۆزییەوە، دۆزینەوەی ئەم پارچە ئێسکو پروسکانە لە دڵی چەند گەریلایەکیان خروپەی درووست کردبوو، بەڵام لەهەمانکاتدا ڕوبەڕووی تراژیدیای مێژووش ببونەوە کەلەهەمبەر مرۆڤایەتی ئەنجام درابوو، لەناوخۆیاندا هیچ گەنگەشەی ئەوەیان نەکرد کە ئەم ئێسک و پروسکانە هی کێن و دەگەڕێتەوە بۆ چی سەردەمێک، ئەوانەی شارەزای دەرسیم و مێژووە خوێناوێکەی بوون لەبارەی کارەساتە تراژێدیاکەی ساڵی ١٩٣٨ وە زانیاریان هەبوو، هەربۆیە ئەم شوێنە ئەو شوێنە بوو کە خوێنی لێرژابوو.

گەریلاکانی ناو ئەشکەوتەکە ڕوبەڕووی قەدەرێکی ناچاری مرۆڤایەتی ببونەوە، بیریان لەو مرۆڤانە دەکردەوە کە سەردانی ئێرەیان کردەوە و لێرەش گیانیان بەم ئەشکەوتە سپاردووە، بیریان لەوە دەکردەوە کە ئەم مرۆڤانە بەچی مەبەستێک خۆیان گەیاندۆتە ئێرە و دوا یادەوەریان چی بووە و چۆن مردوون، دوایش لە نێوان خۆیان و ئەو مرۆڤانەی لێرە کۆتایی بە ژیانیان هاتبوو

بەراورد کرد، هەرچەندە ئەم ئەشکەوتە بە شوێنی ڕزگاربوون لە مردنیش پێناسە بکرێت، بەڵام لەهەمانکاتدا گۆڕستانیش بوو، لە ساڵی ١٩٣٨ لە ترسی کۆمەڵکوژێکەی دەوڵەتی تورک خەڵکی ناوچەکە پەنایان بۆ ئێرە هێناوە، بەڵام هەرلێرەش ببوون بە ئێسک و پروسک، ئەی ئێستا کێ گرنتی ئەوە دەدات کە هەمان چارەنووس نابێتەوە بە قەدەری ئەم گەریلایانەش.

کە ڕۆژ بۆوە سەربازەکانی هێزی دوژمن خۆیان گەیاندبووە زێیەکە، ئەو شوێنەی کە یەکەمجار بۆی چوون ئەشکەوتی جنۆکەکان بوو، بەهیچ شێوەیەک ئاسەوارێکیان لەبارەی گەریلاکانەوە نەدۆزیبۆوە کە بۆکوێ چوونە، بستێکی دەربەندی عەلییان نەهێشتەوە کەسەری پیانەکەن، ١٠ هەزار سەرباز دەستیان بەسەر هەموو گرد و قەد پاڵ و کاپێڵ و ڕێگەوبانەکان و ئەشکەوتەکان گرتبوو، بەڵام گەریلاکان بەبێ ئەوەی لەدوای خۆیان هیچ ئاسەوارێک بەجێبهێڵن خۆیان لە دوژمنەکەیان ون کردبوو، سەربازەکان هەموو ڕێگەوبانەکان و شوێنەکانی گەریلایان گرتبوو هەربۆیە پێیان وابوو هەرچەندیشە خۆیان شاردۆتەوە، بەڵام بۆماوەیەکی زۆر لەبەر برسێتی خۆیان پێڕاناگیرێت و زوو یان درەنگ هەر دەردەکەون، ئەمە ببوو بە ئومێدی هەرە گەورەی ئێستای سەربازەکان.

یەکەم ڕۆژی گەریلاکان لە ئەشکەوتەکەدا ئارامانە بەسەرچوو، بەڵام نیگەران بوون، ڕۆژی دووەمیش تەماشای ئەو ئازوقانەیان دەکرد کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابویان، دەیانویست بزانن کە تا چەند ڕۆژ بەشیان دەکات، ئەوەی کە ناوی دەبرا بە ئازوقە لە ڕاستیدا لە نانی وشک پێکدەهات هەروەها کەمێک شەکریان پێبوو لەگەڵ جانتایەک لە قاورمەی گۆشت، بەڵام ئەمانە تەنها بەشی یەک ڕۆژیانی دەکرد، بەگوێرەی ئەو نانەی پێیان بوو ڕۆژانە هەر گەریلایەک یەک نانی بەر دەکەوت، بەم شێوەیە دەتوانرا پێنج یان شەش ڕۆژ بەرگە بگرن، لەراستیدا هەموو شتێک گرێدراوی ئەوەبوو کە ئایا سەربازەکان لە دەربەندی عەلی دوای چەند ڕۆژی تر دەکشێنەوە.

باگەر دەیووت "ئەگەر ئەم ئۆپەراسیۆنە بەتاڵ دەربخەین ئەوا مەحاڵە ئەم بەهارە هێزی دوژمن بتوانن بەسەلامەتی لەم چیایانەدا ڕزگاریان ببێت

"، ئەگەر بەبێ ئەوەی شەهید بوون بێتە ئاراوە و بەبێ ئەوەی هێزی گەریلا شەکەت و ماندوو بێن بگەنە وەرزی بەهار ئەوا بەهار و دوای بەهاریش بۆ گەریلا دەبێت بە ساڵی سەرکەوتنی دواجارەکی و وەرچەرخان، ئێوارە بەفر دایکرد کە هیچ چاوەڕێی نەبوون، ئەمە بۆ گەریلاکان هەلێکی باش بوو، باگەر هەڤاڵ شاهین و غالیبی بانگ کردە لای خۆی و پێیانیوت "مادام بەفرباری پێویستە چاوێک بە چواردەورماندا بخشێنین هەرچۆنێک بێت شوێنی پێ زوو دەسڕێتەوە، پێویستە بزانین کە هێزی دوژمن کامە گردیان گرتووە و لەکوێ سەنگەریان لێداوە "، شاهینیش هەمان بیروبۆچونی باگەری هەبوو، دوای ماوەیەک کەوتنە ڕێ، بەفر ئاسەواری تووڵە ڕێگەکانی نەهێشتبوو، تەنانەت بەفرێکی زۆریش بەسەر دارەکەی بەردەم ئەشکەوتەکەوە بوو، شاهین و غالیب بەدزییەکەوە بەرەو خوارەوە شۆڕبوونەوە، زۆر سارد بوو، هەردوکییان کەوتنە لەرزین، کاتێک گەیشتنە ئەو شوێنەی کە ڕێگەکەی دەگەیشتە سەر زنێیەکە شاهین ڕاوەستا، چەند بەردێکی لەسەریەک دانا، ئەمە ئەو ئیشاراتە بوو کە لەکاتی گەڕانەوەیان شوێنی خۆیانی پێبدۆزنەوە، بەرەو زنێیەکە زیاتر خۆیان شۆڕکردەوە، لەبەرئەوەی نەدەزانرا هێزی دوژمن لە کوێن و لەکوێ سەنگەریان گرتووە دەبوایە زۆر بەباشی بجوڵێنەوە، دوای ئەوەی ماوەی کاتژمێرێک ڕێگەیان بڕی گەیشتنە لای ئەو چەمەی کە چێشتخان و کەمپەکەیانی لەیەک جیادەکردەوە کە نزیکی ئەشکەوتی جنۆکەکان بوو، شاهین میلی چەکەکەی ڕاکێشا و بە غالیبی وت کە لێرە بمێنێتەوە و خۆیشی بەرەو بەرزایەکەی لای چەمەکە هەڵگژا، دوای ئەوەی گەیشتە نزیک بەرزایەکە خۆی درێژ کرد، بۆئەوەی تەماشای شوێنی خوێندنگەکەیان بکات سەری هەڵبڕی، کۆمەڵە ئاگرێکی لەیەک پەرتەوازە بینی کە کڵپەیان دەکرد، ژمارەیەکی زۆری سەربازیش بە چواردەوری ئاگرەکەوە بوون و خۆیان گەرم دەکردەوە، تەماشایەکی خوارووی سەربازەکانی کرد، بەدرێژایی ئەوەی چاوی بڕ بکات بینی ئاگر کراوەتەوە، جارێکی تر گەڕایەوە بۆلای چەمەکە، بۆئەوەی تەماشای شوێنی چێشتخانەکەیان بکات خۆی گەیاندە قەد پاڵی گردەکەی تر، ئاگرێکی بەرز لە شوێنی فڕنەکەیان کرابۆوە، شاهین خۆی کشانەوە

بۆلای غالیب، ماوەیەک بیری کردەوە، دوایش دوو ڕوومانەی خستە ناو دەستەکانێوەی و کەوتە چاوەڕوانییەوە.

غالیب سەرسام مابوو، بەڵام ئێرە شوێنی پرسیارکردن و قسەکردن نەبوو، کاتێک بینی شاهین خۆی کرد بە ژێر ئەو لقە شۆڕەبیانەی کە بۆ پەڕینەوە وەک پرد درووستیان کردبوو بەخۆیی وت ئەرێ ئەم هەڤاڵە بەنیازی چییە؟ شاهین بە ئیشارات پێیووت کە ڕوومانەکان دەگرێتە ناو ئاگری سەربازەکانەوە، نێوان ئەمان و سەربازەکان هەر ٥٠ مەترێک دەبوو، دەیانتوانی دوای فڕێدانی ڕوومانەکان بۆناو ئاگرەکە پاشان هەڵبێن، بەڵام ئەی دوایی؟ لەم بارەیەوە غالیب نیگەران بوو، هەربۆیە بە شاهینی وت ئەگەر چالاکی بکەین لەوانەیە بتوانن ئەشکەوتەکە بدۆزنەوە، شاهین تەماشایەکی غالیبی کرد، هەستی بە دوودڵییەک کرد هەربۆیە لەسەر بەردێک دانیشت، شاهین دەیزانی کە ئەگەر مەسەلە بێتە سەر ئەنجامدانی چالاکی غالیب تووشی چ حاڵەتێک دێت، تاکو ئێستا هەردووکیان زۆرجار بەیەکەوە چالاکییان ئەنجامداوە و کەوتونەتە ناو شەڕەوە و لەیەک سەنگەر شەڕیان کردووە، ئەم چالاکیانە وەک ئاوێنەی ناخی مرۆڤ لێدێت و دەتوانرێت بە ئاسانی درکی پێبکرێت کە ئەو مرۆڤە هەست بە چی دەکات و دەیەوێت چی بکات، هەربۆیە ئەم ئاوێنەیە لەبارەی چۆنییەتی خواست و ئارەزووی غالیبەوە بەس بوو بۆ شاهین، لەڕاستیدا شاهین و غالیب لەسەرچاوەی یەک ئاوی کولتورە کۆمەڵایەتییەکانەوە ئاویان خواردبۆوە و خەڵکی یەک هەرێم بوون، شاهین خەڵکی قرخلەرن بوو کەسەر بە شارۆچکەی پیرانە، غالیبیش خەڵکی ناو شاری ئامەد بوو، هەرچەندە هەردووکیان نمونەی دوو کەسایەتی جیاوازیش بوون، بەڵام لەهەمانکاتدا هەردووکیان لەیەک سەنگەردا بوون، کەسایەتی هەردووکیان جیاواز بوو، تەنانەت دەتوانرێت بوترێت دوو کەسایەتی و دوو خووی دژ بە یەک بوون، لەهەردوکیاندا نەریتێکی خۆ بە کاکەیی زان هەبوو هەردووکیان حەزیان لە براگەورەیی بوو، لە کاتی قسەکردندا بەخشندەیی و میهرەبانیان پێوە بەدیدەکرا، لەڕێکردنیشدا ئاوارەییان پێوە دیار بوو، شاهینیان کەمێک جیاوازتر بوو، دەبوایە شت گەلێکی بکردایە کەخۆی پێی ڕاست بوو، تەنانەت لەم بارەیەشەوە پاشگەز

نەدبۆوە، خۆی بە براگەورە نیشاندانەکەشی وایلێکردبوو کە بیکات بە خاوەن کەسایەتییەکی بەهێزی خاوەن کاریزمەی فەرماندارێتی، شاهین کەسێکی جوامێر بوو، خاوەن کەسایەتی تایبەتی خۆی بوو، بەکورتێکەی قسەیەک هەیە لەناو خەڵکی کە دەڵێت فڵانکەس مەردە شاهینیش ناوابوو، غالیبیان دەیویست کە وەکو خۆی بمێنێتەوە ئاواتی هەڵکشانی بۆ سەروو نەبوو، ئەو زیاتر لە حاڵەتی پێویستیدا خۆی دەردەخست، لەهەمانکاتیشدا دەیزانی کە لەحاڵەتی پێویستدا بۆخۆ ڕزگارکردن چۆن ڕێگە چارەیەک بگرێتەبەر، بۆنمونە لەکاتی ئەنجامدانی چالاکی ئەگەر بیوتایە دەمەوێت لەریزی پێشەوە جێگابگرم مانای وابوو کە دەمەوێت لەدوای دوا بمێنمەوە، ئەوەی بیناسیبایە دەستی دەنا بە ڕووی خواستەکەیەوە، بەگوێری ئەوەش لەبارەی غالیبەوە بڕیاریان دەدا.

شاهین بەهەر شێوەیەک بوایە غالیبی خۆشدەویست، غالیب بەمانای کەلیمە وابەستەی شۆڕش بوو، ناسینی کەسایەتی هەر گەریلایەک شتێکی سوود بەخشە، شاهین ئەم مەسەلەیەی زۆر بەلاوە گرنگ بوو واتا ناسینی کەسایەتی تاکی گەریلا، شاهین ئەوەی باش دەزانی کە پێویستە کەسایەتی ئەو کەسانە بزانێت کە ڕادەستی کراون چونکە سەنگەری لەگەڵیان دەگرت و لەهەمانکاتدا دەیویست بزانێت لەگەڵ کێدا و چۆن و تا کوێ ڕێدەکات.

شاهین کە ئێستا دانیشتبوو لەسەر بەردەکە و بیری دەکردەوە هەروەها دەیزانی کە غالیب لەسەر حەقە، لەهەمانکاتیشدا بەوە نیگەران بوو کە دەیزانی هۆکاری نیگەرانییە ڕاستەقینەکەی غالیب دەزانی چییە هەربۆیە ناخی خۆی خواردبۆوە، شاهین تاماوەیەک لە نێوان غالیب و غروری خۆیدا ململانێی بوو، دوایش بیری لەوە کردەوە کە دانیشتن لێرە و بیرکردنەوە لە ڕەوشی دوژمن کارێکی گونجاو نییە، هەربۆیە ئەویش بیرکردنەوەکانی غالیبی بە گونجاو زانی و ڕوومانەکانی خستە ناو کڵێفەکەی قەدیێوەی، کاتێک شاهین وتی بابڕۆین غالیب بەم قسەیەی سمێڵی بزکەی کرد، بە شوێنەکەی خۆیاندا گەڕانەوە، بەدرێژایی ڕێگە شاهین چاوی لەکەناری زێیەکە بڕی بوو، دوای کاتژمێرێک ڕێکردن گەیشتنە ئەو بەردانەی کە بۆ ئیشارات بەسەریەکەوە

دایاننابوو، هێشتا بەفر بەردەوام دەباری، تەنها بەقەد باڵەکانەوە شوێنی پێیان دیاربوو، ئەویش دوای ماوەیەک بەهۆی بارینی بەفرەوە نەدەمان.

کاتێک لە کوونی ئەشکەوتەکە چوونە ژوورەوە بۆنێکی ناخۆشی شێدار بە لوتیاندا هات، هەتا چاویان لەگەڵ تاریکی ئەشکەوتەکە ڕاهات لەبەردەم کوونەکە تاماوەیەک مانەوە، دوایش چوونە لای باگەر و بە وردی چوون و هاتنەوەکەیان بۆباسکرد، هێزی دوژمن بە تەواوەتی کەمپەکەیانیانی داگیرکردبوو، ئاگریان لە هەموو شوێنێک کردبۆوە، دەبوایە چەند ڕۆژێک چاوەڕێی یەکالابونەوەی ئەم ڕەوشەیان بکردایە.

ڕۆژی دوایی چواردەوری زێیەکە زۆر کشومات بوو، هەتا ئێوارە یەک، دوو جارێک گوێیان لە نزیک بوونەوە و دەوورکەوتنەوەی دەنگی کۆپتەر بوو، ئەگەر بەسەرچوونی کات لێرە ناخۆشیش بوبێت هەرچۆنێک بێت ڕۆژگاریان بەسەردەبرد، ئازوقەیان خۆی لە کەمی دابوو، ئیدارەکردن بە نانە ڕەق ئاسان نەبوو، لە ڕۆژی چوارەمدا ئەشەکەوتەکە وەک زیندانی لێهاتبوو، هەموویان خوازیاری ئەوەبوون کە بە زووترین کات لێرە بێنە دەرەوە، بەرچەم کەلە کوونی ئەشکەوتەکەوە نزیک بوو لەکاتی نیوەڕۆدا پێیانیوت کە گوێی لە هەندێک دەنگ بووە، هەموویان گوێی خۆیان ڕادێرا، بێدەنگی چەند ڕۆژەیان ئیتر لەئارادا نەمابوو، لەسەرووی ئەشکەوتەکە و لەکەناری زێیەکەوە دەنگی هاوار دەبیسترا، دوای ماوەیەک دەنگە دەنگەکان زیادیان کرد، زیادبوونی دەنگەکان و زیاد بوونی دەنگی سەگەل ئەوەیان نیشان دەدا کە سەربازەکان لە ئەشکەوتەکە نزیک بونەتەوە، بەڵام کوونی ئەشکەوتەکە لە خوارو و سەرەوەش نەدەبینرا، بەڵام ئێستا هەموویان بە هاتنی ئەم سەگانە نیگەران ببوون.

جگە لە چاوەڕوانی و ڕازی بوون بە قەدەری خۆیان شتێکی تریان لەدەست نەدەهات، وایان لێهاتبوو کە نەیاندەتوانی هەناسەش بدەن، دوای ماوەیەک لەجیاتی هاوار و جوێندان و دەنگی سەگەکان گوێیان لە پێکەنین بوو، دوایش هیچ دەنگێک لەئارادا نەما، دەوروبەری زێیەکە کپ و خامۆش بۆوە، لەوە دەچوو کە سەربازەکان ڕۆیشتبێتن، کەمێک هۆشیان هاتەوە

سەرخۆیان، دیسان کەوتنەوە چاوەڕوانی، لەهەمانکاتیشدا نەیاندەزانی کە ئەم ڕەوشەیان چەنێک دەخایەنێت، هەتا سەربازەکانی دەوروبەری دەربەندی عەلی پاشەکشێیان نەکردایە لە ئەشکەوتەکە نەدەهاتنە دەرەوە.

هەموو گەریلاکان بەهۆی سڕبوون و ئازاری پشت و بێ هەواییان کەوتبوونە سکاڵا کردن، ئیتر نەدەتوانرا لەوە زیاتر لە ئەشکەوتەکە بمێنرێتەوە، لە پێنجەمین ڕۆژدا ژمارەی پێشنیاری دەرچوون لە ئەشکەوتەکە زیادی کرد، تەنانەت هەندێک گەریلایان ئەوەیان دەهێنایە زمان کە مردن لەمانەوەی ئێرە باشترە، باگەر بۆئەوەی چارەیەک بۆ ئەم ناڕەحەتی و سکاڵایانە بدۆزێتەوە و بۆئەوەی ڕێگەیەک بۆ ئەم قسانەیان وەک چارەسەری پەیدا بکات کە بۆنی ناڕەزاییان لێدەهات ناچارما کە کۆبونەوەیەک ئەنجام بدات، لە کۆبونەوەکەدا لە نێوانیاندا گەنگەشە هاتەئاراوە، عەلی موسایان ئەمانی ئازوقەیانی وەک کێشەیەکی گەورە لەبەردەمیان قیتکردبۆوە، بەرچەمیش ئەم مژارەی عەلی موسا هێنابوویە زمان وەک شەرمێک ناوزەند دەکرد، لەئاکامدا کێشمەکێشی نێوانیان پەرەی سەندبوو، بەڵام توانراش ١٠ پیلان بۆخۆیان دابنێن.

ئەگەر باگەر هاواری بە سەریاندا نەکردایە کەسیان بێدەنگ نەدەبوو، بەگشتی لەکاتی کۆبونەوەدا بۆ قسەکردن دەستیان هەڵدەبڕی و هەتا مۆڵەت وەرنەگیرایە کەس قسەی نەدەکرد و تەنانەت هێنانە زمانی سەختترین ڕەخنەش بە سنگێکی فراوانەوە وەردەگیرا هەروەها لە چوارچێوەی کولتوری ڕێکخستنندا ڕەخنە گرتن و ڕەخنە لەخۆ گرتن بە شێوازێکی پێویست دەبینرا، بەڵام ئێستا شیرازەیان تێکچو بوو تەنانەت بەرگەی بچوکترین ڕەخنەشیان نەدەگرت، شاهین لەبارەی ئەم ڕەوشەی تێی کەوتبوون دەیووت کاتێک لەناو تاریکیدا کۆبونەوە ئەنجام بدرێت زمان ڕێی خۆی ون دەکات، لەکۆبونەوەکەدا بڕیاردرا کە ڕۆژێکی تریش لە ئەشکەوتەکە بمێننەوە، شاهین و بەدران ئەرکدار کران کە سبەی دەربچن و چاوێک بەناوچەکەدا بگێڕن، بۆ سبەی شاهین و بەدران لە ئەشکەوتەکە دەرچوون و دوای کاتژمێرێک گەڕانەوە و مژدەیەکی خۆشیان پێ بوو، بەڵێ سەربازەکان لە چواردەوری دەربەندی عەلی

پاشەکشێیان کردبوو.

هێزی دوژمن پاشەکشێی کردبوو کەمپەکەشیان بەسەریەکدا وێران کرابوو، ئەم ڕەوشە دڵی گەریلاکانی تەنگ کردبوو، بەڵام لەهەمانکاتدا بەختەوەر بوون بەوەی کە ئۆپەراسیۆنی هێزی دوژمنیان بەتاڵ کردبۆوەو هیچ شەڕوپێکدادان نەهاتبووە ئاراوەو زیانیشیان لێنەکەوتبوو. ماوەی هەفتەیەک سەرقاڵی چاککردنەوەی کەمپەکە بوون هەتا هێنایانەوە سەر دۆخی جارانیان، دڵگەشیان قاورمەکانی ناو حەشارگەکانیانی دەرهێنابوو، فڕنی چێشتخانە تێکدراوەکەی جۆشدابوو، بەم شێوەیە سکی هەموویان تێرکرا، ئەو ڕۆژەی لە نەشکەوتی جنۆکەکان دەستکرایەوە بە پەروەردەی سیاسی شاهین دەستی خۆی هەڵبڕی و چوو بۆلای باگەر کەلە سەر کورسی مێزی دیوانی پەروەردەکە دانیشتبوو لێی نزیک بۆوە و شتێکی چرپاند بە گوێیدا، باگەر سەری باداو پێیووت "باشە"، دوایش وتی "هەڤاڵان پالۆ و ئازاد و نەعمان بابچنە دەرەوە"، پالۆ و نەعمان هەڵسان، بەڵام ئازادیان دیار نەبوو، شاهین چاوی بۆ ئازاد گێڕا، بەڵام نەیبینی، شاهین بەرەو سوچی کۆتایی نەشکەوتەکە چوو، ئەو نایلۆنانەی کاتی خۆی بە بنمیچی نەشکەوتەکەوە بوون لەسەر زەویەکە فڕێدرابوون، شاهین هەڵیانی دایەوە بینی کە لە نێوانیاندا ئازاد جگەرەی بەدەستەوەیە و جگەرە دەکێشێت و کاغەز و قەڵەمیشی پێبوو شتی دەنوسیەوە، شاهین سەری بەلای باگەر سوڕاندو پێیووت "ئازادم دۆزیەوە! "باگەر وتی "وەرن بۆ ئێرە"، ئازاد بە هەستکردن بەو تاوانەی ئەنجامی دابوو بەرەو باگەر و هەڤاڵەکانی هەنگاوی نا، باگەر پێیووت:

"چیت دەکرد لەوێ؟"

"هیچ".

"چۆن هیچ؟"

"نازانم هۆیەکەی چی بوو لەکتوخۆڕایی خەوم هات!"

باگەر زۆری لەخۆی دەکرد کە پێنەکەنێت، شاهین پێیووت:

"بەدەم جگەرە کێشانەوە سەرقاڵی شیعر نوسینەوە بوویت؟"

باگەریش وتی:

"شیعری چی، کوا بمدەرێ بابۆ هەمووهەڤاڵانی بخوێنمەوە".

دیاربوو ئەم قسەیە دڵی ئازادی خۆشکردبوو هەربۆیە بەخێرایی دەستی کردە گیرفانی و ئەو کاغەزەی دەرهێنا کە شیعرەکەی لەسەر نوسیبوو دای بە باگەر، باگەر چاوێکی پیاخشاند، پاشان وتی:

"هەڤاڵان مژاری هونەری جەنگ بەم پارچە شیعرە درێژە پێدەدەین".

باگەر کەوتە خوێندنەوەی شیعرەکە و وتی:

(زمانم لە سوچگەی خاک تێسوواند و چاوەکانتم ڕوان
ئەوکاتەی تیشکی لێوەکانت لە ناو نارەقەی لەشمدا دەشکان
ئاسەوارێک لەتۆوە بەجێما.
برژانەکانتم کرد بە حەبلی چاڵ، ئۆقیانوسیشم خستە ناو مشتمەوە
کاتێک خۆکوژیم وەک ڕووبار خستە ئامێز هەتا بەیانی، بەڵام تەڕ نەبووم
بە پەنجە ڕچیوەکانم خەیاڵەکانم مژین
لە لیکەکەیدا بە چوار ناڵە بۆنی خنجەرێکم کرد
شارێک لەناو خۆڵەمێشم کوڵا
لە پەرداخێکی مەستیدا ئاسۆ هاتە ناو هەناومەوە
ئەو کاتەی پێ پیلکەکان نوستبوون لە شەقامەکان
قەدەر منی لەناو تەمەنی خۆیدا کۆکردەوە
شیعر دەپلیقێنمەوە).

دوای خوێندنەوەی شیعرەکە هەموو گەریلاکان بەدەم قاقای پێکەنینەوە کەوتنە چەپڵە لێدان، نەیانقریشکاند و دەیانووت ڕاستەدەکەیت ڕاستە تەنها نەپلیقانەوە بەڵکو توخمیشیانت نەهێشت، باگەر کەوتەوە خوێندنەوەی شیعرەکە:

(شیعر دەپلیقێنمەوە
برینپێچ لەبەرخۆم دەکەم
لەسەر تەدبیرەکان خۆم درێژ دەکەم
شیعری ئازاد دەدەم بەخۆمدا).

کە باگەر کۆتایی بە شیعرەکە هێنا ئازاد بەبێ هیچ هۆکارێک بزەیەکی کردو

گەریلاکانیش لە ڕووخساریاندا گاڵتەجاریان پێوەدیار بوو، باگەر پرسی "ئەمە چییە؟ " ئازادیش وتی "شیعرە! " "باش حاڵی نەبووم دەتەوێت لەم شیعرەدا چی بڵێیت؟ " ئازاد کەوتە بیرکردنەوە، تەماشای هەڤاڵەکانی کرد، هەستی دەکرد کە ناچاربووە ڕوونکردنەوەیەکی زۆر گرنگ بکات و هەوڵیدەدا کە شیکاری مانای شیعرەکەی بکات، ئازادوتی "شیعرەکە مەبەستی ئەوەیە ئەگەر مرۆڤ زمانی نەبێت لە لێژاییەکەوە دەکەوێتە خوارەوە، لەبەرئەوەی ئێمە زارۆکی میللەتێکین بە هەزارەها چەشنی تەڵەکەبازی جیاوازەوە خۆکوژیمان پێکراوە، شارەکان گڕیان گرتووە و بەناوی شەراب و کڵپەوە ویستم ئەو مانایە ببەخشم "، باگەر پرسی "باشە بۆچی شیعرەکەت پلیقاندۆتەوە؟ "ئازادیش وتی کەواتە، لەبەرئەوەی وەڵامەکەی حازر نەبوو تەماشایەکی چەپ و ڕاستی خۆی کرد و دوایش وتی "ئێمە میللەتێکی زۆر کۆنین و وەکو شیعر واین و دوژمن ئەمانپلیقێنێتەوە بەڵێ مەبەستم ئەوەبوو "، باگەر نەیدەزانی کەچی بڵێت، هەموو گەریلاکان بزیزکەیان بوو، باگەر تەماشای شاهینی کرد و پێیووت "وەحشەت بەرە لێرە ئەوەیشی دەیزانین لەبیرمان دەچێتەوە بەخوا! "بە شاهینەوە چوار گەریلای تر لە ئەشکەوتەکە چوونە دەرەوە، دەچوون بۆهێنانی ئازوقە، ئازوقەکەیان لە نزیک کەمپەکەیان بوو، بەڵام لە شوێنێک حەشاریان دابوو کە ١٥ مەترێک لە چاڵیدابوو، ئەوەی لە کۆگاکەیان کردبوو پێکهاتبوو لە شەکر، ئارد، برنج، نۆک، نیسک و چای کەلەناو گوونی بچوکدا دایاننابوو، دەرکردنیان و هێناوەیان خۆیلەخۆیدا ئەشکەنجەبوو، لەبەرئەوەی کەسیشیان شوێنەکەیان پێ نەدەزانی شاهین کڵۆڵی دەستی وەحشەت بوو واتا ئازاد، لەناو هەموویاندا تەنها ئازادیان بۆ درووستکردنی ئەم حەشارگەیەیان خۆی ماندوو کردبوو، کە گەیشتنە لێژایەکە بینیان کە هەڤاڵانی کچان لەوێ چاوەڕوانیان دەکەن، هەر کە ئازاد ئەوانی بینی جۆشوخرۆشی دایگرت و بەختەوەری بە ڕووخساریەوە دەرکەوت.

سێ گەریلایان بەو پشتوێنەی ئازاد سەرێکی گرتبوو خۆیان شۆڕکردەوە ناو چاڵەکە، پالۆ لە دڵی خۆیدا دەیووت ئەمەیە کە دەڵێت بە حەبلی دەستی شێت مەچۆ ناو بیرەوە، ئێستا نۆبەی ئازاد بوو بچێتە خوارەوە، دەبوایە

کەسێک پشتوێنی بۆ ئازاد بگرتایە، هەڤاڵ ڕۆژینیان بە ئازادی وت "پشتوێنەکە بدە بە ئێمە تۆش بچۆ خوارەوە". ئازاد لەهەمبەر ئەم تەکلیفە جۆشوخرۆشی دایگرتەوە، قاچ و دەستی بەیەکەوە تێکەڵوپێکەڵ بوون، ئازاد چاوی لە ڕۆژین بڕی و بەو شێوەیە مایەوە، لەکەسێکی ئەبڵەق دەچوو، ڕۆژینیش شارەزای نیەتی ئازاد ببوو هەربۆیە دوو چاوی زەق پڕ لە توڕەی بڕیبۆوە ناو چاوەکانی ئازاد، ئازادکە بە وەحشەت ناوبانگی دەرکردبوو نەیدەزانی چیبکات، دەستی بە پشتوێنەکەوە گرتوو خۆی بۆناو چاڵەکە شۆڕکردەوە، بێگومان دوایەکەشی ئاشکرابوو کەچی دەهاتە ئاراوە، لەناکاو قیژەیەک کرا، کاتێک ڕۆژین بە پەلە ملی شۆڕکردەوە بۆ ناو چاڵەکە بینی کە ئازاد درێژ بووە، هەموویان بەم دیمەنە پڕ لە ئازارەی ئازاد پێدەکەنین، پێیانی دەووت کە ناتوانێت جوڵە بکات و ئێسکەکانی وەک ئارد هاڕاون، کە تەماشای قوڵایی چاڵەکەیان کرد مانەوەی ئازاد لە ژیاندا خۆیلەخۆیدا موعجیزە بوو، لەبەر کەوتنە خوارەوەی ئازاد بۆ ناو چاڵەکە مەسەلەی دەرهێنانی ئازوقەیان بۆکاتێکی تر هێشتەوە، دەبوایە ئازادیان لە پشتوێن ببەستایە و بیانهێنایەتە دەرەوە، سەرێکی پشتوێنەکەیان لەژێر باڵەکانی ئازاددا پێچایەوە و دەبوایە سەرەکەی تریشیان بۆسەرەوە بۆ هەڤاڵە کچەکان فڕێدایە، دەبوایە هەر هەڤاڵە کچەکان پشتوێنەکەیان بگرتایە و ئازادیان ڕابکێشایەتە سەرەوە، بەڵام ئازاد خۆی کردبوو بە نیوە مردوو، هەرکە دەجوڵایەوە هاواری لێبەرز دەبۆوە، ڕۆژین لەسەرەوە هاواریلێکردن و وتی "هەڤاڵ ئازاد گوێت لە دەنگمە؟" ئازادیش بەدەم نوزانەوە وتی "گوێم لێتە"، "ئێستا ڕاتدەکێشینە سەرەوە دانبەخۆتدا بگرە باشە؟!" ئازاد لەهەمبەر ئەم قسە شیرینەدا دڵی نەرم بۆوە پێیووت "باشە"، ڕۆژین و چەند گەریلایەکی تری کچ کەوتنە ڕاکێشانی پشتوێنەکە، کە گەیشتە لێوارەکە دەستی ئازادیان گرت، بەڵێ لەم کاتەدا ئازاد ڕۆحی وەبەرهاتەوە، هەروەکو ئەوەی کەمێک لەمەوبەر ئەو نەبوبێت کەوتووبێت و نەیووتوبێت ئێسەکەکانم وەک ئارد هاڕان، هاتە دەرەوە، تەماشای ڕۆژینی کرد و کەوتە تەکاندنی جلەکانی، شاهین لە خوارەوە لەوانی دەڕوانی، هاواری لێکردن و پێیووت "یەک دەبینینەوە"، کاتێک هەڤاڵانی کچ ڕۆشتن ئازاد بەتەنیا مایەوە، دوای ماوەیەک هەستی بە ئازاری لەشی کرد.

ئەو ڕۆژە كێشانەوەی ئازوقە هەتا ئێوارەی خایاند، دوای ئەوەی دونیا تاریک داهات لە ئەشكەوتی جنۆكەكان ئاهەنگێكی خنجیلانەیان سازدا، گۆرانیان دەوتەوە و سكێچیان نمایشكرد، كاتێک پالۆ لاسایی ئازادی كردەوە هەموویان لە پێكەنیندا خەریک بوو زراویان بتەقێت. شەش ڕۆژ بەسەر ئۆپەراسیۆنەكەدا تێپەڕی بوو، جگە لە دەركردنی چاودێر بۆ سەر گردەكان تەدبیرێكی تری جدیان نەگرتبووەبەر، دەستوبردیان دەكرد بۆئەوەی خولی پەروەردەیان زوو تەواو بێت، دەتوانرا بڵێت بۆ دەرچونیان لەكاتی بەهاردا هەموو ئامادەباشێكانیان ئەنجامدابوو، كاتژمێر هەشتی بەیانی هەموویان لە ئەشكەوتەكە كۆببونەوە، باگەر ئەو ڕێنماییانەی دەخوێندەوە كەلە سەركردایەتییانەوە هاتبوو، كاتێک هەموویان بێدەنگانە گوێیان بۆ باگەر ڕاگرتبوو كە سەرقاڵی خوێندنەوەی ڕێنماییەكان بوو لەناكاو دەنگی تەقینەوەیەكی گەورە هات، هەموویان چوونە دەرەوە، ئەوەی تەقیبۆوە تۆپی هاوان بوو، كەوتبووە سەر بەردەكانی سەرووی خوێندنگەكەیان.

جارێكی تر ئۆپەراسیۆنی سوپای تورک دەستی پێكردبۆوە، دوای ماوەیەكی كورت كۆپتەری كۆبرا و بارهەڵگر پەیدابوون، كۆپتەری ئاپاچی كە گەریلاكان ناویان نابوو تەنەكە دەستی كردبوو بە داگرتنی سەرباز، باگەر دركی بەوە كردبوو كە لەناوەختا ڕاوكرابوون، دەبوایە شتێكی بكردایە، ئەم ئۆپەراسیۆنە لەچاو ئەو ئۆپەراسیۆنەی شەش ڕۆژ لەمەوبەر دەستی پێكردبوو گەورە تر و مەترسیدار تر بوو، شوێنەكانی وەک سەرگردەكان و خوێندنگەكەیان و حەشارگەكانیان ئاشكرا ببوون و بەگوێرەی ئەوەش سوپای تورک ئۆپەراسیۆنیان ئەنجامدابوو.

لەناكاو باگەر پرسی "كێ چاودێری سەنگەرەكان دەكات؟ "شاهینیش وتی "عەلی موسا و سالّح و ئوزگور "، باگەریش وتی "با بەدران دوو گەریلا لەگەڵ خۆیدا بەرێت، با بچنە ناو ئەو بەردەڵانەی كە نزیكە لە قەد پاڵەكانی سەرگردەكە، تۆش لەگەڵ ١٠ هەڤاڵدا لە تەختاییەكەی سەر شەلالەكە بۆسە دابنێن و هەمووتان سەنگەرەكانی خۆتان بپارێزن "، عەلی موسا و هەڤاڵەكانی كەوتبوونە ناو جەرگەی ئۆپەراسیۆنەكەوە، هەموو شتێک لەماوەی چەند

خولەکێکدا هاتبوونە ئاراوە، دەنگی کۆپتەرەکان و هاواری ئەو سەربازانەی هێرشیان دەکردەسەر گردەکان عەلی موسای نیگەران کردبوو، ئەو سەنگەرەی ساڵح و نوزگور لێی بەرپرس بوون کەمێکی مابوو کە هێزی دوژمن چواردەوری بگرێت، لەلایەکی تریشەوە ئەو دوو گەریلایەی لەگەڵیاندا بوون بێ ئەزموون بوون، یەکەمجاریان بوو کە بەم شێوەیە بکەونە ناو چەمبەرێکی ئاواوە و ڕووبەرووی شەڕ ببنەوە.

عەلی موسا وتی "ئەگەر بەم شێوەیە بەسەر ئەم گردەوە بمێنینەوە هەمووومان دەکوژرێین! "دەیویست بەم قسەیە ئاستی کاردانەوەی دوو هەڤاڵەکەی تەکێوەی بزانێت، دەیویست بزانێت کە لە چاوەکانیاندا ترس هەیە یان نا، نوزگور بە جۆشێکەوە وتی "بەهەر شێوەیەک بێت دەبێت گردەکە بپارێزین "، هەرچەندە لێوەکانی هەڵدەلەرزین و زمانی تەتەڵەی دەکرد، بەڵام بەم قسانەی ئەوە سەلماند کە لەبارەی هەڵوێستی خۆیەوە زۆر بە بڕیارە، ئەم وەڵامە بە دڵی عەلی موسا نەبوو، عەلی موسا ماوەیەک بێدەنگ مایەوە و بیری دەکردەوە، عەلی موسا لە دڵی خۆیدا دەیووت ئەوەبۆچی ساڵح و نوزگور وەکو من بیر ناکەنەوە؟

هەتا دەهات سەربازەکان لێیان نزیک دەبوونەوە، لەوانەبوو کەمێکی تر شەڕ لەنێوانیان بێتە ئاراوە، ئەو سەربازانەی لە خوارووی کەمپەکەوە دەهاتن نیشانەی ئەوەبوو کە شەڕ دەستی پێکردووە، عەلی موسا بەتەواوەتی نیگەران ببوو، ئەندێشە و بیرکردنەوەکانی تەمومژاوی بوون، هیچی نەدەبینی و نەیدەتوانی تەندرووستانە بیربکاتەوە، هەروەک ئەوە وابوو کە یەکەمجاری بێت لەناو ئەم جۆرە هەستانە بژێت.

کۆپتەرەکۆبراکان بە چواردەوری شەلالەکەوە دەخولانەوە و دەیانویست هەدەفەکانیان دەستنیشان بکەن و تادەهات شەڕ و پێکدادان لەهەموو لایەکەوە دژوارتر دەبوو، ماوەیەک کۆپتەرەکان لە چاوان دیارنەمان، بەڵام پەیدابونەوە و هەرچی موشەکیان پێوەبوو بەناوچەکەوەیان نا، تەختاییەکەی سەر شەلالەکە وەک دۆزەخی لێهاتبوو، تەقینەوە لەدوای تەقینەوە دەهاتە ئاراوە، عەلی موسا وەک ئەوەی زۆر دڵنیابێت لەوەی کە کەس لەو سەنگەرە

ڕزگاری نەبووە لەناکاو وتی "هەموو هەڤاڵانی ئەوێ کوژران!"ئەم قسەیەشی بە دەنگێکی بەرز هێنایە زمان. شتێکی ڕوون و ئاشکرابوو کە عەلی موسا دڵی بۆ ئەو شوێنە لێنەدەدا کە بۆردۆمان کرابوو هەروەها لە خەمی ئەوەشدا نەبوو کەکێ لەو سەنگەرانە شەهید بووە. دەردی ئەو ئەوەبوو کە نۆبە دێتە سەر سەنگەرەکەی ئەمان و بۆردۆمان دەکرێن. ماوەیەک دووربینەکەی هیچ لە چاوی دانەگرت. ئایا کەس لە گەریلاکانی ئەو سەنگەرانە ڕزگاریان ببوو؟ ئەوکاتەی کۆپتەرەکان موشەکەکانیان لەخۆیان خاڵی دەکردەوە و ئەوێیان جێدەهێشت عەلی موسا بینی کە گەریلاکان لە سەنگەرەکانی خۆیان دەرچوون و نزیکەی ٢٠ مەترێک پاشەکشێیان کرد.

کۆپتەرەکان بەردەوام لە سەر گردە بەرزەکان و لووتکەی شاخەکان سەربازیان دادەگرت. ئەوکاتەی سەربازەکانیان لەسەر گردەکانی بەردەمیان دادەگیرا پاشان پەیتا، پەیتا دەهاتنە پێشەوە. گرووپێک لە سەرباز دەهاتنە پێشەوە و لە شوێنێکدا خۆیان درێژ دەکرد و سەنگەریان دەگرت پاشان لەدوایاندا گرووپێکی تر دەهات و لێیان تێدەپەڕی و لەپێشیاندا خۆیان درێژ دەکرد و سەنگەریان دەگرت و بانگی ئەوانی تریان دەکرد. بەم شێوەیە پەیتا، پەیتا دەهاتنە پێشەوە.

دەمەو نیوەڕۆ ئەو سەرگردەی عەلی موسا گرتبووی چواردەوری گیرا. ئیتر وایان لێهاتبوو کە نەیاندەتوانی سەریشیان دەربهێنن. ئەو فیشەکانەی پێیانەوە دەنان لەبەردەکانی بەردەمیانی دەدا و بە چەپ و ڕاست و بان سەریانەوە گیفەی دەکرد. تەنها ئەو شتەی کە بۆ ئەوان سوود بەخش بوو بەرزی گەردەکەیان بوو. ئەگەر سەبریان بگرتایە و بە سەرنج و وریایانەوە شەڕیان بکردایە دەیانتوانی هەتا ئێوارە بەرگری بکەن. بەڵام عەلی موسا بەو شێوەیە بیری نەدەکردەوە. ئەو ڕزگار بوونیانی بە شتێکی مەحاڵ ناوزەند دەکرد. ئەو فیشەکانەی دەیاندا بە بەردەکانی بەردەمیان عەلی موسایان تاساندبوو. چاوەکانی زەق ببونەوە و ئارەق نێوچەوانی وشک ببونەوە و ئەو ترسەی کە جەرگی بڕی بوو وایلێکرد بوو کە هەڵبلەرزێ. عەلی موسا دەیووت "لێرە دەمرین!"باسکردنی مردن لەلایەن عەلی موساوە خەیاڵی خۆڕاگری دوو

هەڤاڵەکەی مایەپووچ کردبۆوە، نەیاندەزانی کە چی پێبلێن، ترسەکانی ناو چاوەکانی عەلی موسا زۆر سەرنج ڕاکێشەر و ترسناکیش بوو.

ئوزگوریان پرسی "چیمان پێدەکرێت؟ "عەلی موسا لەهەمبەر ئەم پرسیارەدا واق سوڕمابوو، ئوزگور دووبارە پرسیەوە "ئەگەر دەتوانین شتێک بکەین پێمان بڵێ! "ئەمجارەیان عەلی موسا پرسی "بەڕای ئێوە بەرگری بکەین؟ "سالح وتی "بەڵێ "، عەلی موسا تەماشای چەکەکەی خۆی و ئوزگور و سالحی کرد، پاشان وتی "زۆر باشە، ئێوە ئەولایە بپارێزن منیش ئەملا "، نیەتی عەلی موسا ئاشکرا نەبوو، ئەوەی پێوە دیاربوو کە مێشکی جەنجاڵ ببوو، مەحاڵ بوو کە بزانرێت پیلانی چی هەیە! دوای ئەوەی جارێکی تر لە مێشکی خۆی کەوتەوە حیساب کردن ئەمجارەیان ڕووی لە سالح کرد، عەلی موسا دەیزانی کە سالح بیر لەچی دەکاتەوە، بەڵام نەیدەزانی کە ئایا ڕێی مردنی هەڵبژاردووە یان بەرخودان، مەسەلەی مردن بەلای عەلی موساوە شتێکی دوور بوو، لە دڵیخۆیدا دەیووت "هەموومان دەمرین و پارچە پارچە دەبین! "ئەو پێیوابوو کە خوێنی هەموویان لەم سەنگەرەدا دەڕێژرێت و هەتا پارچە بوونی جەستەی خۆیانیانی وەبیر بهاتایەتەوە خەریک بوو شێت دەبوو، تەنانەت لەخۆیشی دەپرسی ئەرێ ئێمە بۆچی تاکو ئێستا لەم سەنگەرە ماوینەتەوە؟ ئەمەی بە بێ مانا دەزانی.

عەلی موسا تەماشای سالحی کرد، پاشان لە ئوزگوری ڕوانی و تەماشای لە قژە چڵکن و شەرواڵە کوون بووەکانیانی کرد کەلە ئاکامی ئەو فیشەکانە هاتبوونە ئاراوە کە دەیاندا لە بەردەکان و پریشکەکانی جلەکانیانی کوون دەکرد، بەشێوەیەک لێیانی دەڕوانی وەک ئەوە وابوو کە یەکەمجاری بێت بیان بینێت، عەلی موسا وتی ئوزگور، ئوزگوریش ئاوڕێکی بۆدایەوە، بەڵام ئوزگور زیاتر چاوی بڕیبوە سالح و وەڵامی عەلی موسای نەدایەوە، بەڵام عەلی موسا بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت هەر لە ئوزگوری دەڕوانی، کاتێک ئوزگور بینی کە عەلی موسا هیچ ناڵێت جارێکی تر ڕووی خۆی بەلای گردەکەی پێشەوە وەرگێڕا.

عەلی موسا ڕووی چەکەکەی کردە ئوزگور، ویستی تەقە بکات، بەڵام سالح هەستی بەمە کرد، سالح بە شڵەژاویەوە هاوارێکی کرد و پێیووت "ئەوە

چی دەکەیت؟! ” عەلی موسا هەڵوێستەیەکی کرد و ڕووی چەکەکەی وەرگێڕا، ئوزگوریش هەستی بەمە کرد و ڕووی خۆی لە عەلی موسا کرد، لەناکاو عەلی موسا وتی ”من دەڕۆم، نامەوێت بمرم! ”قوڕگی پڕ لە گریان بوو، ئوزگوریش وتی ”بۆکوێ دەچێت پێتوایە دوژمن وازت لێدەهێنن؟ ”ساڵحیش وتی ”ئەگەر بیر لە ئێمە ناکەیتەوە هەرهیچ نەبێت بیر لە هەڤاڵان بکەرەوە ”، عەلی موساش پێیانیوت ”ئیتر هەموو شتێک کۆتایی پێهات! ”عەلی موسا پاڵی بە ساڵحەوە نا دوایش لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت، ڕووی چەکەکەی کردە ساڵح و ئوزگور، ساڵح ویستی پەلەماری بدات، لەناکاو عەلی موسا تەقەی کرد، فیشەک بەر سنگی ئوزگور کەوت و ئاخێکی کرد، شوێنی فیشەکەکەی سەر سنگی ئوزگور دوکەڵێکی شینباوی لێبەرز بۆوە و پاشانیش خوێن لەسەر سنگی ڕژا، ساڵح سەرسام ببوو، بەتوڕەبونێکەوە لە عەلی موسای دەڕوانی، ساڵح دەیزانی کە هیچی لەدەست نایەت! ئەمجارەیان ڕووی چەکەکەی لەو کردبوو، عەلی موسا پێیووت ”ئەگەر لەگەڵم بێیت ناتکوژم! ”ساڵح تەماشایەکی ئوزگوری کرد، ئوزگور هێشتا نوزەی دەهات، سەری بەبەردەکانی سەنگەرەکەوە نابوو، زۆر بە زەحمەتی هەناسەی دەدا، عەلی موسا پێیووتەوە ”بۆدواجار لێت دەپرسمەوە دێیت یان نا؟ ”ساڵح وەڵامی نەدەدایەوە هەر تەماشای ئوزگوری دەکرد، عەلی موسا کەوتەوە تەقە کردن، فیشەکی بە ساڵحیشەوە نا، بۆنی باروت لە سەنگەرەکەیانەوە دەهات، عەلی موسا چەکی هەردووکیانی هەڵگرتەوە، لە سەنگەرەکە دەرچوو، هەردوو دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی، بۆئەوەی سەربازەکان گوێیان لێبێت پڕ بە دەمی هاواریکرد، سەربازەکان گوێیان لەدەنگی بۆو هەربۆیە تەقەیان ڕاگرت، عەلی موسا هاواریکرد ”خۆم ڕادەست دەکەم ”، دەنگێک هاوارلێکرد ”دەستت بخە پشت سەرت ”، عەلی موساش ئەوەی کرد کە داوایان لێکردبوو، سەربازێک وتی ”نزیک بەرەوە ”، عەلی موسا لێیان نزیک بۆوە، کەمێک چووە پێشیانەوە، کانییەکی بچووک لە نێوانیاندا بوو، دوایش بەو بەرزاییە هەڵگژا کە سەربازەکانی لێبوون، کە لێیان نزیک بۆوە سەربازەکان لوولەی تفەنگەکەیان لەو کردبوو، پێیان وت کە ڕاوەستێت، عەلی موسا لە شوێنەکەی خۆی ڕاوەستا، یەکێک لە سەربازەکان

پێیووت "چەکەکانت لەزەوی دانێ"، داینا، خۆت درێژکە، خۆی درێژ کرد، بە خشکە وەرە، بەخشکە چوو، خێراتر بە، خێراتر بوو، لەناکامدا سێ سەرباز خۆیان هەڵدایە سەر عەلی موسا.

کە ئێوارە داهات هەموو گەریلاکان لە شوێنی خوێندنگەکەیان کۆبونەوە، لە تەختایەکەی سەر شەلالەکە و لە قەدپاڵی هەورازەکانی گردەکان گەریلاکان نەیانهێشتبوو کە هێزی دوژمن بێنە پێشەوە، لەبەرئەوەی ئێوارە داهاتبوو توانرا ڕێگری لە پیلانی چوونە خوارەوە بۆ دۆڵەکانی زێیەکە بکرێت، دەبوایە چاوەڕێی سبەی بەیانیان بکردایە، باگەر فەرماندەکانی کۆکردەوە، ئەو زانیاریانەی بە درێژایی ڕۆژ لە ڕێگەی بێتەل و چاوساغەکانیانەوە بەدەست هێنرابوون ئێستا بەشێوەیەکی ڕوبەڕوو باگەر گوێبیستی دەبوو، شاهین هەموو شتێکی بەیەک هەناسە بۆباسکرد، شاهین وتی "سەربازی دوژمن بە کۆپتەر دابەزینە سەر بەرزایەکانی گوندی ماران، سەربازەکانی بارەگای ناکرەکییان هێناوە و لەسەر خاڵی چاودێری بۆزان جێگیریان کردوون، هەردوو ڕێی زێیەکەیان گرتووە، سەربازیان بۆلای چەمیزگەزەک هێناوە، گردە هەرە بەرزەکانی زێیەکە بەدەستی ئەوانەوەیە، دەیانەوێت بەتەواوەتی هەموو سەر گرد و قەدپاڵەکان کۆنترۆڵ بکەن و هەوڵدەدەن درێژایی زێیەکە بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە، لەڕێگەی ئەو جیهازە لێزەرەی لە بۆزان جێگیریان کردووە دەیانەوێت زۆر شوێنی زێیەکە ببینن هەروەها لەسەر زۆر گردیش چەکی گرانی وەک دۆشکە و هاوانیان داناوە، بەکورتێکەی دەیانەوێت هەموو شوێنەکانی جموجۆڵمان بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە".

بارانیان پرسی:

"لەو شەڕانەی هاتنە ئاراوە چەند شەهیدمان هەیە؟"

"بەهۆی بۆردۆمانەکانی کۆپتەرەکانەوە هەڤاڵان یوسف و ڕۆژدا و بەنگی و ڕۆژبین و نێچیرڤان شەهید بوون".

"ئەی باشە تاکو ئێستا هێزی دوژمن هەتا کوێ هاتوون؟"

"لەسەرووی قەدپاڵەکانی بەرزایی و چیاکانی ئەم ناوچەیەوەن، بەتایبەتی سەر گردەکانیان گرتووە".

"ئەی کێ لەسەر ئەو گردە چاودێر بوو؟»

"عەلی موسا و ساڵح و ئوزگور".

باگەریش وتی:

"مادام گردەکە کەوتۆتە ژێر دەستی دوژمن کەواتە ئەو هەڤاڵانە شەهید بوونە".

سەرەتا شاهین نەیویست وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، بەڵام دوایی بەناچاری وتی "لەوێ جگە لە هاتنە ئاراوەی دەنگی چەند تەقەیەک هیچی تر نەبیستراوە!"

"مەبەستت چییە؟"

"لەوانەیە شەهید بوبێتن، لەوانەشە شتی تر هاتبێتە ئاراوە!"

هەموویان لە شاهینیان دەڕوانی، سیمای هەموویان گۆڕا، لەناکاو پالۆ وتی:

"جارێکی تر ئێمە دەچینەوە ئەشکەوتەکەی پێشوتر؟!"

باگەر نە بە بەڵێ و نە بە نەخێر وەڵامی ئەم پرسیارەی نەدایەوە، دوای ئەوەی ڕاوبۆچوونی هەموویان وەرگیرا پاشان بەڵێیان بۆ پێشنیارەکەی پالۆ کرد، پالۆ بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت پێشنیارێکی جدی کردبوو، هەمووشیانی والێکرد کە ڕازی بن، بەخێرایی هەرچەندەی پێیان کرا ئازوقەیان هەڵگرت و خۆیان ئامادەکرد، کەس نەیدەزانی کە بۆکوێ دەچن، ئەو فەرماندارانەی بەشداری ئەم کۆبونەوەیە بوون لەم بارەیەوە هیچیان بەکەس نەدەوت.

ئەوکاتەی دەیانویست بکەونە ڕێ لەناکاو بەرچەم وتی کە ساریا و ئاریا ونبوونە، هەربۆیە ناچارمان کە ماوەیەکی تر چاوەڕوانی بکەن، هەرچەندە بەرچەم و پالۆ و شاهین بەدوایاندا گەڕان، بەڵام نەیانیان دۆزییەوە، لەهەمانکاتدا نەیاندەتوانی لەوە زیاتر چاوەڕێ بکەن، شاهین کەوتبووە پێشیان و ئەوانیش بەدوای شاهینەوە بوون.

٤

ئاریا لەناو تاریکی شەودا لە ئەستێرەکانی دەڕوانی هەورەکانی ئاسمانیش جارناجارێک ساریایان لەم دیمەنە جوانانە نامەحرووم دەکرد، ئاریا بە ساریای وت "نیەتێک لەدڵی خۆتدا بگرە"، ساریا تەماشای ئاسمانی کرد، ئەستێرەکان لەگەڵ هەورەکاندا چاوشارکێیان دەکرد، ساریا دەیویست ئەگریسێکان لەخۆی بەدوور بگرێت هەربۆیە لەناکاو بە ئاریای وت "نیەتم گرت"، ساریا دەیزانی ئەگەر شتێکی بهێنایەتە زمان غەماوی بێت لەوانەبوو کە ئاریای پێ دڵتەنگ بێت، هەربۆیە هەستی دەکرد کە پێویستە لەهەمبەر ئاریا خۆی بە کەیف خۆش و بەختەوەر نیشان بدات، ئەمەش وایلێکردبوو کە شتە ناخۆشەکانی ناو ناخی بۆ ئاریا نەدرکێنێت.

هەردووکیان لەو سەنگەرەدا بوون کەلە ئاکامی چاڵی تۆپێک درووست ببوو، ساریا دەیزانی کە هەڤاڵانی لە بیریان کردوون، بەڵام نەیدەویست ئەمە بە شێوەیەکی ئاشکرا لەلای ئاریا بدرکێنێت، هێشتا ماوەی مانگێک نەبوو ببوون بە گەریلا، سەرەڕای ئەمەش ڕوبەڕووی ڕووداوێکی زۆر ببوونەوە، هەموو ئەمانەش ئەو شتانە نەبوون کەببنە مایەی زیادبوونی چاونەترسیان، وەک ئەوەوابوو کە یەکێک تاقیان بکاتەوە و دەیویست بزانێت کە هەردووکیان لەحاڵەتی ناخۆشیدا چۆن هەڵوێستێک نیشان دەدەن.

ئاریا بڕیاری خۆی دابوو، نەیدەهێشت هەستی پێبکرێت کە نیگەرانە، ساریا دەیزانی کە ئاریا لەژێر چاوەوە چاودێری دەکات و دەیەوێت کاردانەوەی بزانێت، لەڕاستیشدا کەسایەتی ئاریایان هەروابوو، مەخابن هەتا کات بەسەربچوایە و ئەم ڕەوشەیان بەم شێوەیە درێژەی بخاندایە شێوازی هەست و بیروبۆچون و شێوازی ڕۆحیان دەگۆڕا، لەئێستاشەوە دەستی پێکردبوو، ساریا حەسادەتی بە ئاریا دەبرد، کاتێک بیری لەوە دەکردەوە کە خۆی خەریکە لە بێزاریدا دڵی بتەقێت چۆن ئاریا دەتوانێت ئەوەندە لەسەرخۆبێت، ساریا بیری لەوە دەکردەوە کە ئاریا چۆن دەتوانێت شەڕ لەگەڵ ناخ و سیما هەڵخەڵەتێنەرەکەی خۆی بکات، ئەوەی ڕاستی بێت زاڵ بوونی ئاریا بەسەر هەستوو ئەستەکانیدا لە غیرەییەوە نەبوو، لە دڵی خۆیدا دەیووت "خۆزگە

منیش دەمتوانی وابکەم! "بەڵام ترس سودی بۆکێ هەیە؟ لەلایەکی تریشەوە هێنانە زمانی ترس و تۆقین سودی نەبوو، هەربۆیە ناچارما کەلەخۆی بپرسێت کە ئایا دەبێت چۆن ڕەفتار بکات؟ وادیار بوو ئەندێشە و بیرکردنەوەکانیان بە ئاسانی دەستبەرداریان نابێت.

بەیانی زوو پێش ئەوەی کەمپەکە جێبهێڵن چاویان بە هەموو سەنگەرەکان گێڕا، نزیکەی ٢٤ کاتژمێر تێپەڕی بوو، بەڵام کەس سۆراغی نەکردبوون، کەمپەکە کش و مات بوو، ئەوانیش نەیاندەزانی کە ئەم بێدەنگییە چەنێک دەخایەنێت، پێشوتر بۆیان باسکرابوو کە لەحاڵەتی هاتنە ئاراوەی مەترسیدا خۆیان بگەهێننە ئەم سەنگەرە، ئەوان بەتەواوەتی فەرمانی هەڤاڵ بێستایان جێبەجێ دەکرد، لە ماوەی ٢٠ کاتژمێر هەموو ڕووداوەکانی ئێرەیان بەچاوی خۆیان بینی بێگومان لەگەڵ ئەو دەنگە نەخوازیارانەی کە دەهات بە گوێیاندا، ئەوان لەناو ئەم سەنگەرەی خۆیانەوە تەماشای سوڕانەوە و بۆردۆمانەکانی کۆپتەرەکانیان کردبوو هەروەها هەموو تەقینەوەی ئەو تۆپانەشیان بینی بوو کەلە دەورو بەریانەوە دەتەقینەوە و دەنگی ئەو فیشەکانەی بەلایاندا گیڤەیان دەکرد و زۆر ڕووداوی ترسناکی تریش.

ئاریا زۆر هێمنانە دانیشتبوو، سارياشیان جارناجارێک سەری لە سەنگەرەکە بەرز دەکردەوە و تەماشای چواردەوری خۆیانی دەکرد، هەرجارێک سەری هەڵدەبڕی دڵی خورپەیەکی دەکرد کەلەوانەبوو ڕوبەڕووی شتێکی ناخۆش و نەخوازیار بێتەوە لەهەمانکاتیشدا لەوانەبوو ڕوبەڕووی هاتنی هەڤاڵانی ببوایەتەوە کە ئەمەشیان تاکە خواستیان بوو، ساریا لەناو دەریای مەراقدا بوو، بەڵام ئاریا مێش میوانی نەبوو تەنانەت کە ساریا سەری هەڵدەبڕی لێشی نەدەپرسی کە ئایا هیچی بینیوە یان نا.

ساریا وتی "کەس دیار نییە کەمپ بەتاڵیە! "ئاریاش وتی "لەوانەیە هەڤاڵان لە کەمپەکە جیابوبێتنەوە "، ساریا بە پێکەنینێکەوە وەڵامی ئەم قسەیەی ئاریای دایەوە و پێیووت "هیچ مەراقت نەبێت هەموو هەڤاڵان وەک ئێمە لەناو سەنگەردان "، پاشان ئاریا لێی پرسی "ئەی ئەگەر ڕۆیشتبێتن؟! " "ئەگەر ڕۆیشتبێتن بێشک ئێمەیان ئاگەدار دەکردەوە و بانگیان دەکردین و بۆجی نازانن

که لێرەین؟ "ئاریا وەڵامی ئەم پرسیارەی نەدایەوە، ئەویش بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە، پاشان وتی "ئەی باشە کەس لە هەڤاڵان شەهید بوونە؟ "ساریاش وەڵامی ئەم پرسیارەی نەدایەوە، ئەمە پرسیارێک بوو کە وەڵامەکەی جەرگ بڕبوو هەروەها لەم پرسیارەدا هەستیان بە ئازار دەکرد، سەرەڕای ئەوەی ئەندێشەیان زیادی کردبوو، بەڵام بیریان لە شتی جوان دەکردەوە بۆ ئەوەی خەندەی سەرلێویان درێژە بخایەنێت، دەبوایە ئەم تەمومژە تاریکەی سەر دڵیان بڕەوێتەوە، بەڵام ئایا چۆن؟ ساریا بیری لەوە کردەوە کە ئەگەر کەمێک باسی ڕۆژانی کۆمێدی جارانی خۆیان بکەن باشتر دەبێت، دەم بە خەندەوە تەماشایەکی ئاریای کرد دوایش قاقایەکی کرد و ئاریا پرسی:

"بەچی پێدەکەنیت؟"

"بە هیچ، بەڵام شتێک هات بە ئەقڵمدا!"

ئاریا تەماشای ئەملاو ئەولای کرد و سوورنەبوو لەسەر ئەوەی کە پێی دووبارە بکاتەوە، ساریا ئەم هەڵوێستەی ئاریای پێ سەیربوو کە پرسیاری نەکردەوە، ئەویش وەک ئاریا خۆی کەڕکرد، زۆر بێزار ببوون لەم ڕەوشە، حەوسەڵەیان نەمابوو، هەردووکیان جارناجارێک ئاخێک یان ئۆفێکیان دەکرد و هەناسەی قوڵیان هەڵدەکێشا، ئاریا تەماشای ناو جانتاکەی کرد، وەک ئەوەی بەدوای شتێکدا بگەڕێت دەستی بەناو جانتاکەیدا وەرگێڕا، دوایش وتی "بزانم دەزانیت چی لە ناو جانتاکەمدا هەیە؟" "چی هەیە؟" "ئەو ڕۆمانەی هەڤاڵ بێستا داپێیمان کەمێکی بخوێنینەوە؟ "ساریا لەم بارەیەوە هیچ تەرەدودێکی نەکرد، سەرەتای ڕۆمانەکە بەم شێوەیە بوو (ئێوە ناوی لێبنێن!)، کە لاپەڕەیەکی تری هەڵدایەوە نوسرابوو (بەشی یەکەم)، ساریا بە کپییەک کەوتە خوێندنەوەی بەشی یەکەمی ڕۆمانەکە کە بەم شێوەیە نوسرابوو:

**( زستانی ساڵی ١٩٩٦ بۆ ئێمە خۆیلەخۆیدا کارەسات بوو، هەموو ڕۆژێکی دەردەسەری بوو، ئەوانەی شارەزای چیاکانی دەرسیمن دەزانن کە مەبەستم چییە، شەڕکردن لەسەر ئەم چیایانە کارێکی ئاسان نییە، لە هەموو چیاکان و زێو و چەمەکاندا قەدەر و ئازاری سەد ساڵە لەگەڵ ئێمەدا ژیان دەکەن، لەسەر هەر بستە خاکێکیدا نزای مردۆکانی پێوەیە، هەموو**

بونەوەرەکانی ئەم خاکە بە هەموو شێوازێکیانەوە گەواهی ئەم مردنانە دەدەن، سەرەڕای هەموو جوانێکەیشی تاکو ئێستاش دەرسیم بۆنی خوێنی لێدێت، مەخابن لەوەدەچێت کە ئەم ڕەوشە تاکو ماوەیەکی زۆری تریش درێژە بخایەنێت.

لەسەرەتای ساڵی ۱۹۹٦ دا دوژمن دەیویست ئەم مێژووە بەسەر ئێمەشدا دووبارە بکاتەوە، ڕێگەیەکی زۆر سەخت و دژوار بۆ ئێمەش دەستی پێکرد، ۱۲ گەریلای کچ و ٤٥ گەریلای کوڕیش، بەگشتی هێزەکەمان ٥٧ گەریلا بوو، کەوتینە ڕێ، فەرماندەکەمان ناوی قارەمان بوو، ئێمە نەماندەزانی کەبۆچی لە ڕۆژێکی وا سەختی زستاندا کەمپەکەمان جێهێشت، لەم بارەیەوە سەرگوزەشتەیەکی زۆر هەیە، بەڵام پێیان وتین بۆ باری ئاسایشی زیاتری خۆمان دەبێت کەمپەکە جێبهێڵین، لەکۆتایی ڕێکردنێکی زۆردا پەنامان برد بۆ چیایەکی بە هەیبەت کە ناوی بۆکر بوو لێرە کەمپمان درووست کرد، ڕاستە بەهەیبەت بوو ئەم چیایە، بەڵام ئەوەندەی دەربەندی عەلی بەهەیبەت نەبوو، لەوانەبوو بۆ گەیشتنی دوژمن ئێرە ئاسان بوو بێت، بەڵام گاپێڵ و زێیەکانی و بەرزایەکانی بۆخۆ پاراستنمان زۆر گونجاو بوو، ئەم چیایە گرێدراوی زنجیرە چیاکانی تربوو، تادەهات ئەم زنجیرە چیایانە درێژ دەبوونە، لایەکی ناوی مونزوورە کە ڕەنگەکەی وەک شیر وایە لایەکی تریشی ڕووباری ئاڤگەسۆر بوو، پێدەشتەکانی سنوریشی گردەکانی زیارەت بوو، ئەم چیایە لەدوای چیای مێرجان گەورەترین چیا بوو، ئاوی مونزوور وەکو گوێزان ئەم چیایانەی لەیەک دابڕی بوو، ئاوی زێیەکەی لەئاکامی توانەوەی بەفری قەد پاڵەکانی چیای مونزوور و ئاوە قوڕاوێکانی قەد پاڵەکانەوە سەرچاوەی دەگرت، کاتێک ئاوەکان لە زێیەکە کۆدەبونەوە ڕەنگیان وەک شیری لێدەهات، ئەو ئاوەی بەدەم کەفەوە دەهاتنە خوارەوە دەچوونە ناو حەوزێکی گەورەوە، ئاوی ئەم حەوزە گەورەیەش بەسەر ٤٠ لقدا دابەش دەبوون، دوایش وەک ڕووبارێکی لێدێت پاشانیش بەرەو زێی نۆڤەجک مل دەنێن، هەتا دێتە ڕووباری موراد تێکەڵی زۆر ئاوی تری ڕێگەوبانەکان دەبێت، ئەو ئاوانەی لە دەربەندەکانی مێرجان و خاپور هەروەها ئەو ئاوانەی

لە چیاکانی پولومور و نەزمییە سەرچاوە دەگرن لەگەڵ خۆیاندا زێیەکانی هەرچک و پاهدەر تێکەڵ بەخۆیان دەکەن و لەئاکامدا خۆی تێکەڵی ئاوی پەری دەکات، دوای ئەوەی دەبێت بە ڕووبار خۆی تێکەڵی ئاوی موراد دەکاتەوە.

چیرۆکێکی زۆر لەبارەی ڕووباری مونزوورەوە دەوترێتەوە، سوێندی تەبایی و ئاشتەوایی و برایەتی هەر لەم شوێنە پیرۆزە دووپات دەبێتەوە و لێرەش بناغەکەی دادەنرێت هەروەها لێرەش خەڵکی خۆیان لە گوناح پاکدەکەنەوە، دوژمنداری لێرە کۆتایی پێدەهێنرێت، تەنانەت هەر لەسەر ئەم ئاوەش سەید ڕەزا دەرسیمی لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی تردا ئاشتبونەتەوە و ئیمزای تەبایی و برایەتی نێوانیان کردووە، دەوترێت دوای خواردنەوەی ئاوی مونزوور بەڵێنیان بەیەکداوە کە هاوپەیمانی یەکتر بن و بەیەکەیشەوە شەڕ بکەن، تاکو ئێستاش هۆی ئەم ناوە واتا ناوی مونزوور لەگەنگەشەدایە، بەگوێرەی بیروبۆچونێک دەوترێت ناوەکەی لە شاخەکەوە وەرگرتووە، کەسانێکی تریش دەڵێن ناوەکەی لە شوانێکەوە وەرگرتووە، بەگوێرەی ئەم چیرۆکە بێت پیاوێکی جەنگاوەری کورد هەبووە بەناوی جەمشید، لەکاتی شەڕێکدا ئارەزووی خواردنی حەلوای دەستی ژنەکەی دەکات، ئەم داخوازییەی جەمشید لەهەمانکاتدا دەچێتە خەوی مونزووری شوانەوە، مونزوور ئەم خەوە بۆ ژنەکەی جەمشید ئەگێڕێتەوە و داوای لێدەکات کە حەلوا درووست بکات و پێی دەڵێت کە حەلواکە نەبات بۆ جەمشید، ژنەکەی جەمشید پێیوایە کە مونزوور حەڵواکەی بۆخۆیەتی، بەڵام سەرەڕای ئەمەش درووستی دەکات و دەیداتێ، مونزووری شوان حەڵواکەی لێدەستێنێت و ئێوارە دەگەڕێتەوە، مونزوور حەلواکەی بردبوو، ژنەکە داوای قاپە خاڵیەکەی لێدەکاتەوە، بەڵام مونزووری شوان دەڵێت کە قاپەکە لەلای جەمشیدە، دوای ماوەیەکی زۆر جەمشید ئاغا لە شەڕ دەگەڕێتەوە، عەشیرەتەکەی بە دەهۆڵ و زوڕناوە پێشوازی لێدەکەن، بەڵام جەمشید ئاغا دەڵێت ئەوەی کە دەبێت ئەم پێشوازییە شاهانەی لێبکرێت مونزووری شوانە کە خاوەن موعجیزەیە، جەمشید ئاغا قاپەکە

نیشانی خەڵکەکە دەدات. لەدوای ئەم قسەیەی جەمشید ئاغا خەڵکەکە دەکەونە گیانەڵا بۆ بینینی مونزووری شوان. مونزووریش کە دەبینێت خەڵکانێکی زۆر بە ڕاکردنەوە بەرەو ئەم دێن ئەترسێت و هەڵدێت. مەنجەڵە پڕ شیرەکەی دەستی مونزووره شوان لەکاتی ڕاکردنەکەی دەڕژێت و ئەو شوێنەی شیرەکەی لێدەڕیژرێت ئاوی لێ فیشکە دەکات. لە ٤٠ شوێنی جیاوازەوە ئاو فشکە دەکات. لەو ڕۆژەوە تاکو ئێستا بەو ئاوە دەڵێن کە چل چاوە ناوی مونزووره. بێگومان ئەمە چیرۆکێکی ئەفسانەییە. مەسەلەیەکی تری ئەوەی کە خەڵکی ئەم ناوچەیە کە ئەم ئاوە بە پیرۆز دەزانن ئەویش ئەوەیە کە ئەم ئاوە لە شیری دایک دەچێت.

ئێمە لە چیای بۆکر جێگیر بووین. ئێرە دەکەوێتە نزیک ئەم ئاوە پیرۆزەوە. سەری چیاکە ڕووتەڵەیە. دارستانەکەی لە بنارەکەیەوە دەست پێدەکات هەتا نزیک لووتکەکەی. ئەم تەختاییەی سەر چیاکە خەڵکی وەک زۆزانیش بەکاری دەهێنن و لەسەری دەمێننەوە. دوای ئەوەی شەڕی تێکۆشانی ئازادی هاتە ئاراوە بە ڕێبەرایەتی پەکەکە کە شەڕ و پێکدادان چڕ بۆوە ئیتر دەوڵەت هاتنی خەڵکی بۆ ئێرە قەدەغە کرد. قۆڵێکی چیای بۆکر بۆ ئاڤەجک و ئاڤگەسۆر درێژ دەبێتەوە. بەشەکەی لای ئاڤگەسۆر کەبە قەڵای بەرخودانی شێخ سەعید ناودەبرێت بەردەڵانە. ئەم شوێنە بەدرێژایی مێژوو مەڵبەندی بەرخودان بووە. لەبەرئەوەی ئەم شوێنە زۆر بەرزە و چەتوونە و زاڵە بەسەر ناوچەکانی تر بۆیە پێی دەڵێن قەڵا. بەڵام ئێمە کەمپەکەی خۆمان لە دارستانێکی بەرفراوانی لێژایەکەی ئۆڤاجیکی سەر بە چیای بۆکر درووست کردبوو. لە خوارەوە هەڵگژان بۆلای کەمپەکە ٢ یان ٣ کاتژمێرێکی دەویست. چەمە بچوکەکانی قەد پاڵەکانی دارستانەکە بەکاو خۆیان خوڕەیان دەکرد و خۆیان تێکەڵ بە زێیەکان دەکرد. بەهۆی چڕی دارستانەکەوە خۆشاردنەوەمان ئاسان بوو. بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکان لەسەرووی زێیەکە لەسەر گردێک خاڵی چاودێریمان دامەزراند. لەم شوێنەوە دەتوانرا بە ئاسانی ڕێگەی نێوان دەرسیم و ئۆڤاجک ببینرێت. لەسەر ئەم ڕێگەیە بارەگای سەربازی تورنۆڤای لێبوو کە چەندینجار

لەگەڵیاندا کەوتبوینەوە شەڕەوە. لەسەر ئەم گردە دەمانتوانی بارەگاکە ببینین. ئەوانیش دەیانتوانی ئەو قەد پاڵە ببینن کە ئێمەی پێوەبوین. ئەوکاتەی هاتین بۆ ئێرە و یان ئەوکاتەی جموجۆڵمان دەکرد ئەو شوێن پێیەی بەسەر بەفرەکانەوە جێمان دەهێشتن تەنها کاری خراپەی ئێمە بوو. هەڤاڵانی دواوە هەوڵیاندەدا کە شوێن پێمان بسڕنەوە. بەڵام تەواوکەر نەبوون. دوای ئەوەی کەمپەکەمان سازدا چادرە بچکۆلەکانمان هەڵدا. هەڤاڵان بۆپەیداکردنی داری وشک بەناو هەموو دارستانەکەدا دەگەڕان. مەخابن کە لە زستاندا لەم شوێنە پەیداکردنی لق و چڵ و کۆتکەلەداری وشک مەحاڵ بوو. ئەو ئازوقەیەی پێمان بوو شاردمانەوە هەروەها ئەو ئازوقانەشمان کۆنترۆڵکردەوە کە پێشوتر حەشارمان دابوون. ئەو حەشارگە کۆنەی کە چەندین مانگ لەمەوبەر ئازوقەمان لێدانابوو لەلایەن هێزی دوژمنەوە دۆزرابۆوە. هەموو ئارد و شەکر و چا و ڕۆنەکانمانیان لە حەشارگەکە دەرکردبوو بە شێوەیەک بەوناوەدا پەرشوبڵاویان کردبۆوە کە بە هیچ شێوەیەک بەکار نەدەهێنرانەوە. ئامانجی ئێمە ئەوەبوو کە هەتا بەهار هیچ شەهیدێک نەدەین و ئەگەر زۆر ناچاری نەبێت ئەم کەمپەمان جێنەهێڵین. لەراستیدا دەمانزانی کە ئەمە کارێکی مەحاڵ بوو. بەڵام هیچیشمان لەدەست نەدەهات.

دوای سێیەمین ڕۆژ لە جێگیربونمان لە کەمپەکە شەوێکیان هەڤاڵ سیپان کە ئێشکگر بوو بە هەڵوەدان خۆی گەیاندە لای هەڤاڵ قارەمان. شڵەژاویەکی زۆری پێوەدیاربوو. بە قارەمانی وت کە خوار دارستانەکەی خوارووی کەمپەکەمان دەنگە دەنگ دێت و گوێیان لە خشپە خشپ و شکاندنی لق و چڵ بووە و سەرەڕای ئەوەی زۆر سەرنجیشیان داوە. بەڵام هیچیان نەدیوە. هەڤاڵ قارەمان ئەوشەوە هەموومانی کۆکردەوە. هەریەکەمان بۆچونی جیاوازمان هەبوو. هەندێک لە هەڤاڵان دەیانووت کە پێویست بە شڵەژاوی ناکات و ئەوە ورچن کە ئەو دەنگانە دەهێننە ئاراوە. هەندێک لە هەڤاڵانیش دەیانووت کە ئەوە ڕەشەبایە ئەو دەنگانە درووست دەکات. بەڵام هیچ لە هەڤاڵان ئەوەیان نەهێنایە زمان کەلەوانەیە

هێزی دوژمن ئۆپەراسیۆنی ئەنجام دابێت. بیرکردنەوە لەوەی کە لەوانەیە دوژمن بێت خۆیلەخۆیدا بۆ ئێمە بارگرانی بوو. لەلایەکی تریشەوە لەم ڕەوشەدا کە بەفر دوو مەترێک دایکردبوو هەروەها کاتی شەویش بێت هەرگیز لەم حاڵەتانەدا هێزی دوژمن ئۆپەراسیۆنیان ئەنجام نەدەدا، هەموو گریمانەکانمان هەڵسەنگاند. بەڵام بیروبۆچونێک نەهاتە ئاراوە کەلەوانەیە ئۆپەراسیۆنی هێزی دوژمن بێت. بێگومان ئەم بیروبۆچونەی کە ئۆپەراسیۆن نییە تەنها خواستێک بوو لە دڵی هەمووماندا، بەڵام ئەم خواستە نەگەرچی لەگەڵ هەموو ڕاستێکانیشدا گونجاویش بووبێت واتادارێکەی خۆی لەدەست نەدەدا. هەمووشمان لەسەر ئەوە هاوبیربووین کە ئۆپەراسیۆن نایەتە ئاراوە. لەکاتی شەوداو لەکاتێکدا کە دوو مەترێک بەفر باری بوو ئۆپەراسیۆن هاتبێتە ئاراوە بەمانای چۆڵکردنی کەمپەکەمان دەهات. پەیدانەکردنی شوێنێکی تر بۆ کەمپ و لەجیاتی ئەوەی لەسەرمادا لەناو بەفردا ڕەق ببینەوە باشترین شت شەڕکردن بوو کە مەخابن ئەمەش دەبووە هۆکاری هاتنە ئاراوەی شەهادەت. ئەزمونەکەمان ئەوەی نیشان دەداین کەلەناو ساتەوەختێکی زۆر مەترسیدار و تراژیدیادایین. برسێتی و بێ هیوایی و شەهید بوون، بە گشتی ئەم سێ کارەساتە ئەوکاتانە دەهاتنە ئاراوە کە شوێنی کەمپەکەمان دەگۆڕی. زۆرجار لەم حاڵەتانەدا بۆ ڕزگاربوون لەم جەفایە خوازیاری شەهید بوون دەبوین. لەناکامدا بەدەستی خۆمان پاڵمان نابە گریمانەی هەبوونی ئۆپەراسیۆن. ئەم بۆچونەمان لەخۆمان دوورخستەوە و بەوە دڵی خۆمان خۆشکرد کە ئەو دەنگانە لەناکامی هاژە و وژی ڕەشەبا و دەنگی ورچدا هاتونەتە ئاراوە.

سیپان لەهەمبەر وەڵامەکەی ئێمەدا نەیدەزانی کەچی بڵێت. ئەویش باشی دەزانی کە ئەگەر کەسێک زۆر لەسەر ئەو دەنگانە هەڵوێستە بکات کەپێی وابێت دوژمنە بە ترسنۆکی لەقەڵەم دەدەن. لەناو گەریلادا مردن باشترە لە جیاتی ئەوەی بە ترسنۆک لە قەڵەمت بدەن. ئەگەر لەسەر داواکاریەکەی سووربوایە کە هەر دەبێت ئەو دەنگانە تاقی بکەینەوە و دەبێت بزانین چییە ئەوە ناوی لەناو لیستی ترسنۆکەکاندا تۆمار دەکرا.

ئەگەر سیپان بە بیروبۆچونەکانی ئێمە قایل بوایە ئەوە هەموومانی دەخستە ناو مەترسییەوە، هەربۆیە بۆئەوەی زیاتر دڵنیابێت بە بەرزایەکەدا هەڵگڕا و جارێکی تر گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، هاتەوە لای ڕێزان و بەرخودان کە ئەوانیش لەگەڵ سیپان ئێشکگربوون باسی ڕەوشەکەی بۆیان کردبوو، سیپان نەیدەویست ئەم مەسەلەیە بەجدی وەربگیردرێت، دوای زانیمان کە سیپان بە دوو هەڤاڵەکەی وتبوو کە کێ دەڵێت با بڵێت ئەم شەو هێزی دوژمن دەگەنە ئێرە، هەربۆیە زۆر بە جدی دەستی بە ئێشکگری کردبوو، دوای نیو کاتژمێرێک جارێکی تر گوێیان لە دەنگ ببۆوە، ئەمجارەیان ڕێزان گوێی لە دەنگ ببوو، دوایش بەرخودان بۆنی شتێکی کردبوو، ئەمەشی بە هەڤاڵەکانی وتبوو، بۆنەکەش بۆنی جگەرەی مارلبۆرۆ بوو، لەبەرئەوەی هیچ هەڤاڵێک جگەرەی مارلبۆرۆی نەبوو ئەمە بەس بوو بۆئەوەی کە ئیتر بزانرێت هێزی دوژمن لێیان نزیک بۆتۆتەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش کەسیان نەهاتبوون تاکو هەواڵ بە هەڤاڵانی کەمپەکە بدات، لەبەرئەوەی سڵیان لە تەریق کردنەوە کردبوو کە گوایە شت گەورە دەکەنەوە و بە ترسنۆک ناوزەند دەکرێن هیچیان نەوتبوو، بەخۆیانیان وتبوو چی کاتێک دوژمنمان بینی پاشان هەواڵ بە هەڤاڵان دەدەین، هەرزۆر نا پێنج خولەک تێپەڕی ئەمجارەیان گوێیان لەو قسانە ببوو کە سەربازەکان لەنێوان خۆیاندا دەیانکرد، ئیتر گریمانەیان نەمابوو لەهەمانکاتیشدا سەربازەکانیش گەیشتبوونە بن لووتیان، هەرسێکیان لەیەک کاتدا مەخزەنەکانی خۆیان لە سەربازەکان خاڵی کردبۆوە، ئێمەش لە کەمپەکە بە دەنگی تەقەکان بە ئاگاهاتین، لەبەرئەوەی بەربڵاوبووین توانیمان بە زووترین کات خۆمان ئامادە بکەین، ئەوەی لێی دەترساین هاتبووە سەرمان، بەڵام هەڤاڵ قارەمان هەروەکو هەموو جارێکی خوێنساردانە ڕەفتاری کرد، هەتا توانیمان ئازوقەمان لەگەڵ خۆماندا هەڵگرت، سەرلەنوێ ڕێبوارییەکی نوێ دەستی پێکردەوە، دەبوایە پێش ئەوەی ڕۆژ ببێتەوە بگەیشتینایەتە شوێنی دڵنیا، کەوتنی چەند مەترێک بەفر هەرچەندە ناڕەحەتی بۆماندرووست دەکرد لەهەمانکاتدا پەیداکردنی شوێن خۆیلەخۆیدا کێشەیەکی تربوو،

ئەمە یەکەمجارمان نەبوو کە لە ڕەوشێکی وادا نەژیابێتین، ئەوانەی چەند ساڵێک گەریلا بوبێتن ڕوبەڕووی ڕەوشی لەم جۆرە بوەتەوە، لەم ڕەوشانەدا هەست و نەست لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، لەهەمووشی خراپتر ئەوەیە کە گیرۆدەی بێ چارەیی بووین، لەیەکەم خولەکی ئەم ڕێبواریەماندا ئەوکەسەی کە زۆر بێ چارەیی پێوە دیاربوو شامیلمان بوو، ئومێدی سەرکەوتن ئەوەندەی تۆزقاڵێک نەدەبینرا، ئەو دەستی کردبوو بە باسکردنی شێوازەکانی مردنمان، قەبوڵکردنی مردن و بێ چارەیی مرۆڤ بێ حەوسەڵە دەکات، لە نێوان مردنی ناو شەڕ و مردنی سادەیی بێ چارەیی مرۆڤ خودی مرۆڤ وەک پەروانە دێت و دەچێت، هەرچەندە نێوانی هەردووکیان ئەوەندەی شاخێکە و دوو هەستی دژ هەمبەر بە یەکن، بەڵام لەیەککاتدا بەیەکەوە چرۆ دەکەن، ڕێکردن لەکاتی زستاندا سەخت بوو، دەبوایە بە چیای بۆکرمان بیڕیایە، بەقەد پاڵێکدا دەڕۆیشتین، لەدوای خۆشمان شوێنی پێمان بەجێ دەهێشت، کاتێک لە لووتکەی چیاکە نزیک بووینەوە چڕی دارستانەکەش کەمی کرد، لە گردە ڕووتەڵەکە بەئاسانی شوێن پێمان دەبینرا، شوێن پێمان ئیخباری خۆمانی دەکرد، بەبێ ئەوەی گوێ بە کێشەی ئاسەواری پێ خۆمان بدەین بەبێ ڕاوەستان ڕێمان کرد، گەیشتینە ئاڤگاسۆر، لەسەر گردەکە بە دووربین تەماشای هەموو ڕێگەکان و ئاوی مونزوور و قەدپاڵەکانمان کرد، هێزی دوژمن هەتابەیانی هێزیان ڕەوانەی شوێنەکەمان کردبوو، هێزێکی گەورەیان کۆکردبۆوە و پێش ئەوەی خۆریش هەڵبێت بەشێکی هێزەکەیان بەرەو چیای بۆکر ڕەوانە کردبوو، ئەگەر بە ڕۆژ بهاتنایە لەوانەبوو نەگەیشتنایەتە ئەم شوێنە، لە ئاڤگەسۆر خۆمان کرد بە ناو ئەو قەد پاڵانەی کە دارستان و بۆ بناری زێیە قوڵەکان شۆڕدەبوونەوە، دەمانویست کەمێکی تر هەڵبگژێین و خۆمان بگەهێنینە قەڵای سەید ڕەزا کە هەمووی بەردەڵان بوو، ئەگەر بمانویستایە بۆماوەیەکی درێژ شەڕ بکەین دەبوایە خۆمان بگەهێندایە شوێنێکی گونجاو، هێشتا نەگەیشتبووینە سەر قەڵای سەید ڕەزا بینیمان هێزی دوژمن بەکۆپتەر سەرباز لەسەر چیای بۆکر و چواردەورەکەی دادەگرن،

چیای بۆکریان داگیر کردبوو. لەلایەکەوە بەختەوەر بووین بەوەی کە زوو کەوتبوینە جوڵەوە لەلایەکی تریشەوە نیگەران بووین بەوە نەبا دوژمن پێش ئەوەی بگەینە سەر قەڵای سەید ڕەزا سەربازی لەسەر جێگیر بکات. لەسەر بەرزایەکەوە بە دووربین تەماشای شوێنی کەمپەکەمان دەکرد. کۆپتەرەکان موشەکیان پێوە دەنا و دووکەڵ بەرز ببۆوە. هەموو شتێکی نەخوازیاری ئێمە هاتبووە ئاراوە. دەبوایە بەبێ وەچان بەردەوام بوینایە لە ڕێکردن. بەبێ ئەوەی ئاوڕ لە دوای خۆمانەوە بدەین بەردەوام بووین لە ڕێکردن).

کاتێک ئەم بەشە تەواو بوو ساریا گەڵایەکی خستە نێوان ئەو لاپەڕەیەی کە تەواوی کرد پاشان وتی "شوێن پێیان ئاشکرایە ڕزگار بوونیان زۆر مەحاڵە"، ئاریاش بەڵێیەکی بۆکرد. لەناکاو گوێیان لە دەنگی پچڕ، پچڕ بوو، هەناسەیان لەخۆیان بڕی، ساریا زۆر بە کاوخۆی سەری لە سەنگەرەکە دەرخست، تەماشای کەمپەکەی کرد، هەموو شوێنێک سەربازی لێبوو، باوەڕیان بەم دیمەنە نەکرد، مادام سەربازەکانی دوژمن گەیشتونەتە ئەشکەوتی جنۆکەکان کەواتە هەموو هەڤاڵان ڕۆیشتوون، ئەی باشە بۆچی ئەمانیان ئاگەدار نەکردۆتەوە؟ ساریا لەبەردەم ئەشکەوتی جنۆکەکان کۆمەڵێ سەربازی بینی لەگەڵ کەسێکدا کە جلوبەرگی گەریلای لەبەردابوو، لەناکاو بە دەنگێکی پڕ بە جۆشوخرۆشەوە و بە کپی بە ئاریای وت "گەریلایەک لەناو سەربازەکاندایە! "ئاریاش بە سەرسوڕمانێکەوە پێیوت "گەریلای چی، گەریلا نیشی چییە لەوێ؟ "ئەمجارەیان ئاریا سەری لە سەنگەرەکە بەرز کردەوە، ئەویش هەمان شتی بینی و بە ساریای وت "ئەوە هەڤاڵ عەلی موسایە! "ئەمجارەیان ساریا ئەبڵەق بوو، جارێکی تر کەوتەوە تەماشاکردن، ئەویش سەرە کەچەڵەکەی عەلی موسای بینی، نەیاندەزانی کە چی بڵێن و چی بکەن. بەناچاری خۆیان خزاندەوە ناو سەنگەرەکە، ماوەیەکی زۆر هیچ قسەیان نەکرد.

***** ***** ***** ***** *****

عەلی موسا هەڵدەلەرزی، فەرماندەی سەربازەکان پاڵتۆکەی خۆی داکەنی و کردیە سەر شانی عەلی موسا، عەلی موسا بەختەوەر ببوو، ئامانج و هیواکانی ئەوەندەی ئەم پاڵتۆیەی بەری زوو گۆڕی بووی، لەبەردەم ئەشکەوتی جنۆکەکان وەک کەسێکی تری زۆر جیاواز ڕاوەستا بوو، بۆئەوەی یادەوەریەکانی لەهەمبەر ئەو پرسیارانەی لێدەکرا زاڵ نەبێت بەسەر زهنیدا هەوڵیدەدا کە بیر لەهیچ نەکاتەوە، ئەگەر کەمێک بیری بکردایەتەوە لەوانەبوو بەزەیی بەخۆیدا بهاتایەتەوە، ئەو تاکە شتەی هەستی پێدەکرد تەنها ترس بوو، ئەگەر زاڵ نەبوایە بەسەرخۆیدا ترس هەموو جەستەی دەگرتەوە، لەخۆی پرسی کە ڕۆژانێک لەناو ئەم جلوبەرگەی خۆیدا لێرە چی کردووە؟ لەخۆی پرسی ئەرێ لەبەردەم ئەشکەوتی جنۆکەکان ئەم سەربازانە چاوەڕێی کێ دەکەن؟ ئەم پرسیارانە بێ حەوسەڵەیان کردبوو، دەیزانی کە ناتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، هەوڵیدەدا کە زهنی خۆی بەشتی ترەوە سەرقاڵ بکات.

هەموو شتێک وەک دێوزمەیەک وابوو، عەلی موسا هەرچییەکی بکردایە لە یەخەی ئەم دێوەزمەیە ڕزگاری نەدەبوو هەروەهاش نەیدەتوانی ببێتەوە بە عەلی موساکەی جارانی، خۆی ببوو بە دوژمنی خۆی، خۆی خستبووە بەرەیەکی ترەوە، هەربۆیە خۆشی بێت و ترشی بێت بەگوێرەی ئەم ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە دەجوڵایەوە، لەهەمانکاتدا ئەم هەڵبژاردە بەرە نوێیەی هیچ کاتێک نەدەبووە مایەی بەختەوەری بۆئەو، لەراستیدا عەلی موسا نەیدەزانی کە بەچی بەختەوەرە و بەچی غەمگینە، لەکەسێک دەچوو کەلە کەشوهەوایەکی خۆش و سامانڵدا ڕێی ون کردبێت، بێ چارە بێت و ئەمەش ئەوی نارەحەت کردبوو، ئەم ئەندێشانەی ناخی ئەوەندە لە سیمای بەدیدەکرا ئەگەر یەک دوو خولەک لێت بڕوانایە درکت پێدەکرد کەلە ناخیدا چی بورکانێک هەیە، هەندێکجار ئەبڵەق و هەندێکجاریش بەشێوەیەکی بێ مانا پێدەکەنی و هەندێکجاریش دەترسا و جاریواش هەبوو دەموچاوی جدی دەبینرا، کە لە بچوکترین چرپەدا دڵی خورپەی دەکرد و تەماشای چواردەوری خۆی دەکرد، چاوەکانی زەق دەبوونەوە و هۆکارێکی زۆریشی هەبوو کە لە هەموو چرپە و خشپە و دەنگێک بترسێت و هەرکاتێکیش دەیزانی کە بە ئاگایە لە چواردەوری کەمێک

دڵی ئاسودە دەبوو هەتا بگەڕایەوە بۆ ڕێگەچارەی ڕزگاربوون لە ئەندێشەکانی هەستی دەکرد کەبە ناخی قوڕدا چەقیوە و نەیدەزانی کە لە پاشەڕۆژدا چی بەسەردێت.

لەسەرووی هەموو شتێکیشدا ئەو ئەندێشە مردنەی لە ناخ و مێشکیدا درووستی کردبوون هەرچییەکی دەکرد خۆی لێی قوتار نەدەکرد، ئەو لەوە دەترسا کە لەوانەبوو هەر ئێستا گەریلایەک فیتبێتەوە و فیشەکێکی پێوە بنێت و بیکوژێت، ئەم ترسە وەک لەزگە نوسابوو بە دڵیوەی، وەک ئەوانەی کە دەترسان لە ئازاری گوناحەکانیان ئەویش دەبوایە بەو ئاگرەی کە کڵپەی پەشیمانی ناخی دایگیرساندبوو بژێت، هەربۆیە ژیان بۆ عەلی موسا بەردەوام دەبوو بە ئازار، بۆشایەکانی ناو ناخی هەتا خیانەت پڕیانی بکردایەتەوە دەگەڕا بۆ شتێک پەنای بۆبەرێت، ئەی باشە لەم ڕەوشەدا پەنای بۆکێ دەبرد؟ بۆ سەربازەکان؟ بێگومان ئەمە ئەوەندە ئاسان نەبوو، ئەگەر خۆیشی بیویستایە ئایا دوژمن ئەمەیان قەبوڵ دەکرد؟ عەلی موسا لەم بارەیەوە دڵنیا نەبوو، هەربۆیە دەبوایە ڕێگە چارەیەکی تر بدۆزێتەوە تاکو بتوانێت خۆی پێبدات بە قەبوڵ کردن، عەلی موسا ئەمەی بە دڵ بوو، دەیتوانی ئەم ڕێگەیەیان تاقی بکاتەوە، زاتەن مرۆڤ کە دەیەوێت شتێک بکات زۆرجار ناتوانێت باشترینیان ئەنجام بدات، بەڵام نەیدەزانی کامەیان هەڵبژێرێت، لەجیاتی ئەوەی بڕوات بەدوای دەنگەکەی ناخیدا کە مەنزڵێکی ئاسودەی ڕوبەڕوو دەبۆوە، بەڵام دەیویست هەڵبژاردەیەکی سەرپێیانە بۆخۆی بکات، عەلی موسا بەسەر ڕێگەیەکەوە بوو کە گەڕانەوەی مەحاڵ بوو، ئەگەر ئەم هەڵبژاردە ئەفرەتییەی هەڵبژاردایە هەرگیزاو هەرگیز نەیدەتوانی پاشەکشێی لێبکات.

هەستی دەکرد هۆشی هاتۆتەوە سەرخۆی، وەک ئەوەی شتێکی گرنگی کەوتبێتەوە خەیاڵ تەماشای چواردەوری خۆی کرد، لەدڵی خۆیدا وتی دەبێت هەموو گەواهییەکان نەمێنن! نەمانی ئەم گەریلایانەی ئێرە بەتایبەتی نەمانی کەسانی وەک باگەر و شاهین بەمانای ئەوە دەهات کە هەموو گوناحەکانی لەگەڵ ئەواندا وەک نهێنییەکی نەبەدی ڕۆدەچێتە ناخی خاکەوە و ئاسەواریان نامێنێت، جگە لەم ڕێگەیە بۆ دڵدانەوەی خۆی ڕێگەیەکی تری نەبوو، وایهەست

دەکرد کە هیوایەکی تری چارەنووسسازی بەدەست خستووە.

ئەفسەرەکە کەمێک لەولاوە بەبێتەلەکەی قسەی دەکرد، لە کەمپەکەدا ئاسەواری بەفر نەمابوو، هەموو شوێنێک ببوو بە قوڕ، کەشوهەوا کەمێک سارد بوو ئاسمانیش هەوراوی بوو، عەلی موسا تەماشایەکی چێشتخانەکەی کرد، بیری لەو کاتانەی کردەوە کە لەوێدا سەدانجار نانی خواردبوو، عەلی موسا چۆن ئەو گۆشتی بەرازانەی لەیاد دەچۆوە کە دڵگەش بۆی لێدەنا، عەلی موسا کەمێک لە ئەفسەرەکە نزیک بۆوە، بەشێوازێک قسەی بۆکرد کە تەنانەت خۆیشی لە گوێگرتنی دەنگەکەی نارەحەتی دەچێژا، عەلی موسا بە ئەفسەرەکەی وت "گەورەم دەتوانم ئاربێجییەک بگرمە ئەم چێشتخانە؟! "ئەفسەرەکە ئەم قسەیەی پێ سەیر بوو، بەسەر سەرمانەوە لێی دەڕوانی، حاڵی نەدەبوو کەبۆچی بەبێ هیچ هۆکارێک داوای لێدەکرد کە ئاربێجی بنێت بە چێشتخانەکەوە، ئەفسەرەکە لێی پرسی "ئێوە زۆر بە برسێتی دەمانەوە؟ "عەلی موسا وتی "بەڵێ "، کە ئەم قسەیەی کرد دەیویست بە زەبیان پێی بێتەوە، ئەفسەرەکە سەری لەم قسەیە دەرنەدەچوو نیگەرانی پێوەدیاربوو، دوای ئەوەی تەماشای سەراپای عەلی موسای کرد پاشان بە سەربازێکی وت کە ئاربێجێکەی بداتێ، سەربازێک ئاربێجێکەی دایە دەست عەلی موساوە ئەویش خستییە سەرشانی، وایکردە سەرشانی لەوەدەچوو کە یەکەمجاری بێت ئاربێجی بتەقێنێت نەمەشی بە نەنقەسەت دەکرد، دەستەکانی دەلەرزین، نیشانی گرت و بەخەندەی لێوەکانی بێت لەوەدەچوو کە چەندین ساڵە چاوەڕێی ئەم ساتەوەختەی کردبێت هەربۆیە بەبێ هیچ دوودڵییەک ئاربێجێکەی تەقاند، سەرەتا تەقینەوەیەک هاتەئاراوە دوایش کەمێک دوکەڵ بەرز بۆوە و پاشانیش چێشتخانەکە تەفروتونا بوو، زاتەن چێشتخانەکە باش درووست نەکرابوو بەم ئاربیجییە بەئاسانی بەسەریەکدا ڕووخا، عەلی موسا ماوەیەک تەماشای چێشتخانە ڕوخاوەکەی کرد، پێدەکەنی، لەکەسێکی دەکرد کە گەیشتبێتە ئاواتی خۆی، جگە لەمە عەلی موسا مژدەی ئەوەشیانی پێدا کە شوێنی نهێنیان بۆ ئاشکرا دەکات کە ئەشکەوتێکی زۆر نهێنییە.

ئەفسەرەکە پێیووت "تۆ لە پێشەوە ڕێ بکە کاتێک گەیشتینە بەردەم

ئەشکەوتەکە دوو ڕومانەت دەدەمێ!"عەلی موسا وەک ئەو کەسە خۆی نیشان دەدا کە ئەرکێکی زۆر گرنگیان پێڕاسپاردبێت بەمە شانازی دەکرد، بەسەر بەرز و نزم کردنەوە بلێی بۆکردن و کەوتە پێشیان، کاتێک گەیشتە ئاستی قەدپاڵی ئەشکەوتەکە ماوەی سەعاتێک ڕێیان کردبوو، ئەفسەرەکە چاوی بە چواردەوری قەدپاڵەکە گێڕا، لەم قەدپاڵە هیچ دیارنەبوو کەلە ئەشکەوت بچێت، بەتوڕەبونێکەوە عەلی موسای بۆلای خۆی بانگکرد، پێیووت:

"ئەگەر گاڵتەمان پێدەکەیت بێ یەک و دوو لێرە دەتکوژم!؟"

عەلی موسا بەم قسەیە زۆر ترسا، بەشێوەیەکی کپانە و بەشێوەیەک کە بەزەیی پێدابێتەوە بە ئەفسەرەکەی وت:

"بۆچی گاڵتەتان پێبکەم؟!"

"ئەشکەوتەکە لەکوێیە؟"

"بەقەد پاڵەکەوەیە".

"بەقەد ئەم پاڵەوە نەک ئەشکەوت بەڵکو کوونە مشکیشی پێوە نییە".

عەلی موسا بە زەوقێکەوە بە ئەفسەرەکەی وت:

"ئەو دار سنەوبەرە دەبینیت لەوێدایە".

ئەفسەرەکە هەناسەیەکی شادی هەڵکێشا، دوای ئەوەی بە سەربازەکانی وت چواردەوری دارەکە بگرن پاشان بە عەلی موسای وت "ئەم ڕوومانە بگرە بیخەرە ناو ئەشکەوتەکەوە و بگەڕێوە، دەی بتبینم پیمەکەی لەوێ ڕاکێشا، هەر هەڵەیەک بکەیت سەربازەکانم دەتکوژن ئەمەت لەبیر نەچێت! "سەربازەکان کۆنترۆڵی چەکەکانی خۆیان کرد، عەلی موسا دەیزانی کە بۆ گیانی ئەو کۆنترۆڵی چەکەکانیان کردووە، دەیزانی لەحاڵەتی بچوکترین هەڵەدا سەرەتا خۆی دەکوژن، بەئەسپایی بە قەد پاڵەکەدا هەڵگژا، بیری لەوانەی ناو ئەشکەوتەکە کردەوە، هەر هەموویان لەو شوێنە تەسکەدا هەر بە هاوارەکانی خۆیان دەخنکان، دوای چەند ساتێکی تر ئەوانیش ئێسکو پروسکیان لەناو ئەشکەوتەکە دەمایەوە، واهەستی دەکرد کە هەر لە ئێستاوە گوێی لە قیژە و هاواریانە، تەماشایەکی دواوەی خۆی کرد، ئەفسەرەکە لەوی دەڕوانی، باشی دەزانی بۆئەوەی درێژە بە تەمەنی خۆی بدات دەبوایە هەموو شاهیدحاڵەکان

بمرن، سەرلەنوێ بەقەدپاڵەکەدا هەڵگژا، بەچواردەوری کوونی ئەشکەوتەکە چەند جارێک سوڕایەوە و لەسەر کوونی ئەشکەوتەکە وەستا، دەچەمایەوە و ڕوومانەکەی دەخستە ناو ئەشکەوتەکەوە، کارەکەی ئەو هەر ئەوەندە بوو، بیری لە باگەر کردەوە، بیری لەوە دەکردەوە کە ئەوکاتەی دەچەمێتەوە بۆئەوەی ڕوومانەکەی بخاتە ناو ئەشکەوتەکەوە ئەگەر ڕووبەرووی باگەر ببێتەوە چی دەکات؟ هەستی بە ترس کرد و دڵی لێی دەداو هەڵدەلەرزی.

عەلی موسا تەماشایەکی سەربازەکانی کرد، لەچاوەکانی سەربازەکان یەک قولانج بەزەیی بەدی نەدەکران، عەلی موسا هەستی بە پەشیمانی نەدەکرد، ئەو تەنها لەناخی خۆیدا قسەی دەکرد و هەروەها هەستی دەکرد کە قینی لە هەموو شتێک دەبێتەوە، ئەو پێیوابوو هەموو گوناح و نەفرەت و قین و ئەندێشەکانی هەر هەموویان بە پیمی ڕوومانەکەی دەستێوەی گرێدراوە، ئەو پێیوابوو ئەشکەوت و ئەوانەی ناو ئەشکەوتەکە و داری بەردەم ئەشکەوتەکە و سەربازەکان و ئەفسەرکە و دار و درەخت و ئاسمانیش لەهەمبەریدا بۆسەیان بۆداناوە، ئەوەندە هەستی بە تەنیایی دەکرد و بەزەیی بەخۆیدا دەهاتەوە خەریک بوو دەست بکات بە گریان.

جارێکی تر تەماشایەکی ئەفسەرەکەی کردەوە، ئەفسەرەکەش بە توڕەبونێکەوە ئیشاراتی بۆکرد کە ڕوومانەکەی بخاتە ناو ئەشکەوتەکەوە، عەلی موسا پیمەکەی ڕاکێشا، بەتوندی لەناو مشتی گرتی، ئەگەر پیمەکانی بەربدایە لەناو چوار چرکەدا ڕوومانەکە دەتەقییەوە، دوای ئەوەی سەر کوونی ئەشکەوتەکەی پاککردەوە و کوونەکەی بەدیکرد عەلی موسا بە ترسێکەوە سەری بۆناو ئەشکەوتەکە شۆڕکردەوە، هیچی نەبینی، سەرەتا ڕوومانەکەی ناو دەستی ڕاستی فڕێدا دوایش ئەوەی دەستە چەپی، دوایش خۆی بۆسەرەوە کشانەوە و کەوتە چاوەڕوانییەوە، ڕوومانەکان بەدوای یەکدا تەقینەوە، لەکوونی ئەشکەوتەکەوە دوکەڵی ڕەش دەهاتە دەرەوە، نەدەنگی هاوار و قیژە هات لەناو ئەشکەوتەکە نە تەقەش کرا، سەربازەکان لە نزیک کوونە ئەشکەوتەکە ڕاوەستا بوون، دەیانویست لوولەی چەکەکانیان بخەنە ناو کوونی ئەشکەوتەکەوە و چاوەڕێی فەرمانی ئەفسەرەکەیان بوون،

ئەگەر ئەفسەرەکەیان فەرمانی بدایە هەموویان مەخزەنی چەکەکانیان لەناو ئەشکەوتەکە خاڵی دەکردەوە، دوای ئەوەی فەرمان دراو تەقەیان لەناو ئەشکەوتەکە کرد و هیچ وەڵامێکیان نەدرایەوە، ئەفسەرەکە چەند مەترێک سەربازەکانی لە ئەشکەوتەکە دوورخستەوە، چەند خولەکێک بێ دەنگ مانەوە، ئەفسەرەکە زیاتر ئۆقرەی نەبوو، چاوی بڕیبۆوە سەربازەکان و هاواریکرد و وتی یەکێکتان بچێتە ناو ئەشکەوتەکەوە، سەربازەکان تەماشای یەکتریان دەکرد، بەگشتی سەربازەکان هیچیان نیەتی ئەوەیان نەبوو کە بچێتە ناو ئەشکەوتەکەوە، ئەفسەرەکە لە سەربازەکانی ڕوانییەوە، دەیزانی کە کەسیان خوازیاری ئەوەنین بچنە ئەشکەوتەکەوە و نیگەرانی بە ڕووخساریانەوە دیاربوو، ئەفسەرەکە بانگی لە عەلی موسا کرد، عەلی موساش بە شێوەیەکی کتوپڕ وتی بەڵێ گەورەم، ئەفسەرەکە پێیووت بچۆ ناو ئەشکەوتەکەوە، عەلی موسا ئەم فەرمانەی ڕەد نەکردەوە، بەڵام ئەوەی پێوەدیار بوو کە ئەویش نەیدەویست ئەمە بکات، عەلی موسا دەیزانی کە کەس لە ئەشکەوتەکە نییە بۆیە بەبێ هیچ دوودڵییەک چووە ئەشکەوتەکەوە، ئەگەر کەسێکی تێدابوایە بێگومان وەڵامی ئەو هەموو تەقانەی دەدایەوە، عەلی موسا چووە ئەشکەوتەکەوە و دوایش هاتەدەرەوە، ئەفسەرەکە لێی پرسی "چی بوو؟ "عەلی موسایش پێیووت "پێویستیم بە لایتە زوورەوە زۆر تاریکە "، لایتێکی وەرگرت و چووە ناو ئەشکەوتەکەوە و دوای ماوەیەکی کورت هاتە دەرەوە، کەس لە ناو ئەشکەوتەکە نەبوو.

ئەفسەرەکە بەم ڕەوشە زۆر توڕەبوو، بەدەم هاوارکردنەوە جوێنی دەدا، هەموو سەربازەکانیش نیگەران ببوون و بۆنەوەی چاویان نەچەقێت بە چاو ئەفسەرەکەیاندا هەموویان تەماشای ئەملاو ئەولایان دەکرد، بەتایبەتی عەلی موسا، زاتەن ئەفسەرەکە داخی دڵی خۆی بە عەلی موسا دەڕێژا، ئەم دۆڕاندنەو هەرەسی خواست و خەیاڵەکانی شێت و هاری کردبوو، هەر لە ئێستاوە گەورەترین ئۆپەراسیۆنی ئەم ساڵیان بەتاڵ دەبۆوە، بەڵام پیلانەکەیان زۆر بەر فراوان بوو دەبوایە هەموو گەریلاکانیان بکوشتایە، بەدرێژایی دوو مانگ زانیارییەکی زۆریان لەو گەریلایانەوە بەدەست خستبوو کەلەناو هێزەکانی

خۆیان هەڵاتبوون، تەنها بە ئامانجی هەڵخەڵەتاندنی هێزی گەریلا دوو ئۆپەراسیۆنی جیاوازیان لە دوو کاتی جیاوازدا بەسەریەکەوە ئەنجام دابوو، بەڵام ئێستا گەریلاکان دیارنەمابوون، ئەمەش بەس بوو کە ئەفسەرەکە پێی شێت و هاربێت.

ئەفسەرەکە زۆر تورەببوو، بە عەلی موسای وت "ئەرێ هەتیو ئەمانە بۆکوێ چوونە؟ "ئەویش وتی "نازانم لەکاتی دەست پێکردنی ئۆپەراسیۆنەکەتان لێرە لەم ئەشکەوتەکە خۆمان شاردەوە "، "ئەی باشە ئەمانە فڕین؟ "عەلی موسا گریانی دەهات، نەیدەزانی کەچی بڵێت، ئەوتاکە شتەی کە دەیزانی ئەویش ئەوەبوو کە نیتر جێی باوەڕی ئەفسەرەکە نەماوە ئەمەش عەلی موسای نیگەران کردبوو، بەزەیی هێنانەوە بەخۆی نیتر دادی نەدەدا، ئەفسەرەکە بێتەلەکەی سەر گیرفانی سەرووی بەشی سنگی دەرهێنا و چەند هەنگاوێک دوورکەوتەوە، لەگەڵ فەرماندارێتیان کەوتە قسەکردن، عەلی موساش گوێی قوت کردبوو دەیویست گوێی لە قسەکانی بێت، کاتێک عەلی موسا بیستی کە ئەفسەرەکە بە بێتەلەکە قسەدەکات و دەڵێت "ئەشکەوتەکە چۆڵ دەرچوو تیرۆریستەکان ڕۆشتوون "، بەم قسەیە عەلی موسا لە ئەفسەرەکە زیاتر خەم دایگرت، دوایش ئەفسەرەکە وتی "کاتی پێکوشتین و ئەمەش سوودی بە تیرۆریستەکان بەخشی "، کە عەلی موسا گوێی لەم قسەیە بوو ترپەی دڵی زیادیان کرد و لەدوایشدا عەلی موسا گوێی لێبوو ئەفسەرەکە وتی "زۆرباشە کەواتە تەماشای ئەوی تریان دەکەین، ئەگەر ئەویش چۆڵ بوو ئەوە دەکەین کە ئێوە دەتانەوێت "، عەلی موسا لەدوای ئەم قسانە ڕەنگی پەڕی بوو، نەیدەزانی کەچی بکات، بەشێوەیەکی کرۆزانەوە لە ئەفسەرەکەی دەڕوانی.

ئەفسەرەکە هاواری بۆ عەلی موسا کرد، عەلی موساش بە هەڵپەیەک گەیشتە بەردەم ئەفسەرەکە، پێیووت "بڕوانە لەگەڵ سەرووی خۆم قسەم کرد، هەرکەزانی ئەم ئەشکەوتە چۆڵ دەرچوو بەمە زۆر تورە بوو، پێیووتم لەوەدەچێت عەلی موسا گەمەمان لەگەڵ بکات، باشتروایە بیکوژیت‌ا بەڵام من دەمەوێت هەلێکی ترت بدەمێ، سەرووی خۆم قسەم ناشکێنێ، ئێستا دەچین بۆ کەمپەکەی ئۆڤاجک ئەگەر ئەوێش چۆڵ بێت ئەوە بزانە نیتر

ناتوانم ڕزگارت بکەم تێگەیشتیت؟ "عەلی موساش بە سەر ڕاوەشاندن بە ئەفسەرەکەی وت کە حاڵی بووە، بەڵام ئەمجارەیان کێچ کەوتبووە کەوڵێوەی، لەدڵی خۆیدا دەیووت ئەی ئەگەر باگەر هەواڵی بەوان دابێت کە کەمپەکە چۆڵ بکەن و ئەوانیش ئەوێیان چۆڵکردبێت من چی بکەم؟! بەڵام کاتێک بیری لەوە دەکردەوە کە باگەر نازانێت کە عەلی موسا شارەزای ئەم کەمپەیە کەمێک هۆشی هاتەوەسەر خۆی. ئێستا گەورەترین خواستی عەلی موسا ئەوەبوو کە هەموو گەریلاکان لەو کەمپەکە مابێتنەوە و لەناو ببرێن. دوای دوو کاتژمێر کۆپتەرێک لە نزیک خوێندنگەکەی کەمپەکە نیشایەوە. ئەفسەرەکە بەخۆی و چەند سەربازێکەوە لەگەڵ عەلی موسا سواری کۆپتەرەکە بوون. لەهەمانکاتدا سەربازەکانیان بەردەوام بوون لە جێگیربوون لە ناوچەکانی دەربەندی عەلیدا.



دڵگەش لەسەرپشت خۆی درێژ کردبوو. تەماشای ئەو هەورانەی دەکرد کە لە تەتەر دەچوون و لە شوێنەکانی خۆیان ئۆقرەیان نەدەگرت. نیگەرانیەکانی ناوناخی بە ڕووخسارێوەی دیاربوو. هەموو گریمانەکانی لەبارەی عەلی موساوە مێشکی ماندوو کردبوو هەربۆیە لە دوێنێوە حەوسەڵەی نەمابوو. دەتوانرێت بوترێت ڕەوشی هەموو گەریلاکان کەمێک لەیەک دەچوو. ماوەی دوو ڕۆژ بوو خەو نەچوبووە چاویان. بەڵام دڵگەش جیاوازتر لە هەڤاڵەکانی ئەو بیری لە عەلی موسا دەکردەوە. بەرچەم هەستی بەم ڕەوشەی دڵگەش کردبوو هەربۆیە بەدەر لە زمانی ڕێز و حورمەتەوە پێیووت "بیر لە عەلی موسا دەکەیتەوە؟ "ئەگەرچی لە دەستپێکدا دڵگەش وتی "نەخێر". بەڵام دوایی لەقسەکانیدا دانی بەم ڕاستییە هێنا. بەرچەم بە کەسێک ناسراوبوو کە قسە لە ڕوو بوو هەروەها لەحاڵەتی پێویستیدا پێویستی بەچی قسەیەک بکردایە ڕووبەڕو دەیکرد و چی لە مێشک و دڵی بوایە ئەیدرکاند. بەرچەم دەیزانی کەبەم قسانە دڵی دڵگەش

غەمگین دەکات، بەڵام ئەمجارە خۆیشی نەیزانی چۆن بوو دانی بەخۆیدا گرت و دەگەڕا بە شوێن ڕێگەچارەیەک تاکو شتەکانی دڵی خۆی ڕوبەڕوی دڵگەش نەکاتەوە، سەرەڕای ئەمەش بە دڵگەشی وت:

"بەڕای تۆ عەلی موسا مردووە؟"

"نازانم لە دوێنێوە بیر لەم مەسەلەیە دەکەمەوە".

"بەڕای خۆت تەخمینێکت کردووە ئەمەش لە شێی دەنگت بەدەردەکەوێت".

دیاربوو دڵگەش درکی بە مەبەستی بەرچەم کردبوو هەربۆیە کەمێک بە دڵ شکاویەوە وتی:

"تەخمینی چیم هەبێت بە گریمانەیەکی زۆرەوە شەهید بووە!"

"دڵنیایت لەمە؟"

"هەڤاڵ زۆر سەیریت من چۆن دڵنیابم".

شاهین گەیشتە لایان هەرکە دانیشت پرسیارێکی کرد کە دڵی دڵگەش بەتەواوەتی خوێنی لێچۆڕا، شاهین لە دڵگەشی پرسی:

"بەرای تۆ عەلی موسا هەڵات؟"

"راکردنی جی هەرگیز ئەو هەڵنایەت!"

"ئەگەر شەهید بوایە لە شوێنەکەیدا شەڕ و پێکدادان دەهاتە ئاراوە، بەڵام لەسەنگەرەکەی ئەوانەوە تەنانەت تەقەش نەکرا!"

بەرچەمیش وتی:

"منیش بەنیاز بووم ئەمە بڵێم، بەڵام دەزانم دڵگەش پێی غەمگین دەبێت بۆیە هیچم نەووت".

دڵگەش وتی:

"پێویستە گوناحیان لەئەستۆ نەگرین ئەگەر سبەی دەرکەوت کە شەهید بووە ئەوکاتە هەست بە ئازاری ویژدان دەکەیت"، شاهین وتی:

"باشە، عەلی موسا هاوڕێی منداڵیتە تۆ لە ئێمە زیاتر ئەو دەناسیت من دەڵێم زۆر بە دڵنیاییەوە هەڵاتووە چونکە کەسێکە مەیلداری ئەم مەسەلەیەیە"، دڵگەشیش وتی:

"ئەی باشە ساڵح و نوزگور و ساریا و ئاریاش دیارنین، ئەی ئەوانیش هەموویان هەڵاتن؟!"بەرچەم وتی:

"عەلی موسا مێشکی هەردووکیانی پڕکردۆتەوە!"دڵگەش کەمێک تووڕە بوو بۆیە وتی:

"بەڵێ تەنها ئێمە خۆڕاگری و بەرخودان دەکەین ئەوانی تر هەڵدێن وانییە؟!"شاهین وتی:

"نا مەبەستم ئەوە نییە، ئەمە مەحاڵە، ئەمە شتێکە کە هەرگیز نایەتەدی"، دڵگەش وتی:

"من دەڵێم نەخێر، من ئەو دەناسم، شتی واناکات، لەوانەیە من خیانەت بکەم، بەڵام ئەو هەرگیز نایکات!" شاهین دەیویست زیاتر سەرنەکاتە سەر دڵگەش، بەڵام خۆی پێڕانەگیرا، دواتریش نەزانرا هۆیەکەی چی بوو ئایا لەبەرئەوەبوو کە عەلی موسای لەدەست چووبوو یاخود باوەڕی هێنابوو کە هەڵاتووە دڵگەش دەستی کرد بە گریان. شاهین و بەرچەم بۆئەوەی دڵگەش زیاتر شەرمەزار نەبێت بەتەنیا جێیان هێشت.

چەند مەترێک لەولایانەوە باگەر گوێی لەو ڕادیۆیە دەگرت کە نابووی بە پەنای گوێیەوە. ئەو بەختەوەریەی لەدەستپێکی یەکەم ئۆپەراسیۆندا چێژتبووی لە ئۆپەراسیۆنی دووەمدا غەمگینی شوێنی گرتبۆوە، تەنها ئەو نا بەڵکو هەموو گەریلاکان مۆڕاڵیان خراپ ببوو، لەراستیدا باگەر فەرماندەیەک بوو کە بە هەموو شێوەیەک ئامادەی ئەم ڕەوشانە بوو، پێشوتریش لەناو ڕووداوی وەک ئەمەی ئێستادا ژیابوو، لەهەمووشیاندا گرووپەکەی لە مەترسی ڕزگار کردبوو، باگەر بە فەرماندەیەک ناسراوبوو کە بەجدی حیسابی بۆ هەموو گریمانەکان دەکرد و بەگوێرەی ئەوەش تەدبیری وەردەگرت، بەڵام ئەمجارەیان مەسەلەکان وەک خواستی ئەو نەدەچوو بەڕێوە.

لەدەستپێکی ئۆپەراسیۆنەکەی دەربەندی عەلی جگەلەوەی چەند شەهیدێکیان دابوو بە گشتی توانیبوویان خۆیان لە شاڵاوی ئۆپەراسیۆنەکە قوتار بکەن، بەڵام بەگشتی نەیانتوانی بوو خۆیان لە مەترسێکان ڕزگار بکەن، ڕاستە لەناو جەرگەی شەڕ و پێکدادانداندا ڕزگاریان ببوو، بەڵام هێشتا

نەکەوتبوونە دەرەوەی سنوری ئۆپەراسیۆنەکە، ئەگەر هەڤاڵ پالۆیان ئەو ڕێگەیەی نەدۆزیبۆیایەتەوە کەلە نزیک گوندی دەرە بوو مەحاڵ بوو خۆیان لە هاتنە ئاراوەی شەڕ و پێکدادانەکاندا قوتار بکەن، ئەو شوێنەی لێی هەڵگیرسابونەوە شوێنێکی زۆر مەترسیدار بوو بۆ گەریلاکان، ئەو شوێنەی لێی بوون لە قولایی قەدپاڵی بۆزان بوو کە هەمیشە ئەو سەربازانەی ئۆپەراسیۆنیان دەست پێدەکرد وەک خاڵی چاودێری بەکاریان دەهێنا، ئەگەر سەرنج لە جوغرافیای دەرسیم بدرێت ئەم شوێنە نەگونجاو ترین شوێن بوو بۆ گەریلا، ئەگەر هێزی دوژمن درکی پێبکردنایە کە لێرەن مەحاڵ بوو کەسیان لە مردن ڕزگاریان ببوایە، ئەوەی کە دڵنەوایی ئەوانی دەدایەوە ئەوەبوو کە هێزی دوژمن هەرگیز بیر و خەیاڵی بۆ ئەم شوێنە ناچێت کە گەریلا خۆی لێبشارێتەوە، ئەگەر هێزی دوژمن بەم شێوەیە بیریان کردبێتەوە کەواتە بۆ ئەویێ نەدەچوون، بەگشتی ئەم ڕەوشەش بە شانسەوە گرێدرابوو.

چاڵەکە چوار یان پێنج مەترێک قوڵ بوو، پێنج مەترێکیش پان بوو، ئەو گردانەی لە پشت و پێشەوەی قیت ببونەوە لە هەردوولاوە دەیانیشاردەوە، نێوان خاڵی چاودێری و چاڵەکە کاتژمێرێک بوو، لەوێشەوە مەحاڵ بوو کە ئەم چاڵە ببینرێت، چواردەوری چیای بۆزان و چاڵەکە بەتەواوەتی بە بەفر تنرابوو، چەمێک هەبوو کە ئاوەکەی لەسەرووی گردەکەوە دوخوڕایە خوارەوە و بە چواردەوری چاڵەکە دەسوڕایەوە، پاشانیش سەرلەنوێ چەمێکی تری درووست دەکردەوە، لە چواردەوری چەمە بچکۆلەکەدا بەفر توابۆوە و سەوزایی بوو، بەم شێوەیە کێشەی ئاویشیان نەبوو، بوونی بەفر لە چواردەوری چاڵەکە و چەمەکە سودێکی باشی بە گەریلاکان دەبەخشی، پالۆ دەیووت "دوژمن پێیوایە کە گەریلایەکی ژیر لەهەمبەر ئۆپەراسیۆنێکی واگەورەدا لە چاڵێکی وای نەگونجاودا خۆی ناشارێتەوە"، هەرلەبەر ئەمەش بوو ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە درکیان پێناکەن، باگەریش هەمان بیروبۆچوونی هەبوو، لەدڵی خۆیدا دەیووت کەس بیر لە شوێنێکی واناکاتەوە بەڵێ... باگەر بەم شێوەیە دڵی خۆی خۆشدەکرد.

بەقەد پاڵەکەوە شوێنێکی شیاو پەیدانەدەکرا بۆ سەنگەر، تەنانەت بۆ

شەڕکردنیش گونجاو نەبوو، ٥٠ گەریلایەک خۆیان خزاندبووە ناو ئەم چاڵەوە، ئەگەری ئەوەی زۆربوو کە ببێت بە گۆڕستانێکی بە کۆمەڵ، ئێرە هەمان شێوەی ئەو ئەشکەوتەبوو کە ماوەیەک لەمەوبەر خۆیان تیاشاردبۆوە، بەڵام بەشێوەیەکی تر، جگەلەوەی کە تەنها بڵێن باوەڕمان بە شانسی خۆمان هەیە شتێکی تریان نەبوو کە بیهێننە زمان، ئەوەی کە وەک نارەحەتی لێرە ڕووبەڕوویان دەبۆوە نەبوونی ئازوقە بوو، چاویان لە ڕووەکە سروشتیەکانی چواردەوریان بڕی بوو کەلە کەناری چەمەکە سەوز ببوون، جگە لە خواردنی ئەم ڕووەکانە ڕێگە چارەیەکی تریان نەبوو، ئەم ڕووەکەشیان ئەوەندە کەم بوو کە بە ژەمێک تەواویان دەکرد، هەرچەندە لەیەکەم ڕۆژیاندا برسێتیان لەبیری خۆیان بردبۆوە، بەڵام لە ڕۆژانی دواییاندا دەبوو بە کێشەیەکی گەورە بۆیان.

باگەر لە بەیانی زوودا بۆئەوەی چاودێری چواردەوری خۆیان بکەن بە بەرزایەکەی بەردەم چاڵەکە هەڵگژا، دوایش هەموو گەریلاکانی ئاگەدار کردبۆوە کەبە هیچ شێوەیەک کەسیان نەچن بۆ شوێنەکەی ئەو، بەڵام بەرچەم لەبەر مەراق خۆی چوو بووە ئەو شوێنە و باگەریش تەریقی کردبۆوە، دەتوانرا لەسەر ئەم گردەوە زۆر شوێنی دەربەندی عەلی ببینرێت، ئەمە شتێکی باش بوو، هەرهیچ نەبێت لەئاستی خۆیان زووترس هەستیان بە هاتنە ئاراوەی ئۆپەراسیۆن دەکرد، دەمەو نیوەڕۆ شاهین و بەرچەم خۆیانگەیاندبووە لای باگەر و کەوتبوونە ناو قسەوباسەوە، لەسەر سوود و مەترسێکانی چاڵەکە قسەیان دەکرد، هەرکاتێک باگەر لەگەڵ شاهیندا قسەی بکردایە دەستبەرداری نیگەرانێکانی ناخی دەبوو، ڕاستەوخۆ چی لەدڵبوایە بۆی باسدەکرد، باگەر هیچی نەبوو کە لە شاهینی بشارێتەوە، باگەر زۆر بە شێنەیی و بە پێکەنینەوە پێیانیوت "ئەمجارەیان ڕەوشمان زۆر زەحمەتە! "شاهینیش ئەمەی دەزانی، بەڵام لەهەمانکاتدا دەیویست کۆمەڵە شتێک لە باگەرەوە گوێ لێبێت کە کەمێک دڵی خۆشبکات، باگەر وتی "ئەگەر خۆمان نیشانی کۆپتەرەکان نەدەین ئەوە دڵنیابن کە هیچمان بەسەرنایەت! "ئەگەر کۆپتەر بەسەریاندا بفڕایە مەحاڵ بوو دیمەنی ئەم چاڵە و ئەم ٥٠ گەریلایەی نەبینیایە، بەڵام بەهۆی چەند کرادرێکیانەوە دەتوانرا مەترسی ئاشکرابونیان

کەم بکەنەوە، ئەو شتانەی کە دەبوایە زۆر بە جدی وەریبگرن ئەوە بوو کە دەبوایە بریسکایی چەکەکانیان نەیەڵن و ئەو نایلۆنە سپیانەی بە شەو ئەیاندا بە خۆیاندا بە ڕۆژ بەباشی قەدی بکەن و دەرنەکەوێت هەروەها دەبوایە کەسیان بەپێوە ڕانەوەستنایە، ئەگەر ئەمانەیان بکردایە مەترسی کەشفبونیان کەم دەبۆوە، زاتەن جگە لەم تەدبیرانەیان هیچی تریان لەدەست نەدەهات.

قسە و باسەکانیان هاتبووە سەر مەسەلەی ئازوقە، شاهین پێیوابوو چارەسەرکردنی کێشەی هەرە گەورەیان دابینکردنی ئازوقەیانە هەروەها پێیوابوو بۆچارەسەرکردنی ئەم کێشەیەیان کۆبونەوەیەکی فراوان ئەنجام بدەن و مەسەلەکە گەڵاڵە بکەن و لەبارەیەوە بڕیارێک بدەن، خۆشیان نەیاندەزانی کە چەند ڕۆژ لەم چاڵەدا دەمێننەوە، بەڵام دەیانزانی کە دوای چەند ڕۆژێکی تر ڕوبەڕووی کێشەی نەبوونی ئازوقە دەبونەوە، هەربۆیە ئێستا پێش ئەوەی کێشەی ئازوقەیان ڕوبەروی برسێتیان بکاتەوە دەبوایە چارەیان بکردایە.

باگەر قسەکانی شاهینی بەدڵ بوو، دەمەو ئێوارە کۆبونەوەیان ئەنجامدا، بەدوور و درێژی لە نێوان خۆیان گەنگەشەی ئەوەیانکرد کە دوژمن ئامانجیان لە ئەنجامدانی ئەم ئۆپەراسیۆنە چییە و بۆچی و چۆن بەو شێوەیە چواردەوریان گیرا و دەبێت تاکو کۆتایی ساڵ شەڕێکی چۆن بەرن بەڕێوە، ئەو مەسەلەیەی کەزۆرلەناویانداز ەق ببۆوە ڕەخنەگرتن و ڕەخنەلەخۆگرتن بوو، لەکۆبونەوەکەدا بەشێوەیەکی گشتی لەسەرئەوە هاوبیربوون کە سەرچاوەی هاتنە ئاراوەی ئەم کێشانە بێ پیلانی دەستەی فەرماندارێتیان بووە، نەیانتوانی شیکاری باش بۆ پیلانی دوژمن بکەن و پێچەوانەی بخوڵقێنن هەربۆیە سەرەتا بە باگەریشەوە دەستەی فەرمانداریتیان لەهەمبەر ئەم ڕەوشە بەرپرسی یەکەمن کە کەمتەرخەم بوونە لە بردنەڕێوەی ڕەوشەکەیان، باگەر بەهیچ شێوەیەک ڕەخنەکانی سەرخۆی پەرچنەدایەوە، بە دڵ و گیانەوە گوێی بۆ ڕەخنەکانی هەموویان گرت، باگەر هەڵەکانی خۆی پێقەبوڵ بوو، بەڵام شاهین وانەبوو، شاهین بە قسەکانی بەرچەم زۆر ناڕەحەت بوو کە پێیانیوتبوو کە فەرماندەکانیان خاوەن کەسایەتییەکی سادەن و دوژمن ناناسن و بەئاسانی

هەڵدەخەڵەتێن، شاهین ئەم قسانەی پێهەزم نەدەکرا، ئەمەشی بەرروونی هێنابووە زمان، شاهین دژبەری قسەکانیان بوو هەربۆیە پێیانیوت "من ئەو ڕەخنانە قەبوڵ ناکەم کە هەموو شتێک بکەن بە ماڵ بەسەر فەرماندارێتییەوە، ئەم شێوازە شێوازی تەڵەکەبازییە کەپەردەپۆشی هەڵەکانی خۆیانیان پێبکەن، هێزی دوژمن پاشەکشێ کردبوو، ئێمە لە ئەشکەوتەکە بماینایەتەوە چیمان پێدەکرا، زاتەن بڕیاری هاتنە دەرەوە لە ئەشکەوتەکە لەناکامی بڕیاری کۆبونەوەیەکی گشتیمان نەهاتەئاراوە؟ هەربۆیە دەبێت هەموومان لە ئاستی ئەم مەسەلانە خۆمان بە بەرپرسیار بزانین!" لەڕاستیدا شاهینیش لەسەر حەق بوو، بەڵام ئێستا کاتی ئەم قسانە نەبوو، بەلای کەمەوە باگەر پێیوابوو کە کاتی ئەم قسانە نییە، باگەر دەیزانی کە ئەم گەنگەشانە جگە لە خراپکردنی مۆراڵ شتێکی تری لێ سەوز نەدەبوو، لەحاڵەتی وەک ئێستا زۆر بڕیار دەردەکرا کە هەندێکیشیان هەڵە بووە کە دوایی درکیان پێدەکرا، هەربۆیە لەجیاتی ئەوەی بە دورودرێژی باسی مەسەلەکان بکەن و سەری خۆیان بهێشێنن ئێستا کاتی ئەوەیە کە بۆ لەمەودوا چی بکەن، کاتێک کۆتاییان بە کۆبونەوەکە هێنا باگەر پێیانیوت کە هەموویان بیر لە دۆزینەوەی ڕێگەچارەی ڕزگاربونیان لێرە بکەنەوە و لەکاتێکی تری گونجاودا دەتوانن لەناو خۆیاندا گەنگەشەی مەسەلە کۆنەکان بکەن، ئەم قسانەی باگەر هەموویانی هێور کردەوە.

# ٦

عەلی موسا لەناو کۆپتەرەکەی کەشفکردندا بوو، یەکەمجاری بوو کە سواری کۆپتەر ببێت، لەهەیەجاندا خەریک بوو دڵی بێتە دەرەوە، لەسەرەوە کەلە زێ و ڕووبار و چیا و گردەکانی دەڕوانی وەک تابلۆیەکی وێنەکێش دەهاتەبەرچاوی، کەلله سەرەکەی شۆڕکردەوە و بینی کە دەمێکە گەیشتونەتە دەربەندی ئاکتاش، دەربەندی ئاکتاش ئەو شوێنەبوو کە ئیبراهیم زۆر بەتایبەتی بۆ

شوێنی کەمپ هەڵبژاردبوو کە یەکێک بوو لە کەمپە باش پارێزراوەکان، لەبەرئەوەی کەمپەکە چواردەوری زنێەکانی چەت و گامر و کەهبەری چواردەوریان تەنیبوو بەئاسانی گەریلاکان دەیانتوانی جەولەی تیابکەن، دارستانە چڕوپڕەکەی کەهبەری بەقەد یاڵەکانی زنێیەکەوە بوون، ئێرە بۆ دەربەندی ئاکتاش وەک قەڵا وابوو، زنێ چەت کە زۆر لە قوڵایی دابوو زنجیرەیەکی زۆری لێدەبۆوە، زنێ چەت تێکەڵ بە ئاوی زنێ گامر دەبۆوە، چیای کاهبەریش ئەم دوو زنێیەی بەیەکەوە گرێ دەدا، دەربەندی ئاکتاش لەهەموو ڕوانگەیەکەوە شوێنێکی پارێزراو و جێی بڕوا بوو، جگەلەوەی کەمێک نزیک بوو لە سەربازگەیەکی سەربازی بەگشتی شوێنێکی دڵنیابوو، بۆ ڕوبەڕوو بونەوەی هێزی گەریلا لەهەمبەر ئۆپەراسیۆنەکانی وەرزی هاویندا وەک ئەوە وابوو کە ئەم شوێنە بەتایبەتی بۆ گەریلا درووست کرابێت، بەڵام ئەم ڕەوشە بە زستان وانەبوو، کاتێک عەلی موسا لە کۆپتەرەکەوە تەماشای زنێ ئاکتاشی دەکرد کاتژمێر هەشتی بەیانی بوو، عەلی موسا شارەزای ئەو کەمپەبوو کەلە نێوان چەت و گامردابوو کە هەڤاڵ بەدرانیان بە نەزانینەوە لەدەمی ترازا بوو، ماوەی ساڵێک عەلی موسا لەم چیایانە شەڕ و پێکدادانی کردبوو، هەموو ڕێگەوبان و شوێنی کەمپە کۆنەکانیان هاتەوەیاد، هەروەکو ئێستای ئەو کاتانەی لەیاد بوو، کە هەموو شتێکی وەبیر دەهاتەوە بەمە بەختەوەر بوو، تەماشایەکی ئەفسەرەکەی کرد بینی کەمێک نیگەرانە، عەلی موسا دەیزانی ئەگەر شوێنی کەمپەکە نەدۆزێتەوە ئەوا قسەی ناشرینی پێدەکات و لەوانەشە بیکوژێت، هەتا مەسەلەی مردن بهاتایە بە ئەقڵیدا زیاتر هەڵدەلەرزی، دەبوایە شتێکی بۆ ئەفسەرەکە بسەلماندایە، ئەگەر ئەمەی نەکردایە ڕەوشی دەکەوتە مەترسییەوە.

ژیانی لەژێر هەڕەشەدابوو، مەسەلەی ویژدان بەلایەوە گرنگ نەبوو هەرچۆنێک بێت دەیتوانی خۆی لەم هەستە ڕزگار بکات، ئەو دەیزانی ئەگەر شوێنێک بدۆزێتەوە و خۆی بۆ ئەفسەرەکە بسەلماندایە هەموو شتێکی بەباشی دەچوبەڕێوە، هەربۆیە هەوڵیدەدا کە ئەوەی لەدەستی بهاتایە دەیکرد.

ئەفسەرەکە دەموچاوی گرژ کردبوو لەناکاو هاواری لە عەلی موسا کرد،

دیاربوو عەلی موسا ئاگای لەخۆی نەمابوو لەناو دەریای خەیاڵدابوو بۆیە گوێی لە قسەکەی ئەفسەرەکە نەبوو، ئەفسەرەکە دەستی خستە سەرشانی عەلی موسا و ئەویش هاتەوە سەرخۆی، ئەفسەرەکە پرسی:

"لەکوێن؟ توانیت شوێنەکانیان دیاری بکەیت؟"

"با کەمێکی تر بچینە نزیک دەربەندەکە".

ئەفسەرەکە فەرمانی کرد بە پیلۆتەکە کە کەمێک نزمتر بێتەوە، پیلۆتەکەش بەخێرایی بەسەر گامر و چەت و ئاکتاش سوڕایەوە، کۆپتەرەکە ئەوەندە نزم ببۆوە تەنانەت گەریلاکانی کەمپەکەی ئێرەش کەتبوونە جموجۆڵەوە، سوڕانەوەی چەند جاری کۆپتەرەکە و دوورکەوتنەوەکەی گەریلاکانی نیگەران کردبوو، فەرماندەی ئەم کەمپەکە هەڤاڵ ڕووبار بوو، هاواری کرد بۆ حەیدەر کەلە بەردەم چادرە خەفەکراوەکەدا ئێشکگربوو کە بانگی ئیبراهیم و عەگید و گۆرسێ و هێلین و مونزووری بۆبکات، نیو کاتژمێر بەسەرچوو هەتا حەیدەر چوو بۆناو یەک بەیەکی چادرەکانی تر هەتا هەواڵ بەو هەڤاڵانە بدات کە دیاربوون و مەبەستی بوون، کۆبونەوەیەکی نائاساییان ئەنجامدا بە فەرماندارێتی هەڤاڵ دیار بوو، هەڤاڵ دیاریان فەرماندەی گشتی هێز و کەمپەکە بوو، لەکاتی کۆبونەوەکەیاندا دیار بە گشتی باسی ڕەوشەکە و گریمانەکانیانی بۆکردن ئەوانیش لەکۆتایی قسەکانی دیار بۆیان دەرکەوتبوو کە قسەکانی دیار هەتا کوێ بڕدەکات، ئەوانەی بەشداربوون لە کۆبونەوەکەدا هەموویان فەرماندەبوون، لەناویاندا ئیبراهیم وتی "لەوانەیە کەشفێکی هاکەزایی بێت لەوانەشە شتی تریش! "دیاریش پرسی "مەبەستت لە شتی تر چییە؟ "ئیبراهیم وتی "نازانم، کەس ئەم کەمپەکە نازانێت، تەنها چاوساغەکانمان ئێرە دەزانن، نازانم لەکاتی چونیان بۆ دەربەندی عەلی کێشە هاتبێتەوە نازاوە ئەمە شتێکی ترە! "دیاریش پرسی "لەوانەیە چی ڕوویدابێت؟ "بێدەنگ بوون، ئیبراهیم بەشک و گوماناوی بوو، نەیدەزانی کەچی بڵێت، لەناکاو هەڤاڵ گۆرسێیان هەڵیدایە و وتی "ئەمە کەشف کردن بوو هاتن و چوون، پێویست ناکات لەسەر ئەم مەسەلەیە هەڵوێستە بکەین"، دیاریان بێزار ببوو، ئەم کەشوهەوا نیگەرانی کردبوو، دیار وتی "بامەسەلەکە زیاتر

گەورە نەکەینەوە، بەڵام لەسەر گردەکانی نانێکان و سەرووی ئاکتاش چاودێر جێگیر بکەن، چادرەکان خەفە بکەن، دەکەوینە چاوەڕوانییەوە زاتەن هیچی ترمان پێناکرێت!"

دەمەونیوەڕۆ لەکەناری ئەو زێیەی کەلە دەربەندەکەوە خوڕەی دەهات ئیبراهیم چاوەکانی نوقاندبوو گوێی بۆ دەنگی ئاوەکە ڕادێرابوو، ئەوەی کە ئیبراهیمی لەناو دەریای خەیاڵ دەرهێنا دەنگی ئەو کۆپتەرە بوو کە ببوو بە مزاری کۆبونەوەکەیان، دەنگی نزیکی کۆپتەرەکە کە هەموو دەربەندی ئاکتاشی گرتبۆوە هەموو کەمپەکەی خستبووە جموجۆڵەوە، هەموو گەریلاکان لەو سەنگەرانە جێگیر ببوون کە پێشوتر بۆیان دیاریکرابوو، دەنگی کۆپتەرەکان هەندێکجار نزیک و هەندێکجاریش دوور دەکەوتنەوە، دیاربوو ئەو چادرانەیان نەدەدۆزییەوە کەلە نێوان دارەکان و بەردەڵانەکاندا بوو، لەناکاو ئیبراهیم هەستی کرد کە کۆپتەرەکە بەرەو ناوچەی نانکان دوورکەوتەوە، لەماوەیەکی کەمدا گوێی لەو تەقانەبوو کەلە ئاکامی ئەو شەڕ و پێکدادانە هاتبووە ئاراوە کەلە خوارووی کەمپەکەوە دەستی پێکردبوو، کۆپتەرەکان بە موشەک لەوێیان دەدا، ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو کە ئەم کۆپتەرانە بە ئامانجی کەشفکردن نەهاتوون، کاتێک کۆپتەر بەردەوام موشەکی تێدەگرت و تەقەکردن بەردەوام بوو عەگید بەهەناسە برکێ خۆی گەیاندە لای دیار، ئەو تەقە شەلکوێرانەی دەکران نارەحەتییەکی ئەوتۆی درووست نەدەکرد، ئەمەش مانای ئەوەبوو کە هێزی دوژمن بەتەواوەتی هەدەفی خۆیان نازانن، بەڵام ئەو هەواڵەی عەگید بۆ دیاری دەبرد ئەوەبوو کە چاودێرانی نانکان لەلایەن کۆپتەرەکانەوە لێدراون، سەرەتا دیار نەیدەزانی کە مەبەستی عەگید چی بوو هەربۆیە بەتاسەوە لە عەگیدی دەڕوانی، ئەمە مایەی بڕوانەکردن بوو، چۆن ئەو هەڤاڵانەی کە چەند کاتژمێرێک لەمەوبەر ڕەوانەی کردبوون بۆ نانکان ئێستاش هەواڵی شەهید بونیان هاتبێت!؟ کەئەوان لەم حاڵەتانەدا بوون ئیبراهیم خۆی گەیاندە لایان، عەگید زۆر بە خێرایی باسی گۆڕانکاریەکانی بۆ ئیبراهیم کرد، دیار دەستەکانی دەلەرزین، سوور هەڵگەڕابوو، دیاربوو ئازاری دەروونی دەچێژا، کەسیان قسەیان پێنەدەکرا و بە تاسانەوە لەیەکیان

دەڕوانی، پەردەی بێدەنگی نێوانیان ئیبراهیم دڕاندی، ئیبراهیم وتی "با کەس لە سەنگەرەکەی خۆی دەرنەچێت، چاوەڕێی ئێوارە دەکەین". دەنگی کۆپتەرە جەرگ بڕەکان هەتا ئێوارە بەشێوەی ناوبەناو بەردەوام بوو، کە ئێوارە داهات جارێکی تر دەستەی فەرماندارێتییان کۆبونەوە، لەم کۆبونەوەیەدا هەڤاڵ هێلینیان بەشدار بوو کە فەرماندەی گرووپی کچە گەریلاکان بوو. لەئاکامی بۆردۆمانەکانی کۆپتەرەکان سێ هەڤاڵیان شەهید ببوو کەناویان دەلیل و دۆغان و شامی بوو. سەرەتا پیلانسازیان کرد تاکو تەرمەکانیان بنێژن، دوایش کەوتنە ناو ئەو قسەوباسانەی کە چۆن پیلانسازی نوێ بۆخۆیان بکەن.

دیار وتی "سەرەتا هێزی دوژمن سەرباز دادەگرن، دەبێت تەدبیری ئەمەش وەربگرین". ئیبراهیم وتی "ناکرێت چەت و گامر و نانکان جێبهێڵین". دیاریش وتی "بۆکوێ بچین؟ "ئیبراهیمیش وتی "شوێنێک پێدەزانم، کە پێشوتر لێی مابوینەوە، لەماوەی شەش بۆ حەوت کاتژمێرێک ڕێکردن دەتوانین بگەینە ئەوێ". دیار حاڵی بوو کە ئیبراهیم مەبەستی مونزوورە، لەهەمانکاتیشدا دەیزانی کە ناتوانرێت هەروا بە ئاسانی بگەن بە ناوچەی مونزوور، ئەگەر ئۆپەراسیۆن بۆ دەربەندەکە ئەنجام بدرێت ئەوا پرێشکەکەی دەگاتە چەت و گامریش، لەم بارەیەوە لەگەڵ ئیبراهیم هاوبیربوو، ئەگەر بڕیاری جێهێشتنی ئەم ناوچەیەیان بدایە دەبوایە بە زووترین کات بکەونە جوڵەوە. هەرچەندە بیر و بۆچوونی جیاوازتریش هێنرابووە زمان، بەڵام بەگشتی بۆچونەکەی ئیبراهیم مایەی قەبوڵی هەموویان بوو، بەبێ ئەوەی کات لەدەست بدەن کەوتنە ئامادەباشییەوە، دوای ئەوەی سێ شەهیدەکەیان بەخاک سپارد کەوتنە ڕێ.

کەوتنە ڕێ، بەڵام تەمومژی نادیاری سەرودڵی گرتبوون، بەتەواوەتی نەیاندەزانی کە دەبێت لەچ شوێنێک هەڵگیرسێنەوە، لەم بارەیەوە بڕیارێکی موتڵەقیان نەدابوو، لەهەمانکاتدا بەفر هەموو شوێنێکی تەنی بوو، کەکەمپەکەیان جێهێشت زنێەک کە چواردەوری ڕووتەڵە بوو هاتە پێشیان، نەگردی لێبوو نە دارستانیش، دوای ئەوەی ئێرەیان بڕی و گەیشتنە زێی نانکان نیوەشەو داهاتبوو، ئەو ڕێگەیەی کە نیوکاتژمێری دەخایاند ئێستا بە دوو کاتژمێر بڕیبویان، ئەگەر بەم شێوە ڕێکردنەیان بێت ئەو شوێنەی کە

دەبێت بە شەش کاتژمێر ببڕن بە ڕۆژێکیش نەیاندەبڕێ هەربۆیە پێیەکانیان خێراتر کرد. شەوێکی سارد بوو، سمێڵ و ڕیشی زۆربەیان لەسەرمادا ڕەق هەڵگەڕابوو، ئیبراهیم لە ڕیزەکەی خۆی هاتە دەرەوەو خۆی گەیاندە لای دیار، چرپاندییە پەنا گوێی و پێیووت "بەم شێوەیە بێت لەکاتی خۆیدا ناگەینە جێ! "دیار تەماشایەکی ئیبراهیمی کرد، نەیدەزانی کەچی پێبڵێت، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، دیاربوو ئیبراهیم بەم هەناسە هەڵکێشانە غەمباری هەڤاڵ دیاری بوو، دیار پێوەی دیاربوو کە خەفەتی دەخوارد، ئیبراهیم جارێکی تر پێیووت "لە هاویندا لەم کەمپەوە بۆ ئێرە بەنیو کاتژمێر دەگەیشتین، وادیارە زۆر هێواش ڕێ دەکەین"، دیاریش وتی "ڕاستەکەیت، پێم وابێت لێرە ئەشکەوتێک هەیە، بەڵام بەتەواوەتی شوێنەکەی نازانم"، ئیبراهیمیش وتی "هەڤاڵ ڕۆدی شارەزایەکی باشی ئێرەیە بانگی بکەم؟ "دیاریش وتی "بانگی کە". دوای چەند خولەکێک ڕۆدی هات بۆلایان، بەدەم ڕێگەکردنەوە کەوتنە قسەکردن، دیار وتی "تۆ شارەزای ئەم ناوچەیەی وایە؟ "ڕۆدیش وتی "بەڵێ وایە"، "ئەی باشە ئێستا ئێمە لەکوێین؟ "سەرەتا ڕۆدی چاوی بە چواردەوری خۆی گێڕا، جگە لە بەفر هیچی تری بەرچاو نەکەوت، دوایش وتی "هەڤاڵ ئێمە ئێستا لە خوارووی کەمپەکەماینەوەیەن، پێموابێت ماوەی کاتژمێرێک ڕێشمان نەکردووە"، "دەڵێن لەم ناوە ئەشکەوتێک هەیە ڕاستە؟ "ڕۆدی کەوتە بیرکردنەوە و ئەو دڵنیابوو لەوەی کە لێرە شتیوا نییە، بەڵام حاڵی ببوو کە دیار باسی چی دەکات، پاشان ڕۆدی وتی "ئەو شوێنەی مەبەستانە هێشتا زۆری ماوە". پاشان ئیبراهیم هەڵیدایە و وتی "ئەگەر پێت باشە بابگەڕێینەوە؟! " دیار سەریسوڕمابوو، نەیدەزانی چی بکات، دیار لە ڕۆدی پرسی "چەند کاتژمێرێک ماوە بۆ نزیکترین خاڵمان؟ "ڕۆدیش وتی "نزیکترین شوێن گەیرەت بابایە. ئەوێش بەلای کەمەوە چوار یان پێنج کاتژمێرێک ڕێکردنی دەوێت! "دیار وتی "گرووپەکە ڕاگرن، پێنج خولەک پشو دەدەین". هەموویان بەڕیز کە نێوانی هەریەکەیان یەك مەترێک دەبوو لەسەر بەفرەکە دانیشتن.

نەیاندەتوانی جگەرە داگیرسێنن و بەدەنگی بەرز قسەبکەن، سەرەڕای ئەوەی ئیبراهیم واخۆی نیشان دەدا کە خوێنساردیشە بەدەنگی دیاربوو کە

بەختەوەر نییە، ئیبراهیم وتی "ئەگەر بەقسەی من دەکەن بابگەڕێینەوە، هەرچۆنێک بێت لە شوێنەکانی خۆمان دەتوانین شەڕ بکەین! "ئەم پێشنیارەی ئیبراهیم لەبەرئەوە نەبوو کە شوێنی کەمپەکەیان شوێنی ڕزگاربونیانە بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کە بۆ شەڕ گونجاو بوو، ئەمە پێشنیارێکی ژیرانە بوو، لەجیاتی ئەوەی لەم تەختاییە بەبێ ئەوەی بتوانیت شەڕ بکەیت لەهەمبەر دوژمن و دوژمنیش بەئارەزووی خۆی کە دەتوانێت ڕاوبکات، بەڵام لە شوێنی کەمپەکە هەرهیچ نەبێت دەتوانیت شەڕ بکەیت و زیان لە دوژمنیش دەدەیت، دوای ئەوەی ماوەیەک لە نێوان خۆیاندا گەنگەشەیان کرد گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە بگەڕێنەوە، دیار هەموو گەریلاکانی کۆکردەوە و بە کورتی هەندێ قسەی بۆکردن، دەبوایە گەریلاکان هەست لەبێ چارەیی هەڤاڵ دیاریان نەکردایە، بەدەنگێکی پڕ لە بڕواو پڕ لە تین وتی "لێرە شوێنێک نییە کەلێی جێگیر ببین، زۆر بەداخەوە ڕێگەیەکی یەک کاتژمێریمان بە چوار کاتژمێر بڕیوە، ئەو شوێنەی مەبەستمانە لێرەوە زۆر دووره زاتەن کەمی ماوە کە ڕۆژ دابێت، ناچارین بگەڕێینەوە، ئەگەر کەمێک دەست وبرد بکەین دەتوانین پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە خۆمان بگەهێنینە شوێنی کەمپەکەمان، لەوێ دەتوانین خۆمان بپارێزین، سبەی هەرکە تاریک داهات دەتوانین بکەوینە ڕێ و بگەینە شوێنی مەبەستی خۆمان "، هێشتا دیار قسەکانی تەواو نەکردبوو ڕۆدی دەستی هەڵبڕی، دیاریش پێیووت فەرموو، ڕۆدی وتی "چۆن دەتوانین بگەینەوە شوێنی کەمپەکەمان زاتەن بە چوار کاتژمێر گەیشتینە ئێرە!؟ "دیاریش پێیووت "ئەگەر کەمێک خێرا بین زووتر دەگەین "، ئەمجارەیان حەیدەریان دەستی هەڵبڕی، ڕێگەی پێدراو بەهەیەجانەوە کەوتە قسەکردن و وتی "قسەکانی هەڤاڵان ڕاستن، هەموومان شەهید دەبین، لە شوێنێکی وا تەختدا وەک کەروێشک ڕاومان دەکەن "، دیار بە دەنگێکی گڕەوە وتی "زۆرباشە هەموو شتێک ڕوون بۆوە ئەم بیروبۆچوونە ڕەش بینانە بەو شێوە ناشکرایە و لەناو ئەم هەموو قەڵەباڵغیەدا باش نییە ئەیدرکێنن، دەگەین، هەردەبێت بگەین، پێویست بە ڕەش بینی ناکات، لەماوەی کاتژمێرێکدا دەگەینە کەمپەکە، ئەوەندە بەسە کە هەنگاوەکانمان خێراتر بکەین! "

دیار غەزەبی لێدەباری، دەبوایە لەحاڵەتی وەک ئێستادا لە قسە و باسی ڕەش بینانە خۆیان دووربگرتایە، لە قسەکانی حەیدەر سەرسام نەبوو، زاتەن لە حەیدەر شتێکی جیاوازی تری لێ چاوەڕوان نەدەکرد، بەڵام هەرچییەکی دەکرد سەری لە قسەکانی ڕۆدی دەرنەدەکرد کەلە شوێنێکی وایگشتیدا هێنابوویە زمان، ڕۆدی بەوە بەختەوەر نەبوو کە حەیدەر پاڵپشتی قسەکانی کردبوو، بەپێچەوانەوە ڕۆدی هەستی بە هەڵەکەی خۆی کردبوو، بەڵام کارلەکار ترازابوو، ڕۆدی بەپێشیانەوە گەریلاکانیش بەدوایەوە کەوتنەوە ڕێ، هەنگاوەکانیان خێراتر کرد، تاقیبکردنی شوێن پێی یەکتری ڕێگەکردنەکەیانی ئاسانتر کردبۆوە، ماوەی کاتژمێرێک بەبێ ڕاوەستان ڕێگەیان کرد، کەسیان ئارەزومەندی ئەوە نەبوون کە پشوو بدەن، هەر خولەکێک بۆ ئەوان گرنگ بوو، دواکەوتنی هەر خولەکێکیان بۆ ئەوان مایەی مەترسی بوو، کەسیان نەیاندەووت ئەرەوەڵا ئەوە ڕۆژ بۆتەوە هەروەکو ئەوەی لەناو تاریکیدا بێ بێ گوێدانە هیچ شتێک بەردەوام بوون لە ڕێ کردن، دوای ماوەیەک هەڤاڵ هێلینیان حەوسەڵەی نەما و بانگی دیاری کرد، هەردووکیان لە ڕیزەکە هاتنە دەرەوە، لە ڕاستیدا هەموویان دەیانزانی کە ئیتر ناکرێت ڕێگە بکەن، لەوانەبوو هەموویان چاوەڕێی یەکێک بوونایە کە ئەمەی بهێنایەتە زمان، هێلین نیازی ئەوەی نەبوو کەبە دیار بڵێت کە ئیتر با ڕێ نەکەین بەڵکو دەیویست کە دیار فەرمان بکات کە هەموو گەریلاکان بەرگی سپی بەفری خۆیان لەبەر بکەن، بەرگی بەفراوێکەیان کۆکردەوە کە ژمارەیان ١٥ دانە بوو، گرووپەکەش ٦٠ گەریلا بوو، ئەی باشە ئەم بەرگە سپی ڕەنگ بەفراوییە بدەن بە کێ؟ دیار شێوازی پراکتیکی بۆ ئەم کێشەیە دۆزیبۆوە، دیار وتی "کێ لە ناو جانتاکەیدا بەرگی بەفراوی هەیە با لەبەری بکات "، بەڵام کەسیان بەم ڕێنماییەی دیار نەگونجاو و هەموو بەرگە بەفراوێکانیان لەسەر بەفرەکە دانا، کەسیان نەیاندەویست دەستی بۆبەرێت، پێیان وابوو ئەوەی لەبەری بکات لە مردن ڕزگاری دەبێت و ئەوەیشی لەبەری نەبێت دەمرێت، هەربۆیە پێیان لەنگ بوو هەندێکیان لەبەری بکەن و هەڤاڵەکانی تریان ڕووبەڕووی مەرگ بکەنەوە، هێلین بەرگێکی بەفری خستە ژێر باخڵی هەڤاڵ گۆرسەیەوە، بەڵام گۆرسە فڕێیدا،

گەریلاکانی تریش وەک گۆرسەیان کرد، کەسیان خوازیاری لەبەرکردنی ئەم بەرگە سپییە نەبوون، هێلین کەزانی لەم مەسەلەیە سەرکەوتن بەدەست ناخات بەشێوەیەک تەماشای ئیبراهیمی کرد کە یارمەتی بدات، ئیبراهیم لە دیار نزیک بۆوە و پێیووت "١٠ دانەیان بەسەر هەڤاڵە کچەکان و ٥ دانەشیان بدەن بە هەڤاڵە کوڕەکان"، دیاریش وتی "زۆر باشە تۆ ئەم کارە بکە"، دیار دەیویست بە زووترین کات لەم مەسەلەیە ڕزگاریان ببێت.

بەدەست پێکردن بە هەڤاڵە کچەکانەوە ١٠ دانەیان بەسەریاندا دابەشکرد، ئەوەی بەرگەکەی هەڵدەگرت دەموچاوی بەیەکدەدا، کاتێک نۆبە هاتەسەر دابەشکردن بەسەر کوڕەکاندا مەسەلەکە ئاڵوزبوو، سەرەڕای ئەوەی ئیبراهیم بە چاوی فەرمان لەوانی دەڕوانی کە لەبەری بکەن، بەڵام کەسیان بەمە ڕازی نەبوو، هەرچۆنێک بێت دوانی دابە دوو گەریلا، کەنۆبە هاتەسەر سێیەمیان ئیبراهیم تەقی بە دەموچاوی حەیدەردا، حەیدەر ئەو گەریلایە بوو کە کەسیان خۆشیان نەدەویست، هەرکاتێک ئیبراهیم دەیبینی پێی دەووت "خۆزگە نەدەبویت بە گەریلا! "چەند جارێک بەهۆی ئەنجامدانی تاوانەکانێوەی دادگای کرابوو هەروەها سزاش درابوو، بەڵام بەهۆی بنەماڵەکەیەوە کە خێزانێکی زۆر وەڵاتپارێز بوون لە ڕۆژئاوا ئەم سزایانەی لەلایەن سەرکردایەتییەوە پوچەڵ کرابۆوە، سەرەڕای ئەوەی ٢ جار بڕیاری سزای مردنیان بەسەردابوو، بەڵام لێی خۆش ببوون، سەرەڕای ئەوەی ئەوەندەجار لێی خۆش ببوون، بەڵام ئەو هێشتا دەستبەرداری هەڵەکانی خۆی نەبووبوو، حەیدەر خۆیشی دەیزانی کە کەس خۆشی ناوێت، ئیبراهیم بە دوو دڵییەکەوە بەرگە سپێکەی داپێی، ئیبراهیم لەدڵی خۆیدا وابڕیاری دابوو کە ئەم بەرگە نەدات بە حەیدەر، حەیدەر بەبێ هیچ دوودڵییەک بەرگەکەی لێوەرگرت.

ئیبراهیم دوا بەرگە سپێکەی بۆ دیار درێژ کرد، دیار وەرینەگرت، بەرگەکەی لەسەر بەفرەکە دانا، لەم بارەیەوە گەنگەشەیەکی دۆستانە لە نێوان ئیبراهیم و دیار هاتە ئاراوە، ئیبراهیم بینی کە ئەو گەریلایانەی بەرگەکانیان پێدرابوو لەبەریان نەکردبوو ئەوانیش لەبەردەم خۆیان لەسەر

بەفرەکە دایاننابوو، ئیبراهیم بەختەوەر بوو کە کێشەکەی چارەسەر کردووە، بەڵام سەرلەنوێ سەرێهەڵدابۆوە، ڕوبەڕووی کێشەیەک ببۆوە کە چارەسەرکردنی مەحاڵ بوو، دیار هاواری بۆ ئیبراهیم کرد "ئەوبەرگە لەبەرکە "، هەموو گەریلاکان تەماشای ئیبراهیمیان کرد، ئیتر نەیدەزانی لەهەمبەر ئەم تەماشاکردنەی گەریلاکاندا چی بکات هەرچەندە نەشیدەویست، بەڵام ناچارما بەرگەکە هەڵبگرێت و لەبەری کرد، کەوتنەوە ڕێ، چەند هەنگاوێکیان نابوو لەناکاو گورسێیان وتی "هەموو لایەکمان ڕووناکە ڕێکردنمان بەم شێوەیە ڕاست نییە! "ئەوەی ڕاستی بێت هەموویان ئەمەیان دەزانی، بەڵام کەسیان نەیاندەویست کە ئەمە بهێنێتە زمان، دیار پرسی "هەڤاڵ ئیبراهیم بەرای تۆ چی بکەین؟ "ئیبراهیمیش وتی "چارەی ترمان نییە بالە بەفر سەنگەر درووست بکەین! "دیار بیری دەکردەوە کە دەبێت جارێکی تر گەریلاکان کۆبکاتەوە و قسەیان بۆبکات بەمە نیگەران دەبوو چونکە کەمێک لەمەوبەر پێیانیوتبوو کەلە ماوەیەکی کەمدا دەگەینە کەمپەکەمان، ئەی باشە ئێستا چییان پێ بڵێت؟ ئیبراهیم ئەوکەسە بوو کە تاکە کەس بوو لە هەست و نەستی دیار حاڵی دەبوو هەربۆیە لە دیاری پرسی "ئەگەر پێت باش بێت من بۆ هەڤاڵان ڕوونکردنەوە دەکەم؟ "دیاریش بەسەر جوڵانەوە بەڵێی بۆکرد.

ئیبراهیم ڕوونکردنەوەی پێویستی بۆ هەموویان کرد، لەناو بەفرەکەدا سەنگەر لێدەدەن و بەم شێوەیە هەتا ئێوارە دەمێننەوە، عەگید و مەزڵوم و گورسێ وەک بەرپرسی سەنگەرەکان دەست نیشان کران، کاتێک هەموو گەریلاکان سەرقاڵی سەنگەر درووست کردن بوون ئیبراهیم خۆی گەیاندە لای دیار، لەماوەی نیو کاتژمێردا ۱۵ سەنگەریان لە بەفرکە درووست کرد، ئەم سەنگەرانە بۆئەوە درووست نەکرابوون کە شەڕی تێدابکەن بەڵکو بە ئامانجی خۆشاردنەوەیان بوو، بەهۆی کاروباری ئەم سەنگەری بەفرانەوەیان کەمێک گەرمیان ببۆوە، لەم ڕەوشانەدا نیگەرانی و ماندووبوون ئاوێتەی یەک دەبن و ئیتر جەستەی مرۆڤ ئارەزووی خەو دەکات، ئەم سەنگەرانە تەنها ئەوانی گەرم نەکردبۆوە بەڵکو هەموویانی خستبوە ناو دەریای خەویشەوە، ئەم خەوتنەشیان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە دیار وتبووی جگە لە

ئیبراهیم و گورسێ هەمووتان دەتوانن بنوون، ئیبراهیم و گورسێ لە پێشی پێشەوەی سەنگەرەکاندا بوون، ئەوان دڵنیابوون لەوەی کە دوژمن خۆی گەیاندۆتە کەمپەکەیان، ئەوەشیان دەزانی کەلەوانەیە بە شوێن پێیاندا بێن و بیان دۆزنەوە، جگە لە چاوەڕوانی ئێستایان شتێکی تریان لەدەست نەدەهات.

لەماوەیەکی کەمدا هەموویان خەویان لێکەوت، هەموو لایەکیان کپ بوو، ئەوەی لەناویاندا کە بەئاگا بوو گورسێ و ئیبراهیم بوون، چاوی خۆیان بەباشی بڕیبۆوە پێشی خۆیان، ئیبراهیم لەسەر بەرگە سپێکەی دانیشتبوو ئەویش کردبووی بە عینادلەبەری نەدەکرد، گۆرسە قسەی نێوانیانی دەست پێکردبوو بە ئیبراهیمی وت "شوێنەکەمان خۆشە وانییە؟"ئیبراهیم بە پێکەنینێکەوە وتی:

"بەڵێ وایە زۆر جوانیشە".

"کەمپەکەمان شوێنێکی زۆر باش بوو، لەم کارەدا هەست بە خیانەت دەکەم، ئەگەر وانەبێت کەس بە شوێنی کەمپەکەمانی نەدەزانی هەروەها کەسیش پێی نەدەدۆزرایەوە".

"باشە ئەبێ کێ خیانەتی کردبێت؟"

"جگە لە هەڤاڵانی چاوساغ کەسی تر بە کەمپەکەمانی نەدەزانی".

"مەبەستت چییە؟"

ئیبراهیم کەوتە پێکەنین، بەڵام وەڵامی گۆرسێی لەم بارەیەوە نەدایەوە، دوایش پێیووت:

"سەرەتا کۆپتەری کەشفکردن هات، دوایش کۆبراکان، هەڤاڵ بیربکەرەوە، بۆچی بەبێ هیچ هۆکارێک کۆپتەر بەسەر دەربەندی ناکتاش بسوڕێنەوە".

"ئەگەر بەدران و هەڤاڵەکانی خیانەتیان بکردایە بە ئاسانی شوێنەکەمانیان ئاشکرا دەکرد، بەڵام هێرشیان بۆسەر هیچ چادرێکمان نەکرا، ئەمە مانای وایە کە شوێنی چادرەکانمان نازانن".

"راست دەکەیت".

عەگید بەئاگا هاتبۆوە، خۆی گەیاندبووە لایان، بەخەندەوەبوو، سەرەڕای هەموو ئەم دەردەسەریانەیان ئەم خۆشبەختییەی عەگید گورسێ و ئیبراهیمی

سەرسام کردبوو، گورسێ وتی "لەوە دەچێت کەیفت خۆش بێت؟ "ئەویش وتی "بۆهۆکار هەیە کەبێ کەیفم بکات؟ "ئیبراهیم بە پێکەنینێکەوە وتی "نییە! "پێکەنینە نەخوازراوەکەی سەرنجی عەگیدی ڕاکێشابوو، ئەو ئیبراهیمەی کەبەهۆی تەدبیرەکانێوەی هەموویانی نارەحەت کردبوو، ئەمجارەیان خۆی بە ئاسانی ڕاوکرابوو، هەرگیزیش ئەمەی قەبوڵ نەدەکرد، مانەوەیان لە شوێنێکی ئاوادا بەبێ ئامادەباشی و هیچ بەرگرییەک ناخی ئیبراهیم خواردبوو، دیار بوو عەگید هەستی بە ڕەوشی دەروونی ئیبراهیم کردبوو هەربۆیە دەیویست بیداتە پێکەنین، دوای ماوەیەک لە قسەکردن بۆگەڕانەوەی بۆناو سەنگەرەکەی عەگید خۆی قیت کردەوە و ڕۆی، بەڵام لەناکاو جارێکی تر بەخێرایی گەڕایەوە بۆلایان، ئەمە هەردووکیانی شڵەژان، ئیبراهیم پێیووت "چی بووە؟! "عەگیدیش پێیووت "لەپێشمانەوە سەرباز هەیە! "ئیبراهیم و گورسێ بەکاوخۆیان سەریان لە سەنگەرەکە بەرز کردەوە و تەماشای پێشی خۆیان کرد، سەرەتا هیچیان نەبینی، لەپێش ئیبراهیم گورسێ شتی بینی و بە ئیبراهیمی وت "بەڵێ سەربازو ادێن! "ئیبراهیمیش وتی "لەکوێن؟ ""شوێنپێیەکانی ئێمەیان کردۆتە نێوان خۆیانەوە! ""بینیم ". ئیبراهیم ڕووی لە عەگید کرد و پێیووت "بەبێ ئەوەی هەڵسیتە سەرپێ بەسەر ئەژنۆ بڕۆ و هەڤاڵان لەخەو هەڵسێنە، لەپێش هەمووشیانەوە دیار، هەتا ئێمە تەقە نەکەین کەس تەقە نەکات ". سەربازەکان بەکاوخۆیان دەهاتنە پێشەوە، تەماشای چەپ و ڕاستی خۆیان دەکرد و هەنگاویان دەنا، سەربازەکان بۆئەوەی وەک فلیمەکەی ڕامبۆ یان لێبێت ئەوەی لەدەستیان هاتبوو درێخیان نەکردبوو، بۆئەوەی پێیان لە بەفر گیرنەبێت لاستیکی پانیان لەپێ کردبوو، بەرگی سپی هی بەفریان لەبەردابوو، بەبێ ئەوەی هەست بکەن کە ٢٠٠ مەترێک لە دوژمنەکەیانەوە دوورن بەکاوخۆیان هەنگاویان دەنا، دەستنیشان کردنی سەربازەکان لەلایەن ئیبراهیم و گورسێوە زەحمەت بوو، سەربازەکان بە سێ قۆڵ دەهاتن کەناو بەری هەریەکەشیان ٥ مەترێک دەبوو، ئەگەر ڕێکری لە ڕێکردنەکەیان نەکرێت ڕێک دەهاتنە ناویانەوە.

گورسێ و ئیبراهیم هەناسەیان لەبەرخۆیان بڕی بوو، گورسێ پرسی "چی بکەین؟ ""لەچاوەڕوانی زیاتر هیچی تر ناکەین! "سەربازەکان بەردەوام بوون

له هاتنه پێشەوە، هەتا دەهات نێوانیان کەم دەبۆوە، لەناکاو سەربازەکەی پێشەوەیان ڕاوەستا و ئاوڕێکی دوای خۆی دایەوە، سەربازێکیان هاواری لێکرد و پێیووت "چی بوو؟ "سەربازەکەش وتی "گەورەم لێرە بەدواوە شوێن پێیەکان زۆر تێکەڵ و پێکەڵن! ""شوێن پێیەکان درێژ دەبنەوە؟ "سەربازەکە بە وردی تەماشای پێشی خۆی کرد، شوێن پێیەکان درێژ ببونەوە، بەڵام لەراستیدا ئەوەی بینی بووی شوێن پێی ڕۆیشتن و گەڕانەوەی گەریلاکان بوو، سەربازەکە بە بڕوابوون بەخۆیەوە وتی "بەڵێ گەورەم شوێن پێیەکان درێژ دەبێتەوە! "ئەفسەرەکەش وتی "زۆر باشە، لەوە دەچێت لێرە پشویان دابێت، تۆ بەردەوام بە لە ڕێکردن! "سەربازەکان کەوتنەوە ڕێکردن، قۆڵی ناوەڕاستی سەربازەکان ڕێک بەسەر ئەو سەنگەرەوە ڕێیان دەکرد کە ئیبراهیم و گورسێ لێ بوون، ئیبراهیم وتی "تۆ ئەوانەی خوارەوە منیش ئەوانەی سەرەوە دەکوژم "، گورسێ نیشانی لە سەربازەکانی خوارەوە گرت.

کاتێک ئیبراهیم کەوتە تەقەکردن گورسێ پێش ئەو سەربازەکانی خوارەوەی کوشتبوو، ئەو سێ سەربازەی لە پێشی پێشەوە بوون بەیەکەم تەقەی گەریلاکان کوژرابوون، سەربازەکان لەناو شڵەژاویدا بوون کە بەم لاوئەولای خۆیان ڕایاندەکرد، ٢ سەربازی تریشیان کوژرا، بەهۆی ئەو لاستیکەپانەی لە پێیان کردبوو نەیاندەتوانی بەباشی ڕابکەن، ئیتر هەموو تەختایەکە بە دەنگی تەقە هەژا، کاتێک سەربازەکان لە شوێنێک ڕادەوەستان بەبێ ئەوەی بزانن بۆکوێ بچن بە چەپ و ڕاستی خۆیاندا تەقەیان دەکرد، ئێرە بۆ سەربازەکان وەک دۆزەخی لێهاتبوو، لەناکاو بێدەنگییەک هاتە ئاراوە، هەمولایەک کپ بوو تەنانەت سەربازەکانیش تەقەیان نەدەکرد.

سەربازەکان کشابونەوە، بەڵام دوای ماوەیەکی تر جارێکی تر گەڕانەوە، گەریلاکانیش هیچیان پێنەدەکرا، شوێنەکەیان ئەوەندەی گۆڕێک بێدەنگی باڵی بەسەریدا گرتبوو، گەریلاکان کەوتنە چاوەڕوانییەوە، ئیبراهیم گوێی بۆئەم بێ دەنگییە ڕادێرابوو کە هەموویانی تاساندبوو هەروەها لەگەڵ خۆیدا مردنی هێنابوو، ئیبراهیم گوێی بۆ بیستنی هەناسەی سەربازەکان گرتبوو، ئەگەر شتێکی ببیستایە لەوانەبوو دڵی ئاوی بخواردایەتەوە، بەڵام ئیبراهیم جگە لە

گفەی با بەفراوێکەی بەردەمی گوێی لە شتی تر نەدەبوو ئەمەش بەتەواوەتی نیگەرانی کردبوو.

چاوەڕوانێکەیان کاتژمێرێکی خایاند دوایش بە ئاسمانەوە گوێیان لە دەنگ بوو، ئیبراهیم بە گورسێی وت "گوێت لێیە؟ "گورسێیش گوێی لێبوو، ئیبراهیم هاواریکرد "هەمووتان خۆتان مەڵاسدەن کۆبراکان هاتن! "هێواش، هێواش ترپە ترپ و گرمەگرمی کۆبراکان نزیک دەبوونەوە، هەموویان شارەزایی ئەم دەنگی کۆبرایانە بوون، لەناکاو چاویان بە ٤ کۆبرا کەوت، بەخێرایی بەسەر گەریلاکاندا تێپەڕین و گەڕانەوە، دوایش ئەوەهاتە ئاراوە کە چاوەڕێی دەکرا، موشەکەکانیان تەقاند. موشەکەکان ئەو ناوەیان کرد بە دۆزەخ، خوێن و بەفر و گڕ و دوکەڵ تێکەڵ بەیەک بوون، موشەکەکان کۆتاییەیان پێنەدەهات بەتەواوەتی ئەو ناوچەیان کرد بە دۆزەخ، ئەو شوێنەی موشەک بەری دەکەوت بەفر و خاک و پارچەی جەستەی خوێناوی لێ بەرز دەبۆوە، کاتێک کۆبراکان موشەکەکانیان بەتەواوەتی خاڵی کرد ئەمجارەیان بەچەکە دۆشکە ئۆتۆماتیکەکانیان کەوتنە تەقە کردن، هەر چوار کۆبراکە تەقەیان دەکرد، هەر فیشەکێکیان ئەوەندەی فیشەکێکی دۆشکەی ڕاستەقینە کاریگەر بوو.

دیار لە شوێنەکەی خۆیەوە هەستایە سەرپێ و بە هەموو توانایەکی خۆیەوە هاواریکرد وتی "تەقە لە پەروانەی کۆپتەرەکان بکەن". لوولەی هەموو چەکی گەریلاکان خرانە سەر پەروانەکانی کۆپتەرەکان. ئەمەش سودێکی ئەوتۆی نەبوو، ئەم تەقەکردنانەیان شێوازێکی کلاسیکانەبوو چونکە ئەم کۆبرا نوێیانە بە سیستەمێکی سەردەمیانە درووست کرابوون کە بە ئاسانی فیشەک کاریان لە باڵ و ژێر کۆبراکە نەدەکرد.

ئیبراهیم هاواری لە دیار کرد کەبەسەر پێوە نەوەستێت و دانیشێت، بەڵام دیار لەجیاتی ئەوەی خۆی لە زەوی درێژ کات تەماشای ئیبراهیمی کرد، دەیویست شتێکی پێبڵێت، بەڵام وادیاربوو ئارەزووی ئەمەی نەدەکرد. زاتەن بەهۆی تەقینەوەی موشەکەکان و دەنگی تەقەکان گوێیان وەک کەڕی لێهاتبوو، کەشوهەوا کەمێک تەمومژاوی بوو، لەرەوشێکدا بوون وەک ئەوەوابوو کە بەرەو مردن ملبنێن، ئیبراهیم هەموو ئەم کارەساتانەی بە چاوی خۆی

دەبینی و ناخی خۆی خواردبوو، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەم شتە ناخۆشانەش ڕووخساری نەگۆڕابوو، هەوڵی دەدا کە زاڵبێت بەسەر ئیرادەی خۆیدا هەروەکو ئێستای دیار کە ئەویش بەهەمان شێوەبوو.

دوای ئەوەی کۆبراکان هەموو موشەک و فیشەکەکانی خۆیان خاڵی کردەوە لە چاوان دیارنەمان، تاکو ئێستا نەدەزانرا کە کێ لە ژیاندایە و کێ شەهید بووە، ئیبراهیم ئەوەندە نیگەران و تاسابوو ئەوەندە شڵەژاو ببوو کە نەیدەزانی وردەکاری ئەم شتانە بهێنێتە زمان، ئیبراهیم لەدڵی خۆیدا دەیووت ئایا کەمێک لەمەوبەر ئەو جەستەیەی کە پارچە، پارچە ببوو هەڤاڵ دیار یان بوو؟ ئیبراهیم هێشتا بەتەواوتی هۆشی نەهاتبووە سەرخۆی جارێکی تر کۆپتەرەکان لەدوورەوە دەرکەوتن، ئیبراهیم لەسەرپشت لەسەر بەفرەکان خۆی درێژکردبوو، تەماشای هاتنی کۆبراکانی دەکرد، ئیبراهیم تەماشای لای چەپی خۆی کرد عەگیدی بینی، ئەویش تەماشای ئیبراهیمی کرد، ئیبراهیم لە چاوەکانی عەگید چەند شتێکی خوێندەوە کە پێی دەووت "هەمووی بەهۆی تۆوە ئەم کارەساتانە هاتنە ئاراوە"، کە ئیبراهیم بیری لەم شتانە دەکردەوە خوێن لەهەناوی نەچۆڕا، وەک بڵێی پێویستی بە یارمەتییە تەماشای دیاری کرد، دیار لەسەر نەژنۆ بوو سەرقاڵی تەقەکردن بوو، دوای ماوەیەک موشەکی کۆبرایەک دوکەڵێکی ڕەشی کرد و بەسەردەفەی شانی دیاردا تەقییەوە، ئەوناوەی پڕکرد لە دوکەڵ و دیار بەلادا هات، سەرەتا ئیبراهیم پێیوابوو لە خەیاڵدایە و دێوزمە یەخەی گرتووە، بەڵام کەبینی پارچە گۆشتی لەشی هەڤاڵ دیاری کەوتۆتە سەر بەدەنی وەک شێت و هاری لێهات، لەوەدەچوو کۆبراکە هێشتا دڵی ئاوی نەخواردبێتەوە دوای موشەکەکەی دەیان فیشەکی نا بە جەستەی دیارەوە، گورسێ بۆ ئامانجی بەرگیرکردن بە خشکان خۆی لە دیار نزیک کردەوە، بەڵام ئەو فیشەکەی بەر پشتی کەوت لەوێدا ئەویشی بەلادا خست، ئیبراهیم نەیدەتوانی هیچ بکات تەنها چاوی لە ڕووداوەکان بڕی بوو، جارێکی تر ئاوڕی دایەوە و تەماشای عەگیدی کردەوە، هێشتا سەرنجەکانی عەگید و خوێندنەوەکانی ناو چاوی نەگۆڕابوون، بەڵام لە زهنییەتی ئیبراهیمدا تەنها دیمەنی دیار هەبوو نەک بیرکردنەوە لە قسەکانی ناوچاوەکانی هەڤاڵ

عەگیدی، چەنێ هەوڵیدەدا نەیدەتوانی دیمەنی ساتی بەرکەوتنی موشەک بەدیاردا لەبەر چاوەکانی خۆی لابدات، لەوانەبوو تادوا هەناسەی ئەم دیمەنە وەک پەردەکەی سەر ڕووخساری مۆنالیزا لەبەرچاوانی لانەچوایە، لەوەدەچوو ئیبراهیم هەرگیز پارچە گۆشتەکانی جەستەی دیار و ئەو پارچانەی کەوتبوونە سەرشانی ئەم و بەرگە خوێناوێکەی و کۆبراکان لەبیر نەکات.

هەموو شتێک لەبەرچاوی ئیبراهیم هاتبوونە ناراوە، ئەویش بەبێ ئەوەی هیچی لەدەست بێت تەماشای کارەساتەکانی دەکرد، هێمنانە چاوەکانی لەیەک نا، کاتێک کۆبراکان موشەکیان تێدەگرت و تەقە هەموولایەکی گرتبۆوە ئیبراهیم بۆ ساتێکیش چاوەکانی هەڵنەهێنا، تەنها ئارەزووی ئەو ئەوەبوو کە موشەکێک بێت و بەدەنی ئەمیش پارچە، پارچە بکات، هەڵبەت بەلای ئیبراهیمەوە لەجیاتی ئەوەی بە چاوی خۆی پارچەبوونی جەستەی هەڤاڵانی ببینێتەوەو ئەو فیشەکانەش ببینێت کە چەقینە سەر دڵ و پشتی هەڤاڵانی مردن لەم حاڵەی باشتربوو چونکە ئازارێکی زۆری دەدا، نەیدەزانی ماوەی دەستڕێژەکانی کۆبراکان چەنێکی خایاندووە، بەڵام بێدەنگییەک هاتبووە ناراوە، کە چاوەکانی کردەوە کۆبراکان بە ئاسمانەوە نەمابوون، هەستی بەخۆی کرد کە هێشتا لە ژیاندایە، ڕاستە دەژیا، بەڵام لەهەمانکاتدا ناخی پڕبوو لە ئازار و ترس.

بەهێواشی لە شوێنەکەی خۆی قیتبۆوە، جەستەی پارچە پارچەی عەگیدی بینی، کەمێک لەمەوبەر چاوەکانی زیندوو ببون و لە ئیبراهیمیان دەڕوانی و بیری لە قسەکانی ناو چاوەکانی عەگیدی کردەوە، خەم دایگرت، عەگید لە پشتەوە لێیدرابوو، بە زەحمەتێکەوە بەرەو دیار ڕۆیشت، گورسێ بینی، کەوتەوە یادی کە چۆن گورسێ لەسەنگەرەکە فڕتەیەکی کرد کە بچێت بۆلای دیار، بەڵام مەخابن دەبوایە پێش گورسێ ئەوخۆی بگەهێنایەتە لای دیار، گورسێ بەسەر دەم درێژ ببوو، دەستی خستە پشت ملی و سورانێوەی و خستییە سەر پشت، چەند پارچەیەک گۆشتی جەستەی گورسێ کەوتە سەر بەفرەکە، شوێنی فیشەکەکان هەریەکەیان ئەوەندەی مشتێ جەستەی گورسێیان کوون کردبوو، لە دیار نزیک بۆوە، دیار لەسەر پشت کەوتبوو،

ئیبراهیم خۆی پڕانەگیرا و لەبەردەمی هاتە سەر ئەژنۆ، موشەکی کۆبراکە بەردەفەی شانی کەوتبوو، بە باڵیوەشی نیوەی ملی نەمابوو، چەند دەمارێک و پارچە گۆشتێک کە ئەوەندەی دەزوویەکی قەوی وابوون ملی بە جەستەیەوە هێشتبۆوە، چاوەکانی بە کراوەیی مابونەوە، بەو دوا ساتە چاو کراوەییەوە دیار شەهید ببوو، کەمێک دەمی کرابۆوە، لەوەدەچوو کە ویستبێتی شتێک بڵێت، تاماوەیەک ئیبراهیم لەسەر تەرمی دیار مایەوە، کەسەری بە چواردەوری وەرگێڕا سەرسام مابوو، هەموو شوێنێک پەڵە خوێنی بەسەرەوە بوو، قاچ و دەست و سەر و پارچەکانی تری جەستە بەو ناوە بڵاوببونەوە.

کاتێک هێلینی بینی کە بە پێوە بوو ویستی ڕابکات و باوەشی پێدابکات، بەڵام توانای هەڵسانی نەمابوو، ڕۆدیش بەپێوە بوو، دوایش ١٠ هەڤاڵێکی تری کەوتە بەرچاو کە هێشتا لە ژیاندابوون، ئیبراهیم بەمە دڵخۆش بوو، دەیویست هاواربکات، بەڵام ئەمەشی پێنەدەکرا، هێلین قۆڵی ئیبراهیمی گرت، ئەم دەستە هۆشی هێنایەوە سەرخۆی، هەستایە سەرپێ، لەناکاو چاوی بە جەستەی پارچە بووی مونزوور کەوت و دوایش جەستەی پارچەبووی ژیان و خەڵات و نەورۆزیشی کەوتە بەرچاو، لەهەمانکاتدا چاوی بە جەستەی پارچە بووی گەریلایەکی کەوت، بەڵام دەموچاوی لێوە دیار نەبوو، دوایش بەسرە چاوی بە قاچ و دەستی پەڕیو کەوت کە هەر پارچەیەکیان برینێکی لەدڵی ئیبراهیم دەکردەوە.

ئیبراهیم ئاوڕی لە هێلین دایەوە و بینی دەموچاوی هێلین خەڵتانی خوێنە، لە هێلینی پرسی "چەند هەڤاڵ لە ژیاندان؟ "هێلینیش وتی "نازانم"، ئیبراهیم چاوی بە چواردەوری گێڕا و ئەو هەڤاڵانەی ژمارد کە بە پێوەبوون، ١ و ٢ و ٥ و ١٠ و ١٢ بەڵێ ١٢ هەڤاڵ بە پێوەبوون، پاشان ئیبراهیم وتی "بزانن هەڤاڵانی سەر زەویەکە کێن؟ "هەموویان بڵاوبونەوە و ئیبراهیم بەسەر سەنگەرەکاندا گەڕا، توانیان ٧ بریندار بدۆزنەوە، ئیبراهیم وتی "با هەڤاڵە شەهیدەکانمان لە شوێنێک کۆبکەینەوە"، هەندێ شەهیدیان لەبەر پارچە، پارچە بوونیان نەیاندەتوانی هەڵیانگرن، ئیبراهیم ویستی گورسێ بەرزبکاتەوە، بەڵام پارچەیەکی زۆری تری گۆشتی لێکەوتەوە، ئیتر نەیتوانی دەستی لێبدات،

گەیشتە سەر جەستەی دیار، هێشتا چەکەکەی بەدەستەوە بوو، ویستی بە بەفر دایپۆشێت، چەکەکەی هەڵگرت، کە سەعاتەکەی بینی ئەویشی هەڵگرتەوە، ئەو جەستانەیان کۆکردەوە کە پێیان کرا ناشتییانیان و ئەوانی تریشیان بە بەفر داپۆشی.

ئیبراهیم هێشتا باوەڕی نەدەکرد کە ڕووبەڕووی ئەم کارەساتە دڵتەزێنە بونەتەوە، بەدرێژایی تەمەنی گەریلایەتی ڕووبەڕووی ڕووداو ببۆوە و زۆر لە هەڤاڵانیشی شەهید ببوون، بەڵام یەکەمجاری بوو کە ڕووبەڕووی کارەساتێکی لەم چەشنە ببێتەوە، لەپارچەی جەستەکاندا ئازار بەدەی دەکرا، بە شێوەیەک ئازاریانی دەدا کە هێنانەزمانی مەحاڵ بوو، ئیبراهیم لەهەڤاڵەکانی پرسی "چەند هەڤاڵمان شەهید بووە؟ "هێلین وتی "٣٦ "، ئەم ژمارەیە برینێکی تری سەختی لە دڵی ئیبراهیم درووست کرد، لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا ٣٦ شەهیدیان دابوو، کە پێکهاتبوو لە دیار، عەگید، گورسێ، مەزلوم، مونزوور، ژیان، نەورۆز، دەلیل، سامی، دۆغان، دەفران، سەڤاش و ڕۆژبین کە پێیان دەووت دەنیزە تورک هەروەها خەڵات، بەرخودان، شیار، غەمگین، شیار، ڕۆکەن، چیچەک و هەڤاڵانی تریان، ئیبراهیم و هەڤاڵانی ئامادەی ئەوەبوون کە هەموو شتێکی خۆیان بدەن کە تەنها ئەم کارەساتە لەخەو پێکهاتبێت، بەڵام مەخابن هەموو شتێک واقعیبوو، ئەگەر بیر لە خەیاڵیش بکرایەتەوە هەرنەدەگونجا چونکە شتەکان ئەوەندە لەبەرچاو بوون کە مەحاڵ بوون کە بتوانرێت پارچە جەستەکان بشاردرێتەوە، چاوەکراوەکەی دیار و دەمە پڕ لە خەندەکەی گورسێ و دوا نیگای عەگید بەس بوون بۆ ئیبراهیم کە قەناعەت بە ڕاستێکان بکات، بەڵێ ٣٦ هەڤاڵیان لەبەرچاویان جەستەیان پارچە، پارچە ببوو کە ئەی دیمەنی ( پەڵە خوێنی سەر بەفرەکان ) چۆن لەچاوان ئەسڕانەوە؟!.



ئاریا و ساریا هەستیان بە برسێتی خۆیان دەکرد، دەگەڕان بە شوێن خواردندا، ئاریا بەسەر ئەژنۆوە بە شێوەی کۆماوەیی لە لێواری زێیەکە ئەگەڕا بەدوای خواردندا، سارپاش لە سەنگەرەکەوە سەری خۆی دەرهێنابوو لە ئاریای دەڕوانی، ساریا لەوە دڵنیابوو کە ئاریا شتێک هەر دەدۆزێتەوە، بەڵام لەهەمانکاتدا نەیدەزانی کە چەنێکی پێ دەچێت.

ئاریا کەسێکی وریا بوو، هەمیشە ئەوەی بەدەست دەخست کە مەبەستی بوو، هەرچەندە وەک کەسێکی داخراو دەبینرا، بەڵام بەزەوق بوو، ئەمەش وای لە ساریا کردبوو کە ئاریای خۆش بوێت، ساریا پێویستی بە هاوکاری بوو، بەڵام ئێستا لەو ڕەوشەدا بوو کە دەیتوانی لەگەڵ ئاریادا درێژە بە ڕێگەی خۆی بدات، ساریا ئەوکاتەی لە قۆناغی ناوەندیدا دەیخوێند ئاریای ناسی بوو، ئەوکاتەی چووبووە ئەو قوتابخانەیە هەروەکو هەموو خوێندکارێکی نوێ هەستی بە جۆشوخرۆشی قوتابخانە نوێیەکەی و هاوڕێ نوێیەکانی کردبوو، کاتێک دەستی بە خوێندن کردبوو لەم قوتابخانە هەستی بە بۆشاییەک کردبوو، بەڵام ئەوکاتەی ئاریای ناسی بوو ئەم بۆشاییەی پڕکردبۆوە، هۆکاری یەکتر ناسینیان لەگەڵ ئاریادا بەهۆی بەڵای سەری قوتابخانەکەیانەوەبوو کە کچێک بوو بەناوی پەریخان، پەریخان ٣ ساڵ بەسەریەکەوە لەیەک پۆلدا مابۆوە و خوێندکارێکی تەمەڵ بوو، ئەم پەریخانە هەمیشە تەزبیحی بەدەستەوەبوو هەروەها لە گیرفانیشی چەقۆی هەڵدەگرت بە کورتێکەی کچێکی شەقاوە بوو، پەریخان ببوو بە بەڵای قوتابخانەکە، پەریخان لەناو خوێندکارەکاندا بە موختار ناوبانگی دەرکردبوو، هەرلەیەکەم ڕۆژی دەست پێکردنی قوتابخانە سەری نابوو بەسەر ساریاوە، ساریا بەبێ ئەوەی بزانێت بەشێوەیەکی نەزانانە لەسەر ڕەحلەکەی پەریخان دانیشتبوو، ئەمەش بەس بوو کە پەریخان بیکات بە هۆکار بۆئەوەی شەڕی لەگەڵدا بکات، کاتێک پەریخان ساریا دەبینێت لە شوێنەکەی دانیشتووە پێی دەڵێت هەستە ئەوێ شوێنی منە، سارپاش هەڵدەستێت و لە شوێنێکی تر دادەنیشێت، ساریا لەهەمبەر پەریخان مل کەچی کردبوو، کاتێک پەریخان بێ دەسەڵاتی ساریا دەبینێت هاواری بەسەردا دەکات

که لەوێش هەڵسێت و پێی دەڵێت کە ئەوێش شوێنی منە، هەرچەندە ساریا ئەمەشی پێناخۆش بوو، بەڵام بەناچاری لەوێش هەستا بوو، ئەمجارەیان چووبوو بۆلای ئاریا، پێیووتبوو لێرەش هەڵسە شوێنی منە، ئیتر ساریا وەک شێتی لێهاتبوو، بەم شێوەیە یان خۆی ڕادەستی پەریخان دەکرد و ملی بۆکەچ دەکرد یان نیشانی هەموو کەسێکی دەدا کە لە پەریخان ناترسێت، خۆیشی نەیزانی چۆن لەناکاو جانتاکەی بەرز کردەوە و بە هەموو توانای خۆیەوە کێشابووی بەسەری پەریخاندا، هەرچەندە پەریخان بەم لێدانە کەوتوبێتیش، بەڵام هەڵسابۆوە و گفەگفی کردبوو، ویستبووی پەلاماری ساریا بدات، بەڵام ئەمجارەیان ساریا بەتەنیا نەبوو ئاریاشی لەگەڵدابوو، پەریخان هەستی بەوەکردبوو کەلەهەقی هەردووکیان نایەت بۆیە ناچار مابوو کە هێور ببێتەوە، دۆستایەتی نێوان ساریا و ئاریا بەم شێوەیە دەستی پێکردبوو، تا قۆناغی ناوەندی و ئامادەییان بەیەکەوە تەواو کردبوو، کە قۆناغی ئامادەیی تەواو دەکەن هەردووکیان بڕیار دەدەن کە ببن بە گەریلا، کاکەی ئاریا کەلە زیندانە پێشنیاری کۆمەڵە کتێبێکی بۆ کردبوو کە بیخوێنێتەوە، بەم شێوەیە ئاریا لەگەڵ ساریادا کتێبەکانیان خوێندبۆوە کەلەبارەی چۆنیەتی ژیانی گەریلاوە زانیاریان بەدەست خستبوو ئێستاش لە هەمان سەنگەردا بەیەکەوە ڕوبەڕوی یەک قەدەر ببونەوە.

ساریا خۆی لە بیرەوەرییەکان تەکاند و ڕووی کردە ئاریا، ئاریا بەجەستە بچکۆلە بوو، خۆی لە زەوێکە خشاندبوو بەرەو سەنگەرەکە دەهاتەوە، کەمپەکەیان کش و مات بوو هیچ سەربازێکیان لێوەدیار نەبوو، کە ئاریا گەیشتەوە ناو سەنگەرەکە مشتێک گیای لە گیرفانی دەرهێنا و دای بە ساریا، ئاریا پێیووت "بیخۆ بەسوودە"، ساریاش کەمێکی خستە دەمێوەی و جووی و هیچ تامێکی نەبوو، ساریا پێیووت "ئەمە چییە ژەهراویمان نەکات؟!" ئاریا پێکەنی و پێیووت:

"مەترسە هیچ نابێت، ئەوە ڕووەکە هەڤاڵ بەرچەم نیشانی دابووم، ئەگەر شتێکمان لێبێت هەڤاڵ بەرچەم بەرپرس دەبێت!"

"باشە چۆنت ناسیەوە خۆلێت تێکنەچووە؟"

"مەترسە بەمە دەڵێن کوزەلە ".

کاتێکساریا بینی ناریا بەبێ هیچ دوودڵییەک خەریکی خواردنێتی ئەویش دەستی کرد بە خواردنی، تینویان بوو، بەڵام ئاویان پێنەبوو، بۆپەیداکردنی ئاو دەبوایە بچونایەتە سەر زێیەکە، ساریا وتی "تۆ بڵێی ئەگەر بچین بۆ زێیەکە ئاو بخۆینەوە تووشی هیچ نەبین؟ "ناریا بە توڕەبونێکەوە تەماشای ناو چاوانی سارپای کرد، ساریا چاوی خۆی لەئاستی ڕوانینەکەی ناریا لادا، کاتێک ناریا هەستی کرد کە ساریا خۆی بە تاوەنبار دەزانێت پاشان خۆی نەرم کردەوە.

ناریا بە سارپای وت "پێڵاوەکانی خۆتم بەرێ "، سارپاش بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک پێڵاوەکانی لەپێی خۆی داکەن و داییێ، ناریا پێڵاوەکانی سارپای هەڵگرت و خۆی شۆڕکردەوە، ئەگەر دوژمنەکانیان ناریایان لە زێیەکە ببینیایە ئەمە بەمانای کۆتایی ژیانی هەردووکیان دەهات، ناریا لە ئاوی زێیەکە بەباشی پێڵاوەکانی خۆی و سارپای شۆری، هەردووکیانی پڕ کرد لە ئاو، ویستی بچەمێتەوە و خۆیشی ئاو بخواتەوە، بەڵام پەشیمان بۆوە، بە کۆماوەیی جارێکی تر هەڵگزایەوە بەرەو سەنگەرەکەیان، کاتێک گەیشت و ساریا ئاوی ناو پێڵاوەکانی بینی تاساو پێیووت "لەمەدە ئاو بخۆینەوە؟ "ناریاش بە پێکەنینێکەوە وتی "نا کەمێکی تر خزمەتگوزاری دەست پێدەکات! "سەرەتا ناریا ئاوی ناو پێڵاوەکەی خواردەوە پاشان سارپاش.

هەردووکیان دەنگیان لێبڕا، چواردەوریشیان ئارام بوو، ئەم بێدەنگییە ترسی خستبووە ناخیانەوە، بەجێهێشتنیان یان لەبیرکردنیان لەلایەن هەڤاڵەکانیانەوە ئازاری دەدان، هێشتا لەوەش حاڵی نەبوون کە ئایا بۆچی بەتەنیا جێیان هێشتوون، هەرچەندە هەردووکیان بەمە زۆر غەمگین ببوون، بەڵام ئەم هەستەیان دەرنەدەبڕی، هەرجارێک بێتاقەت بونایە ئەو شتەیان دەکرد کە کردوبویان، جارێکی تر دەستیان کردەوە بە خوێندنی کتێبەکە کەلە بەشی دووەمدا وازیان لە خوێندنی هێنابوو، دەستیان کردەوە بە خوێندنی کتێبەکە:

( بەشی دووەم )

( هۆیەکەی نازانم لەبەرچییە وشەی ئاڤگاسۆر دڵم دادەخورپێنێت. چی کاتێک لەم ئاوە دەڕوانم هەست بە گریان دەکەم. نازانم بۆ ڕابوردو دەگریم یان داهاتوو. بەڵام هەست بە گریان دەکەم. لەناخمدا دەنگێک پێم دەڵێت ( بۆحاڵی خۆت دەگریت؟). کاتێک بیر لەوە دەکەمەوە کە بۆچی تراژێدیاکان لەناخەوە کاریگەری دەکەنە سەر مرۆڤ، ئەو گریانەی هەستی پێدەکەم بەسە بۆ حاڵی بوون لەماناکەی. ئاسەوارە کۆنە دڵتەزێنەکان داهاتووی مرۆڤ دەست نیشان دەکەن. هەمیشە پێموابووە ئەوەی لەئاستی ئەم ئاسەوارە دڵتەزێنانە نەگرین کەسانی خۆپەرستن. لەڕاستیدا هەمووکەس لەناخی خۆیدا دەگری. هەست بە هەموو ئازارێک دەکات. بوون بە قارەمان لە سرووشت و ناخی هەموو کەسێکدایە. ئەمەش هەروەکو قانونی زۆرەملێی سرووشتە. هەموو ئەمانەش پاشکۆی باشی و جوانی ناخی مرۆڤ نییە. ئەوانەی لەو جوانی و باشییە بە دوورن مەخابن دەبنە قارەمانی تراژێدیاکان. لەهەمانکاتدا جوانی و خراپکاری و تراژیدیا تێکەڵی ترسی ناخی ئەو جۆرە مرۆڤانە دەبن. ئەم ترسەش لەناخی خۆیدا ئەژێنێت. ئەو جۆرە کەسانەی کە یەکێکیان قارەمانی جوانیکانە و ئەویتریان قارەمانی تراژێدیەکانە لەناو ترسی ناخی خۆیاندا یەکێکیان پێدەکەنێت و ئەوی تریان دەگری.

کاتێک بە هەورازەکانی ئاڤگاسۆر هەڵدەگژاین هەرچییەکم دەکرد نەمدەتوانی لەو هەموو ئەندێشانەم خۆم قوتار بکەم. خەریک بوو ئەندێشە و ترسەکانمان بمانتاسێنێت. کاتێک گەیشتینە زێیەکە کەناوی ڕەنگول بوو کەمێک پشوماندا. لەبەرئەوەی ئەم زێیە بەرەو ئاڤگەسۆر درێژ دەبۆوە لە دۆزینەوەی شوێنی چوون بۆ ناو ئاڤگەسۆر نارەحەتیمان نەدەچێژت. ئێرە شوێنێکی خۆش بوو. بەڵام سەرەڕای ئەوەی شوێن پێشمان دیار بوو. بەڵام هێزی دوژمن بەدواماندا نەهاتبوون. سەرەڕای ئەمەش بەقەدپاڵی دارستانە چڕەکەی سەرووی زێیەکەوە چەند ڕۆژێک ماینەوە. چەند ڕۆژێکمان بەسەربرد. بەڵام ڕوبەروی هیچ مەترسییەک نەبوینەوە.

ڕاستەوخۆ کەمپێکمان درووست کرد. لەهەمانکاتدا هەڤاڵ قارەمانمان فیداکارترین کەسی ناومان بوو هەروەها بۆ هەموومان ببوو بە سەرچاوەی بەرزی مۆراڵمان. چادرەکانمان هەڵدا. حەشارگەکانمان ئامادەکرد. بەم شێوەیە لەکاتی بۆردۆمانی ئاسمانی لە ڕێگەی ئەم حەشارگەیانەوە خۆمان دەپاراست. ئێستا تەنها یەک کێشەمان هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە ئەو شوێنەی لێی هەڵگیرسابوینەوە هیچ کۆگایێکی ئازوقەمانی لێنەبوو.

دەبوایە ئازوقەمان پەیدابکردایە. زاتەن گەورەترین کێشە کە مێشکی قارەمانی جەنجاڵ کردبێت ئەمەبوو. لەهەمبەر ئەو شوێنەی کەمپەکەمان لێ درووست کردبوو بارەگایەکی کۆنی چۆڵکراو هەبوو بەناوی ڕەنگۆل. پێشوتر لەبەرئەوەی زوو. زوو هێزی گەریلا هێرشیان دەکردە سەر ئەم بارەگایە بۆیە هێزی دوژمن ناچار مابوون کە ئەم بارەگایە چۆڵ بکەن. ئەوەی ناو مێشکی قارەمانی جەنجاڵ کردبوو ئەوەبوو ئایا لەناو ئەو بارەگایەدا ئازوقە هەیە یان نا. چەندینجار شاهیدحاڵی ئەوەببووین کە دوژمن لەناو ئەو بنکە سەربازیانەی چۆڵیان دەکرد لەدوای خۆیان ئازوقەیان بەجێدەما. دوای ئەوەی ٥ ڕۆژ بوو لێرە گیرسابوینەوە قارەمان بۆئەوەی دڵی ئاوبخواتەوە چەند گەریلایەکی نارد بۆناو بارەگاکە بۆ ئەوێ بزانن ئازوقەی تێدایە یان نا. هەڤاڵان دڵگەش و جوان بۆئەنجامدانی ئەم کارە گونجاوترین کەس بوون، هەردووکیان خاوەن ئەزموون بوون، ئەوانیش ڕێزان و بەرخودانیان هەڵگرت و چوون بۆ بارەگاکە.

هەموو هەڤاڵان لە کەمپەکە سەرقاڵی کارکردن بوون. هێشتا دەست نەکرابوو بە خولی پەروەردە. ئێمە هێشتا سەرقاڵ بووین بە ئاشکراکردنی نهێنێکانی دەوروبەرمان، کوون و چاڵ و شوێنە شاراوەکانمان پشکنی. زاتەن لەهەر شوێنێک بگیرسابینەوە یەکەم ڕۆژ خۆمان سەرقاڵی ناسینی دەوروبەرمان دەکرد.

بەرچەم دیارنەمابوو وەکو پیشەی هەموو جارێکی ئەمەی زوو، زوو دووبارە دەکردەوە. دەمەوئێوارە بەرچەم بەخۆی و بزنە کێویەکەوە خۆی گەیاندەوە کەمپەکە. هەموو هەڤاڵانیش بە چواردەوریدا ماخولانیان بوو.

سەرەڕای ئەوەی ئەم بزنە کێویە تەمەنی ساڵێکیش دەبوو کەچی ڕاینەدەکرد، بەگوێرەی قسەی بەرچەم بێت بزنە کێوێکە قاچێکی شکاوە و چاوەکانیشی کوێرن. زۆربەی هەڤاڵان لەخەیاڵی سەربڕین و خواردنی گۆشتی ئەم بزنە بوون، بەڵام دوای بۆماندەرکەوت کە ئەمە مەحاڵە. هەرلە یەکەم ساتدا بەرچەم ئەوەی ڕاگەیاند کە بووە بە دایکی ئەم بزنە کۆرپەلەیە. بەناچاری ئەمەمان قەبوڵ کرد، بەڵام کێشە گەورەکە ئەوەبوو کە بەرچەم چۆن سکی ئەم بزنە کۆرپەلەیەی تێردەکرد، بزنەکەش بۆچاک بونەوەی پێویستی بە شیر بوو. هەموو ئەمانەش قسەی بەرچەم بوون. ئێمە نە شیر و تەنانەت پارویەکیشمان پێپەیدا نەدەکرا کە سکی خۆمانی پێتێر بکەین. کاتێک هەموومان برسیمان بوو کە قۆڕەی سکمان دەهات ئەم بیر و بۆچونانەی هەڤاڵ بەرچەم ببووە مایەی گاڵتەجاری زۆربەی هەڤاڵان.

لەرۆژی یەکەمدا بەرچەم هیچی پێپەیدا نەکرا کە بیدات بە بزنە کێوێکە، بەڵام هەندێک پیلانی لە مێشکدابوو. ئێمە چاوەڕێی گەڕانەوەی هەڤاڵ دڵگەش و جوان بووین، بە گشتی خواردنەکانمان بەشی ٤ یان ٥ ڕۆژێکی دەکرد ئەو خواردنانەشمان پێکهاتبوو لە تۆراغ. لەوکاتەی هەموومان لە چادرەکاندا بووین و سەرقاڵی قسە و باس بووین بەرچەم خۆیکرد بەناو چادرەکەدا و دەمووچاوی بەیەکدابوو. هەواڵی باش و خراپیشی پێداین. هەواڵە باشەکە ئەوەبوو کە هەڤاڵان لە بارەگاکە گەڕابونەوە. هەواڵە ناخۆشەکەش ئەوەبوو کە ئازوقەیان نەدۆزیبۆوە. ئەم هەواڵە سەرودڵمانی گرت، ئەو ئومێدەی خۆمانمان پێوە گرێدابوو هەموو گرێکانی کرانەوە و لێمان ڕەوینەوە. سەرلەنوێ هەڤاڵ قارەمان پیلانسازی نوێی کردەوە، قارەمان بڕیاری دابوو کە هەڤاڵان باران و سیپان و سەرحەد بچنە گوندی مەرخۆ کە لێمانەوە نزیک بوو، دەمانویست لەو گوندە ئازوقە بەدەست بخەین.

دەمەوێت لێرە باسی نهێنییەک بکەم، گەنگەشە لەبارەی ناڕەحەتی برسێتییەوە هەمیشە منی شەرمەزار کردبوو، بەردەوام برسێتی بەلایەنێکی لاوازی لەقەڵەمدەدرا، هەرچەندەزۆر قینم لەم برسێتییە دەبۆوە ئەوەندەش

لەهۆکارەکەی، زۆرجار بینیومە کە برسێتی مۆڕاڵی خراپ کردووە و هەرەسی بە مرۆڤ هێناوە و مرۆڤ بەرەو بێ ئومێدی دەبات، با نمونەیەکی خۆم بهێنمەوە، برسێتی لەوانەیە بە شتێکی هاکەزایی ناوزەند بکرێت، بەڵام بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەیت ناخت دەخواتەوە و لەهەمانکاتدا ئەگەر زۆر لە خۆت بکەیت بۆئەوەی کە هەست بە دێوزمەی ناو ناخت نەکەیت ئەمە لە هەموویان زیاتر زەحمەت ترە. کەچی لەهەمانکاتدا هەستی هاوبەشی هەمووشمان بوو، هەموومان هەستمان بەم ئازارە دەکرد، بەڵام یەککاتدا هەموومان هەوڵمان دەدا کە کەس هەست بەمە نەکات. بێگومان کێشەی ئێمە تەنها برسێتی نەبوو، کێشەکانمان بەسەریەکدا کەڵەکەیان کردبوو، کێشەی هەرە گەورەی ئێستامان کە هەموومانی بەسەرخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو بێشک ئەسپێکانی لەشمان بوو، نەسابونمان هەبوو نە دەشمانتوانی خۆمان بشۆین، هەتا لەهەمبەر ئەسپێکان لاواز ببوینایە لەشمان زیاتر چەور دەبوو، لەشمان بەهۆی چڵکنی و ئەم ئەسپێیانەی لەشمان کە پێمان دەووت چەتە حەوسەڵەمان نەمابوو، سەرەڕای ئەوەی هەفتەیەکیش بەسەرچوو بوو ئەو هەڤاڵانی ڕەوانەمان کردبوون بۆ گوندەکە هێشتا نەگەڕابوونەوە، نەهەواڵی ئەوانمان دەزانی و نە ئازوقەشمان پێ گەیشتبوو، ئێستا دەردی ئێمە لەبەر نەبوونی ئازوقە و پەیداکردنی نەبوو، بەڵام زیاتر دڵمان لەلای هەڤالان بوو، مەراق و گومان ئازاریان دەداین، هەڤاڵ قارەمان بیری لە گریمانەکان دەکردەوە و ئەو پێیوابوو کە لەوانەیە کە جارێکی تر کەمپەکەمان کەشف بوبێت، ئێمە کەلە هەموو بوارێکەوە حەوسەڵەمان نەمابوو ئێستاش گریمانەی ئەوەی لەوانەیە شوێنی کەمپەکەمان بگۆڕین زیاتر ناڕەحەتی کردبووین، بۆئەوەی گریمانە و ئەگەرەکانی ناو مێشکمان نەمێنێت قارەمان بڕیاریدا کە دوو هەڤاڵی تر ڕەوانەی گوندەکە بکات، ئەو دوو هەڤاڵەی ڕەوانە دەکران بەرخودان و شێخ مووس بوون، هەردووکیان لەسەرخواستی خۆیان هەڵبژێردرابوون، ئەم خواستە لەرەوشی ئاوادا زیاتر بە ئومێدەوە گرێدەدرا، ئەم ئومێدەش تەمومژی گریمانەکانی ناو هزر ئەڕوێنێتەوە، ئەمە وەک تیشکی خۆر وایە کە تاریکی ناهێڵێت.

بەرخودان تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو، بەجەستە لاوازترین هەڤاڵی ناومان بوو. سەرەڕای ئەوەی شەرمن و کەمدوو بوو، بەڵام موتەوازێکەی وایلێکردبوو کە خۆشەویست ترین هەڤاڵی ناومان بێت. بەڕووی هەموو کارێکدا دەچوو هەروەها کام کار زەحمەت بوایە ئەو پێشەنگی دەکرد. بەرخودان دونیایەکی سنوردار و سادەی هەبوو. لەبەرئەوەی خەڵکی دەرسیم بوو شارەزای ناوچەکان بوو. تەنها ئەو شتەی کە سکاڵای لێدەکرد ئەسپێکانی ناو لەشی بوون. ئەسپێ هەموو شوێنێکی لەشمانیانی داگیر کردبوو. ئەوەندە لەداخی ئەسپێ خۆی خوراندبوو هەموو لەشی خۆی بریندار کردبوو. کاتێک بەڕێکەوت بۆ گوندەکە بێ حەوسەڵەیی و ماندویی بە سیمایەوە دیاربوو. ئومێدەکانی ناو چاوانی ئاسەواریان نەمابوو. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش دەستبەرداری فیداکاری نەبوبوو. شێخ مووسیش لەهەموو ئەم بوارانەوە شانی لە شان بەرخودان دەدا. دەتوانرێت بوترێت ڕەوشی هەموو گەریلاکانی کەمپەکە وەک یەک وابوو. کاتێک بەڕێکەوتن بەرەو گوندەکە جارێکی تر کەوتینە چاوەڕوانییەوە. بێگومان خۆمان بۆ سوپرایزی نوێ ئامادە کردەوە. بەرچەمیش سەرقاڵی بزنە کێوێکەی بوو. لەلایەکی تریشەوە بەرچەم ئەو تۆراغەی دزیبوو کە بۆ هەڤاڵانی نەخۆش تەرخان کرابوو. ئەمەش هەموو هەڤاڵانی کەمپەکە پێیان زانی بوو. تۆراغەکەی لەگەڵ ئاودا شڵەقاندبوو. کردبووی بە ماستا و دابووی بە بزنە کێوێکە. بەم شێوەیە هەموومان لەبەرچەمەوە فێربووین کە بزنە کێویش ماستاو ئەخواتەوە. سەرەڕای هەموو نەبونیەکانمان کەچی بەرچەم لەپێناو بزنە کێوێکە ئەوەی لەدەستی بهاتایە دەیکرد. دیاربوو بزنە کێوێکەش هەستی بەمە کردبوو هەربۆیە دەکەوتە دوای بەرچەم. بزنە کێوێکە لەبەردەم حەشارگەکەی هەڤاڵانی کچان دوورنەدەکەوتەوە. بەبۆنکردن بەرچەمی دەناسییەوە.

ڕۆژێکیان ڕووداوێک هاتە ئاراوە کە بەرچەمی شێت و هار کرد ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە بەرچەم و بزنە کێوێکە زۆر بەیەکتری ڕاهاتبوون. بزنەکە دیارنەمابوو. بەرچەم هەموو کەمپەکەی بۆگەڕا. سەرەڕای ئەوەی هەڤاڵانیشی هاوکاریان کردبوو. بەڵام بزنەکە نەدۆزرایەوە. ڕۆژی دوایی

بەرچەم هەڤاڵ گوڵیزاری لەگەڵ خۆی بردوو بەرەو ئاڤگەسۆر بەرێکەوتن، کاتێک دەگەنە پشتی کەمپەکە دەبینن کە بزنەکە بە دارێکەوە بەستراوەتەوە، بەرچەم لەترسی بوونی دوژمن ڕاستەوخۆ نەچوو بۆ ئەو شوێنە. بەڵام لە مێشکی خۆیدا پیلانێکی زۆر ستراتیژی کێشابوو، ئەم پیلانە ئەوەندەشەیتانانە بوو مەحاڵ بوو کەس نەکەوێتە داوەکەیەوە. کە گەڕایەوە بۆ کەمپەکە وتی کە بزنەکەی نەدۆزیوەتەوە. بەڵام ئەوەی کەمایەی نیگەرانی بوو ئەوەبوو کە هەردووکیان دەیانووت دۆزینەوەی بزنەکە زۆر گرنگ نییە، بەرچەم ئەم نەدۆزینەوەیە و گرنگ نەبونەکەشی بە هەموو هەڤاڵانی کەمپەکەی وتبوو، بەڵام بەرچەم ڕۆژی دوایی بەیانی زوو بۆسەی لەلای بزنەکە دانابوو. هەتا نیوەڕۆ چاوەڕوانی کردبوو. بەرچەم بیری لەوە دەکردەوە کە هەر دەبێت یەکێک پەیدا بێت بۆئەوەی بزنەکە بەرێت. بۆچونەکەی بەرچەم ڕاست دەرچوو، دوای نیوەڕۆ هەڤاڵ هاروون زۆر بە شێنەیی هاتبووە ئەو شوێنەی کە بزنەکەی لێبەسترابۆوە. کاتێک هاروون لە بزنەکە نزیک دەبێتەوە و دەیەوێت بیکاتەوە بەرچەمیش هاواری کردبوو تەسلیم بە گرتنم. هەڤاڵ هاروون بەبێ ئەوەی تەماشای دواوەی خۆی بکات هەڵاتبوو. خۆی گەیاندە کەمپەکە. بێگومان بەرچەمیش بەدوایدا. خواست و ئاواتەکەی بەرچەم هاتەدی و بە بزنەکەی شاد بۆوە. زاتەن ئەمەش لە هەموو شتێک بۆئەو گرنگتر بوو.

دوای دوو ڕۆژ هەڤاڵ بەرخودان و شێخ مووس گەڕانەوە بۆ کەمپەکە، ئەو هەواڵەی لەگەڵ خۆیاندا هێنابویان جەرگی هەموومانی بڕی. زۆر مەخابن هەرسێ هەڤاڵەکەمان دەکەونە داوی ئیخبارچێکانی گوندەکەوە و هێزی دوژمن هەرسێکیان بەدیلی دەگرێت. لەبەرئەوەی لەژێر ئەشکەنجەدا دانیان بەخۆیاندا گرت بوو هیچ نهێنیەکیان لەبارەی ئێمەوە نەدرکاندبوو هێزی دوژمن لەبەرچاوی خەڵکی گوندی مەرخۆ گوللە بارانیان کردبوون، ئەم بەسەرهاتە ئەوەندە جەرگ بڕبوو هەموو هەڤاڵانی ئەم هەرێمە ئەو ڕۆژەیان لەیاد نەدەچۆوە.

رووحی چەپەڵی ڕێبەر وەک تارماییەی ڕەش بەسەرمانەوە بوو. ( ڕێبەر

ئەو زاتەیە کە خیانەتی لە سەید ڕەزا دەرسیمی کرد کە مامی خۆی بوو. .. وەرگێڕ ). ئێمە نەماندەتوانی تەحەمولی شەهیدبوونی هەڤاڵ سیپان و گرووپەکەی بکەین. هەڤاڵ قارەمان بۆنەنجامدانی کۆبونەوە هەموومانی کۆکردەوە، لە دەنگ و سیمایدا ئازاری ئەم کارەساتەی پێوە دیاربوو، قارەمان باسی چیرۆکی ڕێبەری بۆکردین، نامەوێت هەموو قسەکانی قارەمان لێرە باس بکەم. بەڵام قارەمان بە کورتی وتی "ئەو چیایەی دەیبینن بە چیای ئاڤگەسۆر خۆی دەبەستێتەوە، لە هەمبەریشیدا زێی لاچ هەیە، سەردەمانێک لە ناو ئاوی ئەم زێیانەی ئێرەدا خوێن خوڕەی دەهات، پڕبوو لە لاشەی مرۆڤ، هۆکاری هەرە گەورەی ئەم کۆمەڵکوژیانەی هاتبوونە ئاراوە بێشک خیانەت بوو. لەساڵی ١٩٣٨ برازایەکی سەید ڕەزا دەرسیمی هەبوو بەناوی ڕێبەر، ئەویش وەک خەڵکی ئەم گوندەی ئێستا لەگەڵ دوژمن دەست تێکەڵ دەکات، لەبەرئەوەی زوو کەشف ببوو لەسەرەتا زەرەرێکی ئەوتۆی بەسەید ڕەزا نەگەیاندبوو، بەڵام دەوڵەت هانیان دابوو بۆئەوەی کەچۆن نەتوانێت خیانەتی گەورە ئەنجام بدات، لەئاکامدا ڕێبەر نامەیەک بۆ سەید ڕەزا دەنوسێت، لێی دەپاڕێتەوە، بۆی نووسی بوو کە هەردوو دەستەکانی ماچدەکات و هەڵەی کردووە و تازەبەتازە هۆشی هاتۆتەوە سەرخۆی و باشتر دوژمنی ناسیوە و هەڵیان خەڵەتاندووە و ئەگەر هەلێکی بداتێ ئەوە دەیەوێت سەرلەنوێ لەهەمبەر دوژمن بجەنگێت، ڕێبەر لەنامەکەیدا هەوڵی دابوو کە بەزەییان پێیبێتەوە، لەبەرئەوەی باشی دەزانی کە کورد بە بەزەیین و سۆزەکین داوای لێبوردن و بەخشینی کردبوو، کارمەندانی دەوڵەت دەیانزانی کە کورد کەسانێکی خۆشباوەڕن و سادەن و زوو هەڵدەخەڵەتێنرێن، ڕێبەر کە ئەم نامەیەی کە لەگەڵ دوژمندا نوسیبووی دەیزانی کە ئەنجام وەردەگرێت، لەراستیدا سەید ڕەزا باوەڕ بەم نامەیە ناکات، بەڵام پیاوە ماقوڵانی نزیک لە سەید ڕەزا دێنە بەینیانەوە، لەئاکامدا بڕیار دەدرێت کەلە ڕێبەر خۆش بن و بگەڕێتەوە ناویان، ڕێبەریش باشی دەزانی کە دەبێت ئەم هەلە بەباشی بقۆزێتەوە، دەبوایە گەمەکەی گەورە بکردایەتەوە، پیلانیان ئەوەبوو کە زیاتر سەرکردەکانی

شۆڕشەکە بە ئامانج بگرن، یەکێک لەسەرکردەکانی ناو شۆڕشەکەی سەید ڕەزا کە هەدەفی سەرەکیان دەبێت ئەویش عەلی شەر بوو، ڕێبەر بەخۆی و ٧ پیاوێوەی ئەچن بۆ حەشارگەکەی چیای توژیک، ڕوبەروی عەلی شەر دەبنەوە، پێی دەڵێن کە بۆ میوانی و چای خواردنەوە هاتوون، بێگومان خزمەتکردنی میوان نەریتێکی کوردەوارییە، عەلی شەر لەکوێ بزانێت کەلە ماڵی خۆیدا بەرخەنجەری دەدەن، کاتێک پشتیان تێدەکات ڕێبەر و پیاوەکانی هێرشی بۆدەبەن، خائینەکان بێ غیرەت بوون چونکە لەدواوە لێیان دابوو، خائینەکان هەمیشە لە پشتەوە دەست ئەوەشێنن، خائین وەک مار وایە، ویژدانی نییە، ماف ناناسێت، عەلی شەر خەڵتانی خوێن دەبێت و لەوێدا درێژ دەبێت، ژنەکەی عەلی شەر کە ناوی زەریفەیە کە مێردەکەی دەبینێت لەناو خوێندا چەکەکەی هەڵدەگرێت و ئەیەوێت تەقەیان لێبکات، بەڵام خیانەت سنوری نییە زەریفەش دەکوژن، بەم شێوەیە زەریفە دەبێتە سومبوڵی بەرخودانی ژنانی کورد.

ڕێبەر تەنها بە کوشتنیش دانامرکێتەوە، سەری هەردووکیان ئەبڕێت و ئەیانێرێت بۆ شارۆچکەی ئێلازخ بۆ ئەفسەر عەبدوڵڵا ئاپلدۆغان کە ئەندازیاری کۆمەڵکوژی دەرسیم بوو، ڕێبەر دەبێت بە سومبولی خیانەت، ئیتر ڕێبەر دەبێت بە قەسابی مرۆڤ و کاری ئەو دەبێت بە پیاو کوشتن و لەگەڵ دەوڵەتی تورکدا کۆمەڵکوژی سەر گەلی کورد ئەنجام دەدات، چیای ئاڤگەسۆر شوێنی ئەو کۆمەڵکوژیانەیە، ئاوی ئاڤگەسۆر کەلە نێوان ئەو دوو چیایەدا خوڕەی دێت ئەوێ و چواردەوری دارستانەکەش پڕە لە ئێسک و پروسکی ئەو کوردانەی کە کۆمەڵکوژ کراون، تاکو ئێستاش دەتوانرێت سەنگەرەکانی ئەو شۆڕشگێڕانە بدۆزرێتەوە، ٦٠ ساڵە ئاسەواری ئەوان تاکو ئێستاش ماوە، ڕێبەر و ئێستاش خائینەکانی گوندی مەرخۆ خوێنی هەزارەها شۆڕشگێڕیان ڕشتووە، ئەوکاتە و ئێستاش زێیەکان خوێنیان لێدەچۆڕی و زێی لاچش پڕکرابوو لەلاشەی خەڵکی، ئەم چیا و زێیانە خیانەتێکی زۆری ڕێبەر و نمونەی ڕێبەریان بینیوە، ئێستاش لەم ڕۆژگارەماندا ئێمە و چیا و زێیەکان جارێکی تر بووین بە شاهیدی خیانەت

لێکردنی هەڤاڵ سیپان و هەڤاڵەکانی، سەرلەنوێ نەوەکانی ڕێبەر خیانەتیان هەڵبژاردەوە. بەڵام عەلی شەر و زەریفەکان هەمیشە چیاکانیان کردووە بە وارگەی خۆیان، ئەم چیایانەش هاوشانی خیانەت بەرخودانیشیان بەچاوی خۆیان بینیوە. خیانەت تاعونێکی کوشندەیە کەلە کۆتایدا خۆیشی لەناو ئەبات هەروەکو کۆتایی ڕێبەر. هەروەکو چۆن ڕێبەر لەئاکامدا بەتایبەتی لەلایەن ئەفسەر عەبدوڵلا ئالپدۆغانەوە کوژرا و گوولله بارانی کرد، بێگومان لەبەرئەوەی خزمەتی بە دەوڵەتی تورک کردبوو بەشێوەیەکی بەرچاویش بەشداری لە کۆمەڵکوژی دەرسیم کردبوو سەرەتا خەڵاتیان کردبوو پاشان گولله بارانیان کرد. ئەفسەرەکە لەناوچەی تەشتوک پێش ئەوەی ڕێبەر و کوڕەکەی بکوژێت پێیان دەڵێت "ئەوەی کە سودبەخش نەبێت بۆ میللەتەکەی خۆی چۆن ئەتوانێت سوود بەمن ببەخشێت؟!"

کاتێک هەڤاڵ قارەمان کۆتایی بە قسەکانی هێنا هەڤاڵ ڕێزان دەگریا، چاوانی بەرخودانیش فرمێسکیان تیا قەتیس مابوو. مۆڕاڵی هەمووومان خراپ بوو، ئازوقەشمان نەمابوو. بەهەموو شێوەیەک لەناو ناڕەحەتیدا بووین، سەرەڕای هەموو ئەمانەش گرووپێکی تری گەریلا کە ٤٠ هەڤاڵ بوون گەیشتنە لامان. ئەوەی باش بوو کە ئەم هەڤاڵانە ئازوقەی چەند ڕۆژێکیان پێ بوو. بەهۆی ئەم ٤٠ هەڤاڵە میوانەوە لەکەمپەکە شوێنمان نەدەبۆوە، ئەم هەڤاڵانە پێشوتر بڕیاریاندا بوو کەلە ئافگەسۆر جێگیر بن، بەڵام بەتەسادوف ڕوبەڕوی ئێمە ببونەوە. بەم شێوەیە ژمارەمان ببوو بە ٩٠ گەریلا. ئەمەش نیشانەی هاتنە ئاراوەی نەبوونی ئازوقە بوو. پەیتا، پەیتا کاتی بەفر بارین هاتبوو. هێواش، هێواش ناوبەر بەفر دایدەکرد. لەوەدەچوو کە ئەم زستانە درێژە بخایەنێت. ناچار دەماین کەلە کەمپەکە کۆنەکەمانەوە ئازوقە بهێنین. دوای دوو ڕۆژی تر خۆمان گەیاندە کەمپە کۆنەکەمان و کەمێک نیسک و نۆکمان هێنا.

ئەو هەڤاڵە نوێیانەی کە هاتبوونە لامان لەگەڵ خۆیاندا بڕیارێکی بارەگای گشتی هێزی فەرماندارێتیان هێنابوو. بەگوێرەی ئەو نوسراوە بێت کە بۆمانیان ناردبوو هەڤاڵ هاروونمان سیخوڕە. ئەم هەواڵە لە

کەمپەکەدا تەنها ٣ بۆ ٤ هەڤاڵێکمان دەیزانی، دەمانویست هەتا بەهار نەیەڵین کە هاروون هەست بەمە بکات، ئەو کەسەی کە لەگەڵ هاروونندا هاتبوو ببوو بە گەریلا لەبارەگای گشتی دانی بەوەدا هێنابوو کە خۆی و هاروون سیخوڕی دەوڵەتی تورکن، هەموو زانیارێکانی لەبارەی خۆی و هاروونەوە بە هەڤاڵان دابوو، بەگوێرەی زانیارێکانی برادەرەکەی هاروون نامانج و ئەرکی سیخوڕێکەیان ئەوەبوو کە لەناو گەریلادا بێ هیوای و بێ باوەڕی بخوڵقێنن، بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە بەردەوام هێنانە زمانی برسێتی و گەورە کردنەوەی ناڕەحەتێکان لەلایەن هاروونەوە ئەمە لەئاکامی لاوازییەوە نەبووە بەڵکو بە زانا بوونەوە کردوویەتی، ئەو پێیوابوو کە برسی بووە و بەو شێوەیە شەڕ ناکرێت و پەکەکە گەریلاکانی خۆی بە جدی وەرناگرێت و حیسابیان بۆناکات و بەم شێوەیە بە گوێرەی پیلانی خۆی بێت گەریلا لە پەکەکە سارد بکاتەوە، جارێکیان مێشکی ڕێزانی پڕکردبۆوە و لەداخانا دەستی کردبوو بە گریان، ئەم هەڵوێستەی ڕێزان جیاواز بوو، ئەو بەڕاستی لە برسانا دەگریا و ماندوبوو هەروەها سەرماشی بوو.

بەیانییەک وەکو هەموو ڕۆژێک تر دەستمان کردەوە بە پەروەردە، هەموو گەریلاکان لەمەیدانی کۆبونەوەکە گردببونەوە، بۆ دابینکردنی داودەرمان ٤ گەریلا ڕەوانەی گوندەکە دەکران، یەکێک لەو هەڤاڵانەش ڕێزان بوو، ڕێزان لەناو کۆبونەوەکەدا نەبوو، پالۆ و شاهین گەڕان بەدوایدا، هەتا سەرووی کەمپەکە چوبوون، چاویان کەوتبوو بە شوێن پێ، ئەو گردەی کە شوێن پێیەکان بۆی دەچوون کە هی ڕێزان بوون ئەگەر پێی نەگەیشتنایە و ئەگەر ڕێزان خۆی بگەهێشتانایەتە ئەو دیو گردەکەوە مەحاڵ بوو بگەن بە ڕێزان، کاتێک ڕێزان خەریک بوو سەرگردەکە ببڕێت بینییان، شاهین هاواری لێکرد و ڕێزانیش ئاوڕی لێدابونەوە، شاهین پێیووتبوو مەڕۆ خۆت باش لە ڕەوشەکە دەزانیت، ژیانی ٩٠ هەڤاڵ مەخەرە مەترسییەوە، ڕێزانیش پێیووتبوو من ناتوانم بەرگە بگرم، قسەکانی نێوانیان درێژ ببۆوە، نە قەناعەتی دەهێنا و نە ئەشرۆی، لە شوێنەکەی خۆی چەق بوو، وەڵامی هەموو قسەکانیانی دابۆوە و هۆکاریشی ڕەخساندبوو بۆ

هەموو قسەوباسێک، کاتێک پالۆ لەمە زیاتر کەدان بەخۆیدا ناگرێت چەند هەنگاوێک لێی چوبووە پێشەوە، ڕێزانیش چوبووە ئەودیوی گردەکەوە، ئەمە مەحاڵ بوو کە بەم ڕۆژی ڕووناکە بارەگا سەربازێکەی ئەوبەر ڕێزانی نەبینیبێت، شاهین و پالۆ هیچیان لەدەست نەدەهات ).

لەناکاو ئاریا کتێبەکەی دەستی داخستەوە، بە دەنگێکی توڕەوە وتی "ئەوەندەش نا! "ساریا ئاگای لەخۆی نەمابوو، لە ڕووخساریدا تاساوی و غەمباری پێوەدیار نەبوو، ئاریا لێی پرسی "ئەرێ ئەوەچییە بۆچی بێدەنگیت؟ "ساریا هاتەوەسەرخۆی و پێیووت "هیچ نییە بیر لە خیانەتەکان دەکەمەوە، بیر لەوکەسە دەکەمەوە کە لەپێناو بەرژەوەندی خۆی ژیانی ٩٠ هەڤاڵ ئەخاتە ناو مەترسییەوە! "ئاریا نەیدەزانی کەچی پێبڵێت، زاتەن هێشتا مابووی کەبەتەواوەتی لەمانای خیانەت تێبگات، ئاریا چارەی لە گۆڕینی مژارەکە بینییەوە، ئاریا پرسی:

"کوزەلەکەت خوارد؟"

"ئەرێ چەنێک دەتوانین بە کوزەلە بژین؟"

"هیچ مەراقت نەبێت، ئەگەر ڕۆژی ١٠ بۆ ١٥ گەڵایەک بخۆین ئەوە بەرگە دەگرین، هەرکاتێکیش نۆبەراسیۆنەکە کۆتایی پێهات هەڤاڵان دەگەڕێنەوە".

"کەواتە لێرە دەمێنینەوە؟!"

"بێگومان، ئەم باشترین شتە!"

دوای ئەم قسانە ئاریا بەلای چەپدا پاڵی دایەوە و ویستی سەرخەوێک بشکێنێت، ئەمە نیشانەی ئەوەبوو کە نۆبەی ئێشکگری سارییایە، ساریاش بۆئەوەی چاوێک بە چواردەوری خۆیان بگێڕێت سەری لە سەنگەرەکەوە دەرخست.



باگەر کە فەرماندەی گرووپەکە بوو ژمارەیان ٦٠ گەریلا دەبوو، لەناو چاڵە قوڵەکەدا هێشتا لە چاوەروانیدا بوون، ١٠ ڕۆژ بەو شێوەیە مابونەوە، هێزی دوژمن هێشتا لەسەر خاڵی چاودێرێکەدا مابونەوە، هێشتا ئەگەری ئەوە لەئارادا نەبوو کە ئۆپەراسیۆنەکە کۆتایی پێهاتبێت، برسێتی کێشەی هەرە گەورەیان بوو کە یەخەیانی بەرنەدەدا، هەموو ڕۆژێک مۆمێکی خۆراگریان دەکوژایەوە و باوەڕبوون بەخۆ بوون خۆی لە کزی دابوو، لەلایەکەوە دوژمن بەدوایانەوە بوو لەلایەکی تریشەوە بەفر دیلی کردبوون.

ڕۆژگار بە ئاسانی بەسەریاندا تێنەدەپەڕی، کاتەکانی نێوان ڕۆژ بونەوە تاکو ئێواران هەرساتێکی بۆ ئەوان ئەشکەنجە بوو، لە ئێوارەدا کارە تایبەتێکانی خۆیانیان ئەنجام دەدا و بەم شێوەیەش هەلیان بۆ دەڕەخسا کە قاچەکانیان بجوڵێنن، بەیانیان لەترسی هاتنە ئاراوەی ڕوداوی نەخوازیار لە شوێنەکانی خۆیان دەکەوتنە چاوەڕوانییەوە، بەڵام کە ئێوارە دادەهات ئیتر هەناسەیەکی ئاسودەیان هەڵدەکێشا، بە ڕۆژ کۆکینێکی بچوکیش دڵی هەموویانی دائەخورپان، باگەر لە ناخی دڵێوەی هەستی بە ناڕەحەتی و نیگەرانی هەڤاڵەکانی دەکرد، ئەو لەپێناو بەختەوەر بوون و پێکەنین و بەزەوق بوونی هەڤاڵانی ئەوەی بویستراية ئامادە بوو بیکات، بەڵام هیچی لە دەست نەدەهات ئەمەش ببوو بەمایەی خەفەت خواردنی.

لەناو ئەو ڕەوشە دەروونییەی هەموویان کە تیای ئەژیان و ڕەنگەکانی لەیەک دەچوو، بەڵام لەناویاندا هەڵسوکەوتی جیاوازتر لەیەک دەهاتەوە ئاراوە، هەڤاڵ غالیبیان سەنگین بوو، بەرچەمیش سەرقاڵی ئەوەبوو کە خواستەکانی خۆی بۆ هەڤاڵەکانی چواردەوری بهێنێتە زمان، بەهۆی برسێتییەوە بەرچەم لاواز ببوو، هەڤاڵ عیرفانیان بەردەوام سکاڵای دەکرد و ئەمەشی ئەهێنایە زمان، پالۆ باوەشی بە بیکەیسێکەیەوە کردبوو، ئەو لەناو دەریای خەیاڵی خۆیدا لە مەلەکردندا بوو، دەمەوئێوارە گەنگەشەی نێوانیان پەرەی سەندبوو، کاتێک لەکاتی ڕۆژدا نەیاندەتوانی جموجۆڵ بکەن و ناڕەحەتیان ئەچێژا لە ئێوارانداا دەیانتوانی بەشێنەیی ئەم ئەشکەنجەیان لە

کۆبونەوەکە بهێننە زمان و خۆیان لە ناڕەحەتی ئەندێشەکان خاڵی دەکردەوە، هەمووشیان لەیەککاتدا یەک دەردیان هەبوو، بەگوێرەی هەندێکیان برسێتی دەیانکوژێت هەربۆیە پێیان وابوو کە شەڕکردن باشترە لە چاوەڕوانی، بەگوێرەی بیروبۆچەنەکانی تریان پاراستنی ژیانی گرووپەکەیان دەبێت ئامانجی سەرەکییان بێت، باگەر لایەنگری بیروبۆچوونی دووەم بوو، لەپێناو پاراستنی گرووپەکە برسی بوون باشتربوو لە هاتنە ئاراوەی بەڵا.

هەروەکو هەموو جارێک کە باگەر بێ چارە دەمایەوە شاهینی بۆلای خۆی بانگ دەکرد، بەڵام ئێستا شاهین لایەنگری بیروبۆچوونی یەکەم بوو کە پێی باش بوو لە جیاتی ئەم برسی بوون و چاوەڕوانییە شەڕکردن باشترە، باگەر هۆکاری بۆچونەکانی خۆی بۆ شاهین هێنایە زمان، کاتێک شاهین قەناعەتی کرد بە بیروبۆچونی باگەر، بەڵام ئەمجارە پێشنیار و بیروبۆچونی جیاوازتری هێنایە زمان، شاهین وتی "باشە بابچین ئازوقە پەیدا بکەین"، شاهین پێشنیاری ئەوەی کردبوو کەلەکاتی تاریکیدا چەند گرووپێک ئامادەبکرێت بۆنەوەی بچن لە کۆگا کۆنەکانیان ئازوقە بهێنن، کەسیان ئەم پێشنیارەی شاهینیان ڕەدنەکردەوە، سبەی ئێوارە پێشنیارەکەی شاهین خرایە بواری جێبەجێ کردنەوە، گرووپێکیان بۆ کەمپە کۆنەکەی خۆیان ڕەوانە کرد هەروەها گرووپێکی تریان ڕەوانە کرد تاکو چاو بە چواردەوری خۆیان بخەشێنن و ڕێگە چارەی ڕزگاربوون لێرە بدۆزنەوە، بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەی نوێ ئەو گرووپەی ڕەوانە کران پێکهاتبوون لە پالۆ و نعمان و عیرفان هەروەها ئەو گرووپەشی ڕەوانەکرابوون بۆهێنانەوەی ئازوقە پێکهاتبوون لە شاهین و بەرچەم و غالیب، کاتێک بەڕێکەوتن هەموویان دڵنیابوون لەوەی کە ئەرکەکانی خۆیان بەباشی بەجێدەهێنن، بۆئەوەی بەدەست بەتاڵی نەگەڕێنەوە ئەوەی لەدەستیان بهاتایە دەیانکرد، هەموویان باوەڕیەکی زۆریان بە شاهین و بەرچەم هەبوو، ئەگەر عینادی بەرچەم بخرایەتە سەر عینادی شاهین ئەوا ئەرکێک نەدەمایەوە کە بە سەرکەوتوانە جێبەجێی نەکەن، کە گرووپەکان بەڕێکەوتن هەموویان مێشکی خۆیان بە خەیاڵی بریق و باق ڕازاندبۆوە، پالۆ هەروەکو هەموو جارێکی تری بەو قسانەی کە حاڵی بوون لێی مەحاڵ بوو،

دەستی بە قسە کرد و پاشان نەعمان و عیرفانی خستە دوای خۆی، دەبوایە بەسەر بۆزاندا هەڵبگژێن کە ئەمەش هەروا ئاسان نەبوو، برسێتی بێ وزە و بێ حەوسەڵە و بێ تاقەتی کردبوون، لەماوەی نیو کاتژمێری هەڵگژانیاندا بەتەواوەتی شەکەت ببوون، پالۆ لەم ڕەوشەی خۆی سەری سوڕ مابوو، ئەو لەو باوەڕەدا نەبوو کەبەو شێوەیە ماندووبێت، ئەگەر ڕێنەکردنی هۆکارێکی تری هەبوایە لەوانەبوو پێی قەبوڵ بێت، بەڵام ڕێنەکردنی بەهۆی برسێتییەوە ئەمەی بێ هەزم نەدەکرا، عینادییە زازایەکەی و غرورەکەی ڕێگەی بە پالۆ نەدەدا کە لەهەمبەر ئەم برسێتییە هەرەس بهێنێت، بەڵام کار لەکار ترازابوو، پالۆ نەیدەتوانی ڕێبکات، هەرچەندە حاڵی نەدەبوو کەلە کێ تووڕە بووە، بەڵام کێ پالۆی بەم شێوەیە بدیایە لەرەوشە دەرونێکەی حاڵی دەبوو، چاوەکانی دادەخران و تووڕە دەبوو، لەکاتی قسەکردندا بەجۆش دەبوو، بەبێ ئەوەی دانبە وشەکاندا بهێنێت کۆمەڵێ قسەی لەدەم دەهاتە دەرەوە و دوای تەواوبوونی قسەشی هەناسە بڕکێی بوو، پالۆ کە کەمێک لووتی باریک و درێژ بوو بەهۆی سەرماوە سوور هەڵگەڕابوو، پەیتا، پەیتا قاچەکانی دەرچان، دەستەکانی گۆیان نەدەکرد، لەم حاڵەتەدا ئەگەر ڕووبەڕوی دوژمن ببوایتەوە لەوانەبوو تەقەشی پێنەکرایە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش لەگەڵ هەڤاڵەکانی بەردەوام بوون لە هەڵگژان، پالۆ دەیبینی کە نەعمان و عیرفانیش وەکو خۆی لێهاتوون، بەڵام نەیدەهێشت کە ئەوان هەست بەم ماندوبونەی بکەن، پالۆ تەماشایەکی نەعمانی کرد، بینی لەبەرخۆیەوە قسەدەکات، خۆی پێڕانەگیراو لێی پرسی:

"هێ بووە لەگەڵ کێدا قسە دەکەیت؟!"

"لەگەڵ ئەوەی سەرەوە!"

"لەگەڵ کێ؟!"

"لەگەڵ ئەوەی سەرەوە واتا خوا!"

"چیت پێووت؟!"

"چەند درووشمێکم وت، بەڵام هیچ وەڵامێکم چنگ نەکەوت!"

پالۆ بەم قسەیەی پێکەنی و پێیووت:

"زۆرباشە، هەرهیچ نەبوایە لەبارەی ئەم بەفرەوە چەند درووشمێکت بوتایە خۆهیچ نەبێت ئەمەش بەرەکەتە".

"پێمووت بژی بەرخودانی گەل".

"ئەی باشە پێت وت کە بەرخودانی گەل ٣ قۆناغییە، هەرهیچ نەبێت ستراتیژیانە بۆی بچۆپێشەوە!"

"ئێمە بە خۆڕای بەم هەورازەدا هەڵدەگژێین، باشترین شت ئەوەیە کە بگەڕێینەوە!"

پالۆ ئەم قسەیەی بەدڵ نەبوو، هەربۆیە پێیووت:

"ئەگەر من پالۆبم و لەهەمانکاتدا زازاش بم هەردەبێت ڕێگە چارەیەک بدۆزمەوە".

"تۆ هەموو گرووپەکەمان دەدەیت بە کوشتن، سبەی شوێن پێمان دەبیننەوە، ناتوانیت ئەم کارە بە ئەقڵی زازاوە چارەسەر بکەیت!"

"ئەگەر حەزدەکەیت بگەڕێوە، هەتا ڕێگەچارە نەدۆزینەوە ئێمە ناگەڕێینەوە!"

پالۆ دەیزانی کە ئەم قسانەیان کۆتایەکەی دێتە کوێ! هەربۆیە بەردەوام بوو لە هەڵگژان و هەموو چواردەوریشیان سپی بوو، نەدەتوانرا گردەکان دەستنیشان بکەن بۆخۆیان نە ڕێگەوبانەکانیش، چواردەوریان وەک ئەوەوابوو کە چەرچەفێکی سپییان بەسەردا دابێت.

سەرەڕای هەموو شتێک بەردەوام بوون لە ڕێکردن، ئەعمان و پالۆ لەلایەکەوە قسەیان دەکرد لەلایەکی تریشەوە ڕێگەیان دەکرد، باسی یادەوەرییە کۆنەکانیان دەکرد، باسی ئازار و مەینەتێکانی ساڵی ١٩٩٦ یان دەکرد.

ئەعمان وتی "

من ئەو ڕووداوەم گوێ لێبووە، بەسەرهاتی گرووپەکەی هەڤاڵ قارەمان نەبوو؟"

پالۆ لە جیاتی ئەوەی سەرودڵی خۆیان بە بەسەرهاتی ساڵی ١٩٩٦ بگرن کە غەمباری دەکردن و کاتیشی نەبوو، پالۆ پێی باش بوو کە ئەم ڕێگەکردنەیان

بەدەم پێکەنینەوە بەردەوام پێبدەن، یادەوەرییەکانی پالۆ لەبارەی هەڤاڵ جوان یانەوە بوو، زاتەن پالۆ ئارەزووەمەندی گێڕانەوەی بوو، کاتێک زانیشی نوعمان زۆری لێدەکات ئەمەی بە هەل زانی و کەمێک مەسەلەکەی بۆ بریقەدار کردو دەستی کرد بە گێڕانەوە پالۆ وتی:

"ئەو ڕۆژە هەڤاڵ جوان بەرپرسی چێشتخانەکەمان بوو، بۆئەوەی نانەکانی نەخۆین لەسەر نانەکان درێژ ببوو، ڕۆژێکیان هەڤاڵێک نەخۆش کەوت، وابزانم ناوی بەرخودان بوو، هەڤاڵ قارەمان پێیووتم بڕۆ نان بێنە بۆ ئەو هەڤاڵ، منیش چووم، کەس لە چێشتخانەکە نەبوو، بێگومان بەمە سەرسام بووم، هەڤاڵ جوان لەوانەبوو دەستبەرداری هەموو شتێک ببوایە، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری چێشتخانەکە نەدەبوو، ئەمە وەک موعجیزەیەک وابوو کەچووم هەڤاڵ جوان لەوێ نەبوو، ئەمەم پێ سەیر بوو، پێویستیم بە نان بوو، بەڵام دەبوایە مۆڵەتم لەو وەربگرتایە، هەرهیچ نەبوایە دەبوایە پێم بوتایە کە بە فەرمانی قارەمان هاتووم بۆ ئێرە، بەڵام کەس لە چێشتخانەکە نەبوو، منیش چەند نانێکم هەڵگرت و لە چێشتخانەکە هاتمە دەرەوە، ترسێک لەدڵمدا بوو، بەڵام هۆیەکەیم نەدەزانی، خەریک بوو بەسەر گردەکەی پشت چێشتخانەکە هەڵگژێم و لەچاوان ون بم، بینیم کە هەڤاڵ جوان لە پشت چێشتخانەکەوە دەرچوو، لە دوورەوە تەماشای منی کرد، منیش تەماشای ئەومکرد، کەس نەیدەزانی کە هەڤاڵ جوان چۆن بیردەکاتەوە، ئەی ئەگەر هاواری لێم بکردایە و قیژەی بکردایە کە گوایە نانەکەیم دزیوە؟ لەم حاڵەتەدا من چیم بکردایە؟!نانەکانم لەناو لەشم شاردەوە، هەستم دەکرد کە وەک دزم لێهاتووە، پێکەنینێکم بۆکرد و بەدەستم سڵاوم لێکرد، لەناکاو نانێکم لێکەوتە خوارەوە، ئەم نانە لە سیخوڕ دەچوو، دەیویست من بۆ هەڤاڵ جوان ئاشکرا بکات، سەمەرەکە لەوەدا بوو کە نانەکەم لێکەوت لەبەرئەوەی ڕەق بوو هەتا بەرپێی هەڤاڵ جوان غلبۆوە، بەخۆمم وت تەماشای ئەم نەگبەتییە بکە، هەڤاڵ جوان بەسەرسوڕمانەوە لە من و نانەکەی دەڕوانی، دوایش دەستی کرد بە هاوار کردن، دەمویست پێی بڵێم بێدەنگ بە، بەڵام دەمزانی کە گوێم لێناگرێت، ئەگەر لێرەش بوەستمایە باش نەبوو ڕاشمبکردایە هەرنەدەبوو، بەخۆمم

دەووت خۆزگە بمتوانایە بە ناخی زەویدا ڕۆبچومایە، بینیم هیچ چارەیەکم نییە منیش غروری زازایم خستە ژێر پێمەوە و دەستم کرد بە ڕاکردن، دوایی هەڤاڵ قارەمان چوو بۆلای جوان و بە زۆر قەناعەتی پێهێنا بوو کە واز لە من و نانەکان بهێنێت، ئەگەر وردەکارێکانی هەڤاڵ جوان نەبوایە نەدەتوانرا بە ١٥ چارۆگە ئاردەوە ٩٠ گەریلا بەدرێژایی زستان بێ نان نەکرێن، ئەگەرچی هەڤاڵ جوان لەسەرحەق بوو، بەڵام سوێندم خوارد کە دەبێت تۆڵەی لێ بکەمەوە، جارێکیان کە هەڤاڵ جوان لەسەر نانەکان درێژ ببوو بەبێ ئەوەی بەئاگای بهێنمەوە نانم لەژێری دەرهێنا، نانەکانم لە چواردەوری ڕیز کرد، دوایش نامەیەکم بۆی جێهێشت، نوسیم ئەمە چالاکییەکی تۆڵە سەندنەوەیە، ڕاستە زۆر ئازارمان چێشت، بەڵام مۆڕاڵمان هەمیشە لە لووتکەدابوو، ئەمجارەیان واهەست دەکەم هەستێک لەناخمدا گڕی گرتبێت، بێ چارەیی ئاخ بێ چارەیی.

کە گەیشتنە گردێک چاویان بە تیشکێک کەوت، ئەمە تیشکی ئەو ئاگرەبوو کە سەربازەکان کردبویانەوە، لە شێوەی جیاواز لە چوارلاوە ئاگریان کردبۆوە، پالۆ بە دووربینە شەوانەکەی تەماشایەکی کرد، لەبەرئەوەی دووربوون جگەلە تیشکی ئاگرەکان هیچی تری نەبینی، عیرفان وتی "بالەم لایەوە نەڕۆین"، نوعمانیش بە تووڕەبونێکەوە وتی "بۆ ئەوەندە بە خێرایی بڕیار دەدەیت؟!"لەڕاستیدا قسەی عیرفان ڕاست بوو، لەقەد پاڵەکەی بەرامبەریانەوە دەتوانرا بە ئاسانی ئەمان ببینن هەروەها کێشەی شوێن پێشیان هەبوو کە بۆ بەیانی دەبینران، بەدرێژایی قەد پاڵەکە بەرەو ڕۆژئاوایان ملیان نا، زنیەک ڕوبەڕوویان بۆوە کە زۆر لە لێژاییدا نەبوو، کەسیان نەیاندەزانی کە ئەم زنیە لەکوێ کۆتایی پێدێت و بۆکوێ دەچێت، عیرفان دووبارە و سێ بارەی دەکردەوە کە باشترین شت گەڕانەوەیە، سەرەڕای هەموو هەوڵێکی نەیتوانی قەناعەت بە پالۆ و نوعمان بکات، دەستیان کردەوە بە ڕێکردن، لەناکاو لە دەنگی عیرفان ڕاوەستان، لەناکاو کەوتە ناو چاڵێکەوە، بەشێکی زۆری لەشی لە ناو بەفردا بوو، بەڵام پالۆ و نوعمان بەسەر شوێنە بەستەڵەکەکاندا ڕێیان کردبوو، ئەمەش بۆئەوە بوو کە ناکەونە ناو چاڵی بەفرەوە و شوێن پێیان

دەرنەکەوێت، هەردووکیان دەستیان درێژ کرد بۆ عیرفان تاکو لە چاڵەکەدا دەریهێنن، کاتێک عیرفان دەستی گرتن و یەکتریان ڕاکێشا ئەمجارەیان هەردووکیان کەوتنە چاڵەکەوە، دوایی بۆیان دەرکەوت کە ئەو شوێنەی تێی کەوتبوون چەمە، ئەوەی ئەوانی نیگەران کردبوو تەڕبوونی پێیان بوو، بەهەر شێوەیەک بێت توانیان لە چاڵەکە بێنە دەرەوە، هەتا سەر ئەژنۆیان تەڕببوو ئەمەش دەبووە ئەوەی کە ڕێکردنیان لەناو بەفرەکەدا ببێت بە فەلاکەت، نەعمان وتی "با بگەڕێینەوە ئەگینا قاچەکانمان ئەسوتێت"، پالۆ ئەم قسەیەی پێ قەبوڵ بوو، عیرفانیش بە شێوەیەک لێیانی دەڕوانی دەیویست پێیان بڵێت کە پێشوتر لەسەرحەق بووە، گەڕانەوە، دوای ئەوەی ماوەی ٢ کاتژمێرێک ڕێیان کرد گەیشتنەوە شوێنەکەی خۆیان، شەڕواڵەکانیان شەختە گرتبووی وەک دار ڕەق ببوو، لەبەرئەوەی پێیەکانیان ئاوسابوو، زۆر بە نارەحەتی پێڵاوەکانیان پێداکەنرا، پێش هەموو شتێک مەساج بۆ پێیەکانی خۆیانیان کرد، ئەگەر مەساجێکی باشیان بۆنەکرایە و خوێن لەناو پێیەکانیاندا جوڵەی نەکردایە لەوانەبوو بسوتێن و ڕەش هەڵگەڕێن، هەرچەندە پێیان ئاوسا بوو، بەڵام لەمەترسی سوتانیان بە دوور بوون و لەماوەی چەند ڕۆژێکدا بەتەواوەتی باش دەبونەوە.

گرووپەکەی شاهین کە بۆ هێنانەوەی ئازوقە چوبون دوای ڕۆژێک لەکاتی نیوە شەودا گەیشتنەوە شوێنی خۆیان، کاتێک ئەوانیش وەک پالۆ بەدەستی بەتاڵی گەڕابونەوە مۆڕاڵی هەموو گەریلاکانی خراپ کردبوو، کاتێک شاهین هەستی بەبێ مۆڕاڵی هەڤاڵان کرد بەمە غەمگین ببوو، بەڵام لەلایەکی ترەوە تەماشای بەرچەمی دەکرد و پێدەکەنی، باگەر ئاگەداری ئەم پێکەنینەی بوو، کاتێک بە هەواڵی ناخۆشەوە گەڕابونەوە بۆچی بەم شێوەیە پێدەکەنێت، باگەر لێیانی پرسی "بۆچی جانتاکانتان پڕە واپێدەکەنن؟ "غالیب وتی با من وەڵام بدەمەوە، شاهینیش وتی زاتەن تۆ قسەت نەکەیت دەتەقیت، شاهین هێشتا بەردەوام پێدەکەنی، غالیب وتی "هێزی دوژمن بەتەواوەتی دەستیان بەسەر کەمپەکەدا گرتووە، نەمانتوانی بچین بۆلای شەلالەکە و ناو کەمپەکەش، بەڵام لە شوێنێکی تر نۆکمان دۆزییەوە"، پالۆش کەوتە قسە و وتی "ئەی بۆ

لەسەرەتادا باستان نەکرد؟ "ئەویش وتی "سەرەتا ویستمان دڵی ئێوەی هەژار خۆش کەین، بۆئەوەی یەکسەر بڵاونەبێتەوە ویستمان دەستی بەسەردا بگرین، ئەگەر بەگەیشتنمان بمانوتبایە تەنها نۆکمان هێناوە کەستان ئەمەتان بەدڵ نەدەبوو "، شاهین نۆکەکەی بەسەر هەموویاندا دابەشکرد، سەرەڕای ئەوەی دەشیان زانی کە دوای چەند کاتژمێرێکی تر سکی هەموویان دێشێ نۆکەکەیان هەر خوارد، ئەمە سک تێربونێکی کاتی بوو، باگەر بڕیاری دا کە گرووپێکی تر خۆی ئامادە بکات، لەوە دەچوو کە هێزی دوژمن ماوەیەکی زۆر لە دەربەندی عەلی بمێننەوە، هەربۆیە پێویست بوو کە بەلای کەمەوە ئازوقەی ١٠ ڕۆژێک بەدەست بخەن.

# ٩

ئەو ڕۆژە ئیبراهیم بە ئازارترین ڕۆژی خۆی بە چاو بینیبوو کە هەرگیز لەبیری نەدەکرد. ئیتر لەمە زۆر دڵنیابوو کە هەتا مردن جەستەی پارچە بووی ئەو ٣٦ هەڤاڵەی لەبیر ناچێتەوە. ئیبراهیم شاهیدحاڵی ئەو کۆمەڵکوژییە بوو کە وەک سێبەر هەرگیز لێی نەدەبۆوە. ئەمە ئازارێک بوو کە پێناسەی زۆر مەحاڵ بوو. ئیتر هەناوی ئیبراهیم بەیانی و دوو بەیانی و سێ بەیانی هەموو ڕۆژێک خوێنی لێدەتکا.

جەستە پارچەبۆکانی هەڤاڵانیان بەجێ هێشتوو کەوتنەرێ. ئەوکاتەشیان نەبوو کە یەک بەیەک بیاننێژن و تاوێکیش بۆیان بگرین. بەدرێژایی ڕێکردنیان دیمەنی پێکەنینەکانی گورسێ و دوا سەرنجی عەگید و دوا دیمەنی دیار لەبەرچاویان لانەدەچوون. ژیانیش وەک مردن پڕبوو لە نهێنی. گریان و تووڕەبوون و هاوار و قیژە و خواستی تۆڵەسەندنەوە نەیاندەتوانی ئەم ئازارە قوڵە خامۆش بکەنەوە. مانەوە لەو شوێنەدا یاخود ڕزگاربوون لەوێ و سەرلەنوێ دەستگرتن بەلقی ژیانەوە و مردن و کوشتن و هەستانەوە و شێت بوون یاخود ڕێکردنی شێنەیی و پێکەنین و خەیاڵی سەرلەنوێ ژیان کردنەوە یان خۆلکاندن بە هەڵبژاردەی نارەحەتەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە هەموو ئەمانە هەرگیزا و هەرگیز نەدەبوونە دەرمانی ئازارەکانیان.

ئەوەی کە مایەی سەرنج و سەرسوڕمان بوو ئەوەبوو کە هێشتا ژیان بەردەوام بوو. بەفری سەر زەوێکان ئەبریسکانەوە و زێیەکانیش خوڕەیان دەهات و ڕەشەباش هەر گفەی دەهات. دوای چەند ڕۆژێک سەرلەنوێ خۆر تیشکی خۆی دەخستە سەر دڵی هەموو بونێکدا. کلو بەفرەکانی سەر لق و چڵی دارەکان ئەتوانەوە و سەرلەنوێ چیاکان پاڵتۆی کەسکیان لەبەردەکردەوە هەروەها دارستانەکان و ڕووبار و چەم و زێیەکان ژیانیان وەبەردەهاتەوە. تێگەیشتن و حاڵی بوون لە هەموو ئەمانە بۆ ئیبراهیم شتێکی هەروا ئاسان نەبوو. سەرەڕای ئەوەی لە شوێنی شەڕ و پێکدادانەکەدا دوورکەوتبونەوە. بەڵام سێبەری کۆمەڵکوژێکە بەردەوام بەدوایانەوە بوو. ڕێکردنیان هەتا بەیانی خایاند. سەرەڕای ئەوەی هەڤاڵە بریندارەکانیشیان پێبوو. بەڵام توانیبویان بەباشی ڕێبکەن. ئەو هەوڵوتەقەلایەی کە بەدرێژایی ڕێکردنیان کە

هەڤاڵ ڕۆدیان نیشانی دابوو مایەی دەستخۆشی هەموویان بوو، ٣ گەریلایان شانیان بریندار ببوو، دوو گەریلاشیان پشتیان بریندار ببوو کەبەو هۆیەوە نەیاندەتوانی خۆیان قیت بکەنەوە، ئەوانەی نەیاندەتوانی ڕێ بکەن گوڵیزار و ڕۆژبینیان بوو، هەردووکیان قاچیان بریندار بوو، ناخۆشترین شت ئەوەبوو کەلەکاتی ڕێکردنیاندا ئەم دوو هەڤاڵە لەکۆڵ بکەن کە نەیاندەتوانی ڕێبکەن، کاتێک بەڕێکەوتبوون ئیبراهیم بە هەڤاڵەکانی وتبوو "ئەگەر لەپێناو خۆشمان نەبێت دەبێت لەپێناو هەڤاڵە شەهیدەکانمان سەرکەوتن بەدەست بخەین "، ئەمەش وایلێدەکردن کە شەڕ لەگەڵ کات و ساتدا بکەن، ئەو شوێنەی لێیگیرسانەوە وەک ئەشکەوت وابوو، لەناو جەرگەی کوونە بەردێکدا بوون، سەربازێکی زۆر بە چواردەوریانەوە بوو، بەفر بەتەواوەتی ئاسەواری نەمابوو، نەهێشتنی ئاسەواری شوێن پێیان کارێکی زەحمەت نەبوو، کەلە شوێنەکەی خۆیان جێگیربوون یەکەم کاریان پێچینی برینی بریندارەکان بوو بە پشتوێنەکانیان، بەڵام دەرمانیان نەبوو، ئەگەر برینەکانیان تەداوی نەکردایە ئەوە چەند ڕۆژێکی تر برینەکانیان کرمیان دەکرد، ڕۆژی دوایی کاری ئیبراهیم ئەوەبوو کە ڕۆدی و حەیدەر و زەینەڵی نارد بۆ گوندێک تاکو داودەرمان بهێنن، خۆیشی بۆئەوەی زیاتر ناوچەکە بناسێت لە کوونە بەردەکەدا هاتبووە دەرەوە، ڕێگەوبانە پڕ لە بەردەڵانەکان بۆ ئیبراهیم نامۆ نەبوون، پێش ٢ ساڵ لەمەوبەر دوای شەڕ و پێکدادانێک هاتبوون بۆ ئێرە، ئەوکاتە دیار و عەگیدیشیان لەگەڵدا بوو، ئەو ڕۆژانەی کەوتەوەیاد، کاتێک چووە سەر گردەکەی پشت ئەشکەوتەکەوە چاویان کەوت بە توولە ڕێ و چیاو گردۆڵکە. لەسەر گردێک مەرقەدی گەیرەت بابای لێبوو، ئەم مەرقەدە شوێن مەزارگای پیرێکی دەروێشی عەلەوێکانی ناوچەی شۆڕشڤانی سەربە ئۆڤاجک بوو. چیرۆکێکی زۆری دڵخۆشکەرانە لەبارەی ئەم گەیرەت بابایەوە لەسەر زاری خەڵکیدا بوو، لەناو خەڵکیدا دەووترا کە جارێکیان ئەفسەرێک و سەربازێک میزیان کردووە بەسەر گۆڕی گەیرەت بابادا، ڕاستەوخۆ هەردوکیان لەوێ گۆج دەبن هەروەها خەڵکی ئاوایەکان دەیانووت کە دوای ئەم ڕووداوە سەربازەکان لەناو خۆیاندا بەبێ هۆ کەوتونەتە گیانی یەکتری و ٩ سەرباز کوژراون، شوێن

مەرقەدی گردەکەش پڕ بوو لە داری سنەوبەر، لە چواردەوریشیدا چەندین کانی و چەم هەبوون، ڕووی مەرقەدەکە لە چیای مونزووری دەڕوانی، ڕویەکەی تریشی لە گەمر بوو، ئەم شوێنەی لێی گیرسابونەوە لێرە ئاسان بوو کە بەرەو چیا و دەربەندەکان بچن، لێرەوە بە ئاسانی دەتوانرا کە بگەن بە دەربەندی خاواچور و سوڵتان بابا و سنجک و بۆکر و گامر، ئیبراهیم بەم دیمەنە دڵخۆش بوو، گەڕایەوە ناو ئەشکەوتەکە.

ئیبراهیم کە چاوی کەوت بە هەڤاڵ ڕۆژینی کە ئەنوزێتەوە، بەخێرایی خۆی گەیاندەلای، پارچەیەک مووشک دابووی لە خوارووی ئەژنۆی، نەیدەتوانی قاچی بجوڵێنێت و بە بچوکترین جوڵانەوەی ئەیقریشکان، ئیبراهیم بانگی هەڤاڵ مەلسای کرد و پێیووت کە بەدیار ڕۆژینەوە دانیشێت، مەلسا تەمەنی هەر ١٨ ساڵێک بوو، ئەمە یەکەم شەڕی دەستەویەخەی مەلسا بوو کە بینیبێتی، یەکەمجاری بوو کە بە چاوەکانی خۆی کۆمەڵکوژیەکی وا ببینێت، لەبەرئەوەی هێشتا تاساوی بەرینەدابوو لەسوچێکدا خۆی گڕمەڵە کردبوو، ئەو سەرسامی ئەوەبوو کە سەرەڕای ئەو هەموو کارەسات و زەحمەتییە و ناڕەحەتیانە کە هێشتا هەڤاڵەکانی دەتوانن قسەبکەن و ڕێبکەن و پیلانسازی بکەن، ئەگەر ئەم کارەساتەی بە هۆکاری جیاوازەوە گرێبدایە لەوانەبوو ماوەیەک خۆی بە دۆزینەوەی وەڵام سەرقاڵ بکردایە، مەلسا لەوەدەترسا کە ئازاری ڕۆژین بدات هەربۆیە دەستی بۆ قاچی ڕۆژین نەدەبرد، دەیویست کە ئازارەکانی ڕۆژین کەمکاتەوە، بەڵام پێینەدەکرا، تادەهات قاچی ڕۆژین دەپەلمی و خوێنی زیاتری لێدەچۆڕی.

مەلسا لە ڕۆژینی پرسی قاچت چۆنە؟ بەڵام ڕۆژین زۆر بە ناڕەحەتانە وەڵامی ئەم پرسیارەی دایەوە و ئەم ڕەوشەی خۆی پێقەبوڵ نەبوو، جگە لە چاوەڕوانی شتی تریان لەدەست نەدەهات، ڕۆدی و حەیدەر و زەینەڵ خۆیان گەیاندبووە نزیکترین گوند، پێشوتریش ڕۆدی هاتبووە ئەم گوندەوە، تەنانەت خەڵکی ئاوایی کۆکردبۆوە و پروپاگەندەشی کردبوو، ئەو نەیدەزانی کەلەو ڕۆژەوە تاکو ئێستا چیگۆڕاوە، لەسەرەتای گوندەکە ماوەیەک چاوەڕوانییان کردبوو، ڕێگەوبانەکان قوڕای بوون، کەشوهەواش سارد بوو هەروەها

برسیشیان بوو، تیشکی پەنجەرەکانی ناو ماڵەکان هەناویانی گەرم کردبۆوە، حەیدەر وتی "پێویست بە چاوەڕوانی ناکات بابچینە ماڵێکەوە". سەرەتا ڕۆدی نەیدەویست ڕاستەوخۆ ئەمە بکات، بەڵام کە حەیدەر زوو، زوو ئەمەی دووبارە دەکردەوە ئیتر ڕۆدی ناچار بوو کە قەبوڵی بکات، زەینەڵ دەبوو بە ئێشکگریان هەروەها ڕۆدی و حەیدەر دەچوونە نزیکترین ماڵەوە.

لەبەرتاریکی نەدەتوانرا تەنانەت ڕێگەش بدۆزرێتەوە، جگە لە تیشکی ماڵەکان و کەمێک دەنگی خەڵکی ئاوایی هیچ شتێک نەدەبینراو نەدەبیسترا، دوای ماوەیەک لەماڵێک نزیک بونەوە کە کەبەهۆی تیشکی گڵۆپەکەیانەوە باخچەکەیان ڕووناک ببۆوە، ڕۆدی لەجیاتی ئەوەی لە دەرگای باخچەکەوە بچێتە ژوورەوە بە دیوارەکەیدا بازیدا، دوایش لەپشت دیوارەکە دانیشت و گوێی بۆ دەنگی ناوماڵەکە گرت، جگە لە دەنگی گریانی منداڵێکی ساوا دەنگی تر نەدەهات، ڕۆدی خۆی قیت کردەوە و بەرەو دەرگاکە ملی نا، بەبێ ئەوەی دەنگە دەنگ دەربکات بە ئەسپایی چەند جارێک لەدەرگاکەیدا، لە ناوەوە دەنگی ژنێک بیسترا، بە زاراوەی زازاکی قسەی دەکرد، ڕۆدیش بە زازاکی وەڵامی ژنەکەی دایەوە، خۆی پێناساند و لەناکاو هەردوو دەنگی ژنەکە و ساواکەش کپ بوون، گڵۆپەکان کوژانەوە و باخچەکە بوو بە تاریکستان، کوژانەوەی گڵۆپەکان دڵی ڕۆدی خۆشکردبوو، ئەم ماڵە کە پێشوتر گەریلایان ناسی بوو دەبوایە هەروایان بکردایە، دەرگاکە کرایەوە، ژنەکە بەپەلە وتی خێرا وەرنە ژوورەوە، ڕۆدی ئیشاراتی بۆ حەیدەر کرد و هەردووکیان چوونە ژوورەوە، گەرمی زۆپاکە کەبەر دەموچاوی و دەستیان کەوت ئەوەندە دڵیان پێخۆش بوو ئەگەر بیانتوانیایە و ئەو هەلەیان هەبوایە هەردووکیان لەوێ درێژ دەبوون و دەخەوتن.

سەرەتا ڕۆدی چاوێکی بەماڵەکەدا گێڕا، لەماڵەکە ژنێکی بەتەمەن و دوو منداڵ و پیاوێکی تەمەن ٣٠ ساڵەی تیابوو، دیاربوو کە ئەم ژنە پیرە دایکی ئەو دوو منداڵە نییە، ڕۆدی لێی پرسی چەند کەسن لەماڵەوە؟ کابرا بە شڵەژاویەوە وتی هەرئەوەندەین، ڕۆدیش لێی پرسی ئەم منداڵانە هی تۆن؟ ئەویش وتی بەڵێ، ڕۆدی هەستی کرد کە خاوەن ماڵەکە شڵەژاوە هەربۆیە نەیویست

کەلەم بارەیەوە پرسیاری زیاتر لێبکات، کاتێک ئەمان سەرقاڵی قسەکردن بوون ژنە بەتەمەنەکە قەواڵتی بۆ ئامادەکردبوون، ئەوانیش بەبێ ئەوەی دەستبەروویانەوە بنێن لەسەر سفرەکە لێی دانیشتن، دوای ئەوەی نانیان خوارد ڕۆدی بانگی کابراکەی بۆ ژوورێکی ترکرد، بەڵام کابراکە بەشێوەیەک شڵەژابوو وایدەزانی کە بۆ مردن بانگی کراوە، لەوەدەچوو کە دەیویست شتێک بڵێت، بەڵام پێی نەدەوترا، ڕۆدی دەرگای ژوورەکەی تری کردەوە و چووە ژوورەوە، ڕۆدی لە ژوورەکە لەناو تاریکیەکەدا چاوی بە ژن و پیاوێکی تر کەوت کەلە سوچەکە خۆیان گرمۆڵە کردبوو بەمە شڵەژا، هەستی کرد کە شتێکی ناشیاو لەئارادایە، پێش ئەوەی بپرسێت کە ئەمانە کێن خاوەنماڵەکە کەوتە پاڕانەوە، کابرا وتی "دەستی بۆمەبە، هیچ نازانێت، چەندین ساڵە لەباوکی جیابۆتۆتەوە! "کابرا لە ترساندا نەیدەزانی چیبکات، بە ڕۆدی وتەوە "زاتەن باوکمان ئێمەی پێ قەبوڵ نییە، بۆچی ئێمە باجی گوناحەکانی باوکمان بدەین، دەست و پێتان ماچدەکەم هیچیان لێمەکەن! "ڕۆدی لەمەزیاتر خۆیپێڕانەگیرا، بەتوڕەبونێکەوە لێی پرسی "تۆ کێیت؟ "کابرا قیت بۆوە، بەدەنگێکی ترساوەوە دەیویست هەندێک شت بڵێت، بەڵام دەنگی دەرنەدەچوو، بەدەم تەتەڵییەوە کەوتە قسە و پاشان وتی "من خەڵکی گوندی مەرخۆم، ۳ هەفاڵەکەی ئێوە باوکم بەگرتیانیدا، ئەفسەری سوپای تورک باوکمیان وشیار کردبۆوە ئەویش بەقسەی کردن، سوێند بەخوا ئێمە گوناحمان نییە، حەزدەکەیت بمانکوژە، بەڵام ئێمە لەم مەسەلەیە بێ گوناحین، ئێمە بۆچی دوژمنایەتیتان بکەین؟ چی قازانج دەکەین لەمەدا؟ هەموو شتێک بەهۆی باوکە خائینەکەمانەوە هاتە ئاراوە "، ڕۆدی دەیویست بەتەواوەتی لێیان حاڵی ببێت، ڕۆدی ناوی گوندی مەرخۆی بیستبوو، بەڵام نەیدەزانی کە باسی چیدەکەن، هەستی بە شتێک کردبوو، بەڵام نەیدەزانی چییە! ڕۆدی پێیووت "ئێمە دەزانین کە ئێوە ئەم کارەتان کردووە ئێمە هەموو زانیارییەکمان لەلایە، ئێمە نەهاتووین تاکو بتانکوژین هاتووین لەمەسەلەکە حاڵی ببین، ئەگەر باسی هەموو شتێکمان بۆبکەن هیچ شتێکی نەخوازیار نایەتە ئاراوە "، هەموویان لە ژوورەکە هاتنە دەرەوە و لە ساڵۆنەکەدا دانیشت، دەستی بە گێڕانەوەی مەسەلەکە کرد، باسی

کرد کەلە ساڵی ١٩٩٦ دا ٣ گەریلا هاتونەتە گوندەکەیانەوە و داوای ئازوقەیان کردووەو باوکیشیان ئەوانی ڕادەستی دوژمن کردووەو هەرسێکیان گوللە باران کراون و باوکیشی لە دەرسیم جیابۆتۆتەوەو خۆیشی ئێستا هاتووە بۆ سەردانی خوشکەکەی کە بوکی ئەم ماڵەیە، دوای ئەوەی ڕۆدی لە دەفتەرە بچکۆلەکەی ناوی کابرا و گوند و بە وردی مەسەلەکەی نوسییەوە پاشان وتی "من باوەڕم پێتە، بەڵام دەبێت خۆت ساغکەیتەوە"، کابرا بەم قسەیە زۆر دڵخۆش بوو، کابرا وتی "کەواتە من ناکوژن؟ "ڕۆدیش وتی "نەخێر، هەڤاڵانمان بەدوای باوکتەوەن و لەم نزیکانەدا ئەیکوژن"، ڕۆدی شتێکی هات بەبیردا، ئەی ئەگەر تەڵەکەیان بۆ ئەمان دانابێت؟! ئەوکاتە چی بکەن؟ پێیانیوت بە یارمەتی خۆتان و هەڵسا، کەمێک لەولایانەوە بە بێتەلەکەی کەوتە بادانی دوگمەکانی، بەڵام بێتەلەکەی زاتەن ئیشی نەدەکرد، دەمینا بە بێتەلەکەیەوە و وتی "بۆ هەموو هەڤاڵان تکایە گوێبیستبن، هەموو هەڤاڵان گوێبیستبن، لەگەڵ ئەو کەسە قسەم کرد کە مەبەستمان بوو، ئەوبێتاوانە، پێویست ناکات بێنە گوندەکەوە، لە شوێنەکانی خۆتان چاوەڕێ بکەن، هەتا ڕووداوێکی نەخوازیار ڕوونەدات کەس هێرش نەکات باشە، دوای ئەم قسانەی گەڕایەوە لای کابراکە، حەیدەر سەری لەم مەسەلەیە دەرنەدەچوو، تەماشای ڕۆدی و کابرای دەکرد، کابرا لە ڕۆدی پرسی "پێویستیتان بەچییە؟ "ڕۆدیش وتی "مەڵحەمی برین و داودەرمان و برینپێچ لەراستیدا چی دەرمان هەیە پێویستیمان پێیەتی"، کابراش وتی "هیچ لەم دەرمانانەیان نییە، بەڵام لە گوندەکە مومەریزەییەک هەیە ئەوکاتەی لە شارەوە گەڕایەوە لەگەڵ خۆیدا داودەرمانی هێنابوو"، ڕۆدیش وتی "ئەو مومەریزەیە کێیە؟ "کابراش وتی "خەڵکی ئەم گوندەیە لەشار کاردەکات، بەڵام بۆسەردان هاتۆتەوە بۆ گوندەکە"، ڕۆدی بانگی بوکەکەی ماڵەکەی کرد، ڕۆدی لێی پرسی "دەتوانیت ئەو مومەریزەیە بهێنیت بۆ ئێرە؟ "ژنەکە تەماشایەکی مێردەکەی کرد، مێردەکەشی پێیووت بڕۆ بهێنە، بوکەکەین ڕۆی، دوای ماوەیەک بوکەکە و مومەریزەکە هاتنە ماڵەوە، ڕۆدی مومەریزەکەی بردە ژوورێکەوە و بەبێ ئەوەی کات بە فیرۆ بدات پێیووت "پێویستیمان بە داودەرمانە دەتوانیت هاوکاریمان بکەیت؟ "ژنەکەش بە خەندەیەکەوە

پێیووت "مەراقت نەبێت هەڤاڵ"، ئەم بەکارهێنانی وشەی هەڤاڵە ئاوی کرد بە کڵپەی ئاگری ترسی دڵی ڕۆدی دوایش وتی "ئەم کارەی کردوتانە زۆر هەڵەیە، کەس باوەڕی بەم ماڵە نییە، من لەناو باڵی بەرەی وەڵاتپارێزان کارمکردووە بێگانە نیم، هەرکاتێک پێویستیتان بە دەرمان بوو هەواڵم بۆ بنێرن ئەگەریش پێویست بکات خۆم دەیهێنم"، ڕۆدی وتی "چۆن دەتوانین داودەرمانەکان وەرگرین؟ "ژنەکەش وتی "من ئێستا لێرە دەردەچم، کە دەرچووم بە تورەبوونەوە جیا دەبمەوە، دەڵێم کە دەرمان و مەرمانم نییە، تۆش بڵێ نییە با نەبێت، تەنانەت حەزدەکەیت جوێنیش بدە"، ڕۆدی لە ژوورەکە هاتە دەرەوە دوایش ژنەکە، ڕۆدی لەناو ساڵۆنەکە وتی "ناتوانین دەرمان لە شوێنێکی تردا پەیدا بکەین؟ "کابراش سەرسام بوو، تەماشای ژنەکەی کرد، کابرا وتی "ئەگەر دەرمان هەبێت تەنها ئەم هەیەتی"، ژنەکەش بەدەنگێکی توڕەوە وتی "من لەکوێ دەرمان پەیداکەم، خۆمن دکتۆر نیم، دەرمانفرۆشیش نیم"، بەتوڕەبونێکەوە لەماڵەکە چووە دەرەوە، دوای ئەوەی ڕۆدی لەدوای ژنەکە بەدوعایەکی کرد پاشان وتی "ئەمە ژنێکی زۆر موسیبەت دیارە، ئەگەر هەواڵ بە هەڤاڵانم بدەم بە ماڵەکەیانەوە دەیوستێنن، بەڵام ناکرێت چونکە کاروباری زیاترمان هەیە"، دوای کەمێک بیرکردنەوە جارێکی تر وتی "ئێمە دەچین بۆ ئۆڤاجک، کەستان ماشێنتان هەیە؟ "ڕۆدی دەیزانی کە کەسیان ماشێنیان نییە، بەڵام بۆ سەرقاڵکردن و تێکدانی مێشکیان ئەم قسانەی کرد، ئەو باسی ئۆڤاجیکی کردبوو، بەڵام ڕێگەکەیان ڕێک پێچەوانەی ئۆڤاجک بوو، ئەگەر خەبەریشیان لێبدایە نەیاندەزانی بۆکوێ چوونە، حەیدەر بە هیچ شێوەیەک قسەی نەکردبوو، کەلە ماڵەکە دەرچوون دوو جانتایان لەگەڵ خۆیاندا هێنا کە پڕبوون لە تۆراغ و نان، مومەریزەکە لە دەرەوە چاوەروانیانی دەکرد، دوای ئەوەی جانتایەکی پڕ لە داودەرمانی دابە ڕۆدی لێیان دوورکەوتەوە، زەینەڵ بەو سەرمایە لە چاوەڕوانی ئەواندا بوو، دیاربوو زۆر سەرمای ببوو، بەشێوەیەک سەرمای ببوو کە نەیدەتوانی قسەش بکات.

ڕۆدی لە جانتاکە نان و تۆراغی دەرهێنا و پارویەکی باشی لێدروست کرد و بەدەستی خۆی دای بە زەینەڵ، زەینەڵیش بەدەستە ڕچیوەکانی لێی وەرگرت

و كەوتە خواردنی، بەدەم ڕێگەوە حەیدەر و ڕۆدیش كەوتنە نان و تۆراغ خواردن، دەمەوبەیانی گەیشتنەوە كوونە بەردەكەی خۆیان، حەیدەر قۆڵی خۆی لێهەڵماڵی بوو خۆی كردبوو بە دكتۆر و برینەكانی هەمووبانی پاككردەوە و دیتۆڵی لێدان و پاشان مەڵحەمی لێدان و دوایش پێچیبانی، كە ئەمەشی دەكرد خۆی فش دەكردەوە، دوای ئەوەی كەمێك نان و تۆراغیان خوارد كەمێك هۆشیان هاتەوەسەرخۆیان، لەناو جانتاكەی حەیدەر كەمێك چای كۆن مابۆوە، كەدەربكرد هەموویان گەشكەیان گرت، لەم ساتەوەختەدا بەم سەرمایە و لەكاتی ئەم نان و تۆراغ خواردنە ئەم چای لێنانە وێنەی هەرنەبوو، شوێنی هەموو دەرمانێكی گرتبۆوە.



# ١٠

هێزی دوژمن هێشتا لە دەربەندی عەلی نەکشابونەوە، ونبونیان و دەرکەوتنیان ساریا و ئاریای سەرسام کردبوو، ماوەی ١٥ ڕۆژ بوو لە هەڤاڵەکانیان دابڕابوون، سەرەڕای ئەمەش بیریان لەوە نەدەکردەوە کە سەنگەرەکەیان چۆڵ بکەن، ساریا سەرەڕای ئەوەی برسی و ماندبوو، بەڵام لە سەنگەرەکەوە بۆ ساتێکیش چاوی بەیەکدا نەدەهێنا، لەکاتی ئێشکگریدا بەردەوام چاوی بڕیبووە دوژمن، کەمپەکەیان ببوو بە وێرانە و خەفەتی بۆدەخوارد، کاتێک سەربازەکان ئاگریان لە قوتابخانەکە و مەیدانی کۆبونەوەکەیان دابوو ئەم دەستەونەژنۆ تەنها تەماشایانی دەکرد، ئەو چارۆگە و گونییە بچکۆلانەی کە دۆزیبویانەوە کە پڕبوو لە ئارد و نۆک و برنج سەربازەکان بەسەریەکدا هەڵیان دەڕشتن و پێیان پیادەنا و ساریاش بەم دیمەنە گریا بوو، ئەو پردەی کە بە دار لە نێوان ئاوی چێشتخانەکە و کەمپەکە درووست کرابوو ئیتر ئاسەواری نەمابوو، چێشتخانەکە چادرەکەیان بە ئاربێجی عەلی موسا ئاسەواری نەمابوو، دوو دارە چنارەکەی بەردەم قوتابخانەکەیان نەمابوو، بڕیبویانەوە و کەوتبوون و سوتێنرابوون.

ئاریا یەکەمجاری بوو کە هەست بە برسێتی بکات، پێشوتر لەبارەی برسێتییەوە زۆر گەنگەشەی کردبوو تەنانەت لەبارەی خۆڕاگری لەهەمبەر برسێتی لەهەمبەر هەڤاڵەکانی خۆشی فش کردبۆوە، ئەو لەناو هەڤاڵەکانیدا پێشوتر واخۆی دەرخستبوو کە دەتوانێت چەندین ڕۆژ بەرگەی برسێتی بگرێت، بەڵام ئێستا خۆی ڕوبەڕووی برسێتی ببۆوە و تەخمینی ئەوەی نەدەکرد کە بەم شێوەیە کاریگەری بخاتەسەر، ئەگەر بیزانیایە پارچە نانێک بەو شێوەیە باری دەروونی مرۆڤ سەروبن دەکات بەو شێوەیە خۆی فش نەدەکردەوە و هەرهیچ نەبێت بەو شێوەیە لەناو هەڤاڵەکانی قسەی نەدەکرد، ئایا برسێتی بۆ هەموو گەریلاکانی ناوچەکان هەریەک مانای هەبوو یاخود بۆکەسانێک هەستێکی کەمێک ئاڵۆزبوو، بەڵام ئەم پێناسەیە بۆ زۆر کەس هەریەک شت بوو، کێ چی بووتایە با بڵێ برسێتی هاری بەدواوەیە.

جارێکیان ناپلیۆن لە شەڕێکدا دەدۆڕێت، هۆکاری ئەم دۆڕاندنەی لە

ژەنراڵێکی دەپرسێت، ژەنراڵەکەش ئەم دۆڕاندنە بە ١٠ هۆکارەوە گرێدەدات، ناپلیۆنیش پێی دەڵێت ئادەی بیانژمێرە، ژەنراڵەکەش دەڵێت یەکەمیان ئەوەبوو کە ماسی تەواو ببوو، دووەمیان، ناپلیۆن ناهێڵێت ژەنراڵەکە قسەی تەواو کات قسەی پێدەبڕێت و دەڵێت کەواتە لە هۆکاری دۆڕاندنی شەڕەکە حاڵی بووین، نەفس بەردەوام مێشک ئەوروژێنێت و یان بەشێوەیەکی تر ئەوکاتەی ویژدان خۆی ڕادەستی نەفس دەکات ئەوکاتە خواستی هەڵاتن دێتە ئاراوە، ئەوکاتەی نەفس مێشک ئەوروژێنێت زۆرجار خاوەن ماف لەسەر کورسی تۆمەتبار دانەنیشێنێت، ئەوکاتەی برسێتی ناسنامەی خۆی لەسەر نووکی خەنجەری زاڵم نیشان دەدات و گرێکوێرەیەک دێتە ئاراوە، بۆکردنەوەی ئەم گرێ کوێرە برسێتی باشترین شانسە، لەهەمانکاتدا شەڕێکی دەستەویەخەی زاتییە هەروەها دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە لەهەمانکاتدا پێشبڕکێیەکی گەڕانەوەی شارستانییە لەنێوان دەستبەرداری تێکۆشان بۆ گەڕانەوە بۆسەر زێد و ونکردنی، ئەم شەڕی زاتییەی ناو ناخ وەکو قەڵای دمددمی لێدێت کە لەیەککاتدا بەرخودان و برسێتی هەردووکیان پاڵەوانی شەڕەکەبوون.

برسێتی و ئەندێشە وماندوبوون حەوسەڵەی ئاریایان نەهێشتبوو، هەرچەندە هەوڵیدەدا کە لەیەخەی ئەم ئەندێشانە ببێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی، ئەوەی کە زیاتر مایەی خەفەت و ئازاری ئاریا بوو گریانە نهێنێکەی ساریا بوو، خۆیشی جارناجارێک دەگریا، بەڵام وای لەخۆی نەدەکرد کە ئاریا بەزەیی پێدابێتەوە، فرمێسکەکانی چاوی ساریا بەردی دەکرد بە ئاو، ئاریا لە هەمانکاتیشدا دەیزانی کە نابێت بهێڵێت کە ساریا هەست بەمانە بکات، لە ساریا نزیک بۆوە و لەناکاو باوەشی پێداکرد، کاتێک باوەشیان بەیەکدا کرد ئیتر ئاریا نەیتوانی گریانی خۆی لەمە زیاتر بشارێتەوە، تاماوەیەک کەسیان قسەیان بۆنەکرا، ساریا لە لاوازی هەستی ڕۆحیان دەترسا، دەیزانی کە ئەم جۆرە کارانەیان هێزیان پێنابەخشێت، هەستی دەکرد کە چەند شتێک ناتەواون، بەڵام نەیدەتوانی پێناسەیان بکات، ئەم تورەبوونەی لەبەرئەوە نەبوو کە تەنیان و لە هەڤاڵەکانیان جیابونەتەوە و یاخود برسین، بەڵکو واهەستی دەکرد کە ئیتر قەدەریان نزیک بۆتۆتەوە، ئاریا بۆ ئەو وەک پەناو قەڵایەک وابوو، دەیویست

بۆشایەکانی خۆی بە ئاریا پڕبکاتەوە، ئەگەرچی ساریا باسی ئەم شتانەی بۆ ئاریا نەکردبوو، بەڵام ئاریا کەم یان زۆر هەستی پێکردبوو، گریان و باوەشکردنی بە ئاریا سارپای هێور کردبۆوە.

ئێستا کاتی نوستنی ساریا بوو، ئاریا بەردەوام بوو لە تەماشاکردنی کەمپەکە، کتێبە ڕۆمانەکەی پێیان بوو هەفتەیەک لەمەوبەر بەشی سێیەمیان خوێندبۆوە کە بەم شێوەیە بوو:

**بەشی سێیەم:**

**( بێ شانسی یەخەی ئەمانی بەرنەدەدا، نەگبەتییەک بەدوایانەوە بوو، لەناو تراژیدیایەکدا بووین، کە هەوڵمان دەدا لە ڕێگەیەک ڕزگارمان بێت ڕێگەیەکی تری ناخۆش ڕوبەڕوومان دەبۆوە، کەمپە نوێیەکەمان کە ببووە مایەی بەختەوریمان، بەڵام ئەمجارەیان هەڤاڵ ڕێزانمان هەڵاتبوو، کاتێک شاهین و پالۆ هاتنەوە بۆ کەمپەکە لە مەسەلەکە حاڵی بووین، قارەمان هەستی بە پێویستی پرسیارکردن نەکرد، هەمووومان نیگەران بووین، دەبوایە بەبێ ئەوەی کات لەدەست بدەین پێویست گرووپێکمان ڕەوانەی سەر گردەکە بکردایە، من و شاهین و پالۆ کەوتینە ڕێ، لەوێدا بەبێ چارە چاوەڕێی هاتنی دوژمنمان دەکرد، ئەگەر دوای کەمێکی تر ڕێزان خۆی ڕادەستی دوژمن بکردایە ئەوە مانای وابوو کە کەمێکی تر دوژمن دەکەوێتە سەرمان، هاتن و نەهاتنی هێزی دوژمن بەخۆرادەست کردن و ڕادەست نەکردنی ڕێزان دەردەکەوت.**

**هەتا هەڵاتنەکەی ڕێزان هەناسەی درێژ ببوایەتەوە پێویستیمان بە بیرکردنەوەی ئەم مەسەلانە نەدەکرد، دوژمن خۆیان گەیاندبووە سەر گردەکە، ئەم خیانەتە دەبووە هۆکاری زیانێکی زۆر، من هەمیشە لەو باوەڕەدا بوومە کە هەموو مرۆڤێک ناتوانێت ببێت بە شۆڕشگێڕ و ناشتوانێت چالاکییە ئەفسوناوێکان ئەنجام بدات، من لەو کەسانە حاڵی دەبم کە ئیتر پێیان ناکرێت و هەڵدێن، بەڵام لەوانە حاڵی نابم کە هەڵدێن و ئارەزوو مەندی ئەوەدەبن کە تۆڵە لەوکەسانە بکەنەوە کە ماوەیەکی**

زۆر بەیەکەوە نانیان خواردووە و ئاویان خواردۆتەوە، کاتێک ڕێزان چووە ئەودیو گردەکەوە دوای چەند کاتژمێرێک کە هێزی دوژمن گەیشتە سەرگردەکە بۆم دەرکەوت کە ئەمە تەنها هەڵاتنێکی سادە نەبووە بەڵکو خواستی تۆڵە سەندنەوەی بەدیهێناوە.

ئێمە لەبەرئەوەی هەڵگژابوینە سەر گردەکە لەناکاو سەربازەکان لەهەمبەرمان قیت بونەوە و ناچارماین کە بەفر هەڵدەینەوە و خۆمانی تێدا بشارینەوە، ئەگەر سەربازەکان بهاتنایەتە سەرمان ئەوا شەڕ دەهاتە ئاراوە، بەڵام سەربازەکان لە شوێنەکانی خۆیان چەقیو بوون، نەهەنگاوێک بۆ پێشەوە هاتن و نە هەنگاوێک بۆدواوە چوون، ماوەی ٣ کاتژمێر لەژێر بەفردا چاوەڕێی ڕۆیشتنی سەربازەکان بووین، لەبەرئەوەی هیچ نەدەجولاینەوە و ساردیش بوو هەموو لەشمان ڕچیبوو هەروەها سڕ ببوو، چەند کاتژمێر بەبێ ئەوەی یەک قسەبکەین و هیچ بجوڵێینەوە کەوتینە چاوەڕوانییەوە، لەناکامدا سەربازەکان پاشەکشێیان کرد، وادیاربوو نەیانوێرابوو ئۆپەراسیۆن ئەنجام بدەن، کاتێک سەربازەکان کشانەوە ئێمەش بەڕاکردن خۆمان گەیاندەوە کەمپەکە، قارەمان بەمەراقێکی زۆرەوە لە چاوەڕوانی ئێمەدابوو، کەگەیشتین هەموو شتێکمان بۆباسکرد، قارەمان کەسێکی ئەسمەر بوو، بەم ڕەوشە دەمووچاوی ڕەش هەڵگەڕابوو، هەرچەندە هەوڵی دەدا کە نیگەرانی و مەراق و شڵەژاوی خۆی بشارێتەوە، بەڵام پێوەیدیار بوو، سەرەڕای برسێتی و ماندوبوون و هەرەسی دەروونی ئێستاش ناچارمابوین شوێنێ کەمپەکەمان بگۆڕیایە، هەڤاڵانی کەمپەکەمان کران بە دوو بەشەوە، گرووپێکیان هەڤاڵ قارەمان فەرماندارێتی دەکرد ئەوی تریشیان شاهین، بە گوێرەی قارەمان دڵنیاترین شوێن دەوروبەری زێی چەت بوو، سەرەتا گرووپەکەی قارەمان بەڕێدەکەوتن، پاشانیش ئەوەی شاهین، هەتا توانیمان جانتاکانمان پڕ کرد لە ئەشیاو بەڕێکەوتین، بەدرێژایی ڕێگە بەکەناری زێیەکاندا ڕێگەمانکرد، بۆیە ئەمەش کرا بۆئەوەی لەدوای خۆمان ئاسەواری شوێن پێ لەسەر بەفرەکان جێنەهێڵین، کەناری زێیەکان ئێمەی تاکو زێی چەت دەبرد، زاتەن ئەمەش نارەحەترین کاربوو،

ڕێکردن لەکەناری زێیەکان مایەی زەحمەتییەکی زۆر بوو لەبەرئەوەی زوو، زوو پێمان دەخلیسکا و دەکەوتین و تەڕدەبوین و قوڕاوی دەبوین، ئەوەندە ماندو ببوین هەموومان خوازیاری خەوێکی شیرین بووین. ئەگەر ڕێگەیان پێبدایینایە لەکاتی پشودا هەموومان ئامادەبوین کەلە شوێنەکەی خۆماندا سەرخەوێک بشکێنین. بەڵام دەبوایە بەردەوام ڕێگەمان بکردایە، تەڕی لەچاو وشکایی باشتر بوو چونکە ئیستراحەتی بە پێیەکانت دەکرد. ئەگەر مەترسی ناخۆش نەبوایە باشترین شت کە بیکەین ئەوەبوو کە بەناو ئاوەکاندا ڕێ بکەین. بەڵام بەم کەشوهەوا ساردە ئەگەر لەناو ئاودا ڕێت بکردایە پاشان بهاتایتە دەرەوە و دەستت بکردایەتەوە بە ڕێکردن ئەگەری ئەوە هەبوو کە پێیەکانت بسوتێن. سەرەڕای ئەم مەترسییەش هەتا پێمان بکردایە بەناو ئاوەکاندا ڕێمان دەکرد. بەگوێرەی ئەو پیلانەی داڕێژراوبوو قارەمان و گرووپەکەی لەکاتی خۆیاندا گەیشتبوونە دەوروبەری زێی چەت، گرووپەکەی شاهین لەبەرئەوەی گەریلای زۆر نەخۆشیان لەگەڵدابوو بەباشی ڕێیان نەکردبوو هەربۆیە پێش ئەوەی بگەنە زێی چەت لە دارستانێکی بچوکدا کە هەمووی داری توو بوو هەڵگیرسابوونەوە. ئەوەی لەناویاندا کە زۆر نەخۆش بوو بەرخودان بوو، نەیدەتوانی یەک هەنگاو بنێت. بەرخودان لەهۆش خۆی چوو بوو هەموو هەڤاڵان شڵەژا بوون. ئێمە دەمانزانی کە کێچ و ئەسپێ لەشت دەخوات. بەڵام هەرگیز نەمانبینی بوو کە کەسێک لەهۆشی خۆی بەرێت.

شەو ئاگرمان کردەوە و جلوبەرگەکانمان وشک کردەوە. چەند پارچە نانێکی ناو جانتاکانیشمان خوارد. کەمیش بوبێت هەندێک سکی خۆمان تێرکرد. بەرخودان ڕەوشی زۆر خراپ بوو. بەڵام ئەمجارەشیان کردار و ڕەفتارەکانی شێخ مووس ئێمەی نیگەران کردبوو. ئەگەر یەکێک نەیناسیبایە پێیوابوو کە شێخ مووس شێت بووە. ئەمەش بەس بوو کە غەمگینمان بکات. ئێمە کە سەرقاڵی بەرخودان و شێخ مووس بوین لەناکاو هەڤاڵ شامیلمان بینی کە بە دزییەکەوە دەگری. شامیل تەمەنی ٢٢ ساڵ بوو، ٢ ساڵ بوو ببوو بە گەریلا. هەڤاڵ شامیل ئەبونێکانمان زۆر کاریگەریان

لێکردبوو، کە شەو نایلۆنەکەی دابەسەر خۆیدا هەستم پێدەکرد کە ئاخ و ئۆف دەکات، گریانی گەریلایەک زۆر زەحمەتە ئەمە ڕێگە بۆ نەهامەتی و زیان لێدان خۆشدەکات، هەتا بەیانی لەژێر نایلۆنەکەماندا دانیشتین و بیرمان لە هاتنە ئاراوەی ئەگەرەکان دەکردەوە.

دەموبەیانی کە هەڵساین یەکەم کارمان قەدکردنی نایلۆنەکان بوو، گریمانەیەکی زۆر هەبوو کە ئۆپەراسیۆنی دوژمن دەست پێدەکات، کاتژمێر نزیکی ٧ گوێمان لە دەنگی کۆبراکان بوو، بەسەر کەمپەکەمان دەسوڕانەوە، جارێکیان بەسەر ئەو زنێیەشەوە سوڕانەوە کە ئێمە لە نزیکی بووین، ئەو شوێنەی لێی بووین ئەگەر سەربازیان لێدابگرتایە مەحاڵ بوو ڕزگارمان ببێت، هەموو شتێکمان بە تەسادوفەوە گرێدابوو، ماوەیەکی زۆر هێشتا دەنگی کۆپتەرە کۆبراکان دەبیستران، ئەگەر دەنگیان نەمایە ئەوا ئێمەش لە مەترسییەکی گەورە ڕزگارمان دەبوو.

بۆئەوەی بگەینە لای هەڤاڵ قارەمان و گرووپەکەی ئێوارە کەوتینە ڕێ، زۆر پەرێشان ببووین، شاهین بەردەوام سەرقاڵمان بوو هەمیشە بۆڕێکردن زۆر لێدەکردین، ئەوانەی لەدواوە دەمانەوە دەیانیکردە کۆڵ و دەیانهێنانەوە و دەچووە ژێر باڵی هەڤاڵە ماندۆکان و هاوکارییانی دەکرد و نەیدەهێشت بۆساتێکیش بێت ڕابوەستین، ئەوانەی کە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن کەدادەنیشتن هەندێکجار لێیان توڕە دەبوو، زۆرجاریش بەدەم پاڕانەوە هەڵیانی دەساند تاکو بکەونەوە ڕێ، ڕێنەکردنی باشی هەڤاڵە کچەکان شاهینی زۆر توڕە کردبوو، هەرچەندە زۆرمان لێدەکردن کە بۆئەوەی باشتر ڕێ بکەن چەکەکانیان یان جانتاکانیان بە ئێمە بدەن، بەڵام قەبوڵیان نەدەکرد و وەک مەسەلەی غرووریان لێکردبوو، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەم هەڵوێستەی هەڤاڵە کچەکان مایەی شانازی ئێمە بوون و بەم کارەیان سەربڵند بووین، ئەمە تەنها مەسەلەی غروریش نەبوو ئەم هەڵوێستانە ئەوەیان دەسەلماند کەدەیانویست لەهەمبەر نەهامەتی و نارەحەتێکاندا تێبکۆشن و بەهەوڵو تەقەلای خۆیان بگەنە ئەنجام، هەڤاڵە کچەکانیش هەر ئەمەیان دەکرد.

زنی چەت لەهەمانکاتدا چەندین گوندی بەخۆیەوە گرێدابوو، دەبوایە سەرەتا بچونایەتە گوندێکەوە کە پێشوتر لەناو خۆمان دەستنیشانمان کردبوو، لەشەودا کەلەناکاو تیشکی گڵۆپەکانی گوندەکەمان بینی بەختەوەر بووین کە ئەم تیشکانە بە نزیک دەزانران، بەڵام بەلای کەمەوە دەبوایە کاتژمێرێک ڕێ بکرایە بۆ پێگەیشتنی، هەنگاوەکانمان خێراترکرد، بەڵام لەکاتی ئەم خێرابونەماندا ئەوانەی نەخۆش بوون لەدواوە دەمانەوە، دوای ماوەیەک گرووپەکەمان لەیەک دابڕان، شاهین دەیزانی کە نابێت لەوەزیاتر چاوەڕوانی بکەین هەربۆیە شاهین لەدوای خۆی بەرخودانی جێهێشتبوو خۆی گەیاندە لای ئێمە، بەهەڤاڵەکانی لای خۆی وت کە بچن شامیل و بەرخودان بهێنن کەلە دواوە مابونەوە، هەرچەندە شامیل بە فەرمانی شاهین بەختەوەر نەبوو، بەڵام ڕێگری لەهاوکاری هەڤاڵانیش نەکردبوو، کە نزیک گوندەکە بوینەوە شاهین قارەمانی بینی کەلە چاوەڕوانی ئێمەدابوو، بەم شێوەیە بەبێ ئەوەی شەهید بونمان لێبێتە ئاراوە کەمپەکەی خۆمان جێهێشتبوو.

لە گوندەکە خواردنیان ئامادەکردبوو بۆنەکەشی دەگەیشتە لووتی هەڤاڵان، لەژووری ماڵێکدا زۆپاکەیان زۆر بەباشی گەرم ببوو، ئێمەش بۆئەوەی جلوبەرگەکانمان وشک بکەینەوە خۆمان لە زۆپاکە نزیک کردبۆوە، بەڵام ناڕەحەتییەکی ترمان بۆ پەیدابوو ئەویش ئەوەبوو لەدوای گەرم بونەوەمان ئەسپێکانی ناو لەشمان کەوتنەوە هێرشکردنمان، هەتا لەشمان گەرم ببوایەتەوە دەخورا، هەتا زیاتر پشتمان بخوراندایە سوور دەبۆوە و دەبوو بە برین، کاتێک هەموومان بۆنان خواردن دانیشتین هەڤاڵ قارەمان هەستی کرد کە بەرخودان لەناوماندا نییە، ئەمەشی لە شاهین پرسی، کاتێک شاهین سەرقاڵی گێڕانەوەی مەسەلەکان بوو لەناکاودا شامیل خۆی کرد بە ژووردا، بەڵام بەرخودانی لەگەڵ نەبوو، قارەمان پێش شاهین کەوتوو پرسیاری بەرخودانی لە شامیل کرد، شامیل بە دەموچاوێکی گرژاوییەوە وتی کەچووە بۆ ئەو شوێنە کە شاهین پێیووتبوو بۆ هاوکاریکردنی بەرخودان، بەڵام نەیدۆزیوەتەوە، شاهین خەریک بوو شێت

ببێت و له شوێنەکەی خۆی فڕکەی کرد. بەبێ ئەوەی بەکەس هیچ بڵێت له ژوورەکە چووە دەرەوە. دوایش پالۆش بەدوایدا چوو. قارەمان ئیشاراتی بۆکردم که منیش بچم هەربۆیە منیش له ژوورەکه چوومه دەرەوە. زۆر به خێرایی ماوەی کاتژمێرێک ڕێگەمان کرد. وادیاربوو شاهین هەستی بەوە نەکردبوو که زۆر له دوور بەرخودانی جێهێشتووە هەربۆیە لەبەرخۆیەوە بۆڵەبۆڵی بوو. کەگەیشتینە لای بەرخودان خەریک بوو خۆر هەڵبێت. بەرخودانمان بینی لەسەر ئەژنۆ بوو لەسەرمادا خەریک بوو ڕەق ببێتەوە. جانتاکەی کردبۆوە. بەڵام که هیچ خواردنێکی تێدا نەدۆزیبۆوە بەسەر ئەژنۆوە بەسەر جانتاکەیدا کەوتبوو. بەرخودان نیوە لەهۆشخۆچویەک بوو هەروەها نەیدەتوانی قسەش بکات. شاهین کەوتە مەساجکردنی لەشی بەرخودان. دەست و قاچەکانی ڕانەوەشان و بۆئەوەی هۆشی بێتەوە سەرخۆی بە هێواشی زللەی لێدەدا. هەرچەندە چەندجارێک چاوەکانیشی دەکردە. بەڵام هێشتا نەهاتبووە سەرخۆی. شاهین نیتاقەکەی خۆی دەرهێنابوو به هەموو توانایەکی به نیتاقەکەی له قاچەکانی بەرخودانی دەدا. بەڵام هەرچییەککرا بەرخودان هۆشی نەهاتەوە سەرخۆی.

پالۆ وتی پێویستە بەرخودان نان بخوات. لەدوای ئەم قسەیە شاهین زۆر بەخێرایی له گیرفانی شەکری دەرهێنا. سەرەتا شاهین شەکرەکەی خستە ناو دەمی خۆیەوە و توانیوەی و دوایش خستییە ناو دەمی بەرخودان. ئێمە نەماندەتوانی بەرخودان بەجێبهێڵین و لەهەمانکاتدا کات درەنگ ببوو. نەشماندەتوانی بگەڕێینەوە بۆ گوندەکە. شاهین بەرخودانی کردە کۆڵی خۆی و دەستی کرد بە ڕێکردن. بەڵام هەر ١٠٠ مەترێک ڕێگەمان کرد. بڕیارماندا کەبەرەو دارە تووەکان بڕۆین کەلە خوارووی ڕێگەکەدا بوون. شاهین بەرخودانی لە کۆڵ داگرت و ئەمجارەیان قاچی گرت و کەوتە ڕاکێشانی بەرخودان. بەرخودان بەسەردەمدا بوو. کەبەزەوێکەدا شاهین ڕایدەکێشا هێشتا ئاگای لەخۆی نەبوو. کەلەگردەکە هاتینە خوارەوە و گەیشتینە ناو دارەکان ئەمجارەیان پالۆ بەرخودانی کردە کۆڵ. شانس یاوەرمان بوو. لەپشت دارەکاندا شوێنێکمان دۆزییەوە کەبۆ مانەوەمان

گونجاو بوو، ئێره ئەو شوێنەبوو کە کوونە ورچ بوو کە شوێنی سێ کەسی تیادەبۆوه، بەرخودانمان لەوێ درێژ کرد، ئێمەش هەتا ڕۆژ بۆوه کەوتینە ئێشکگرتن، بە ڕۆژ کەزانیمان هەموو شوێنێک ئارامە ئاگرمان کردەوه، بەرخودان هۆشی هاتەوه سەرخۆی، بەڵام ئەمجارەیان دەیووت کە پشتی دێشێت، شاهین تەماشای پشتی کرد، بەڵام خۆزگە تەماشامان نەکردایە، برینەکانی پشتی ئێمەی شۆک کرد، ئەسپێکان تەنها بەوەوە ڕانەوەستابوون کە تەنها خوێنی بمژن بەڵکو هەموو پشتیان کردبوو بە برین لەهەمانکاتیشدا بەهۆی ڕاکێشانەکەیشەوه هەموو برینەکانی خوێنیان لێهاتبوو، ئێمە نەدەرمان و نە برینپێچ و نە دیتۆلیشمان پێبوو، هیچمان نەبوو نەماندەزانی چی لێبکەین تەنها پێمان وت کە کەمێک پشتت ڕووشاوه، ئەوەی پێمان بوو شەکر و چای بوو، چایمان خواردەوه و چاوەڕێی ئێوارەمان کرد، ئێوارە گەیشتینەوه لای هەڤاڵ قارەمان، ئێمە شوێنی دوو کەمپی خۆمان گۆڕی بوو ئێستاش لە شوێنێکی نە گونجاودا گیرسابوینەوه، چەندین کاتژمێر ڕێگەمان کردبوو، ئێمە بەدوای دۆزینەوەی شوێنی تازەی کەمپدا بووین کە زۆر پێویستیمان بەمەبوو، بەڵام ڕوبەڕووی سوپرایزێک بوینەوه کە هیچ چاوەڕێمان نەدەکرد، ئەم سوپرایزە ناخۆشانەی کە دەهاتنە ناراوە مۆراڵمانی خراپ دەکرد، ئێمە لێره بەدواوە بەرگەی خیانەتێکی ترمان نەدەگرت، مەخابن شێخ مووس کۆنترۆڵی لەدەست دابوو ئەویش شێت ببوو، بەرخودانیش زوو، زوو لەهۆشخۆی دەچوو، شیار و عەگید نەیاندەتوانی ڕێ بکەن، سەرەڕای هەموو ئەم نەهامەتییە و نەگبەتییەی یەخەمانی گرتبوو ئەمجارەیان لەناومان شامیل هەڵات).

ئاریا کتێبەکەی داخست.

باگەر لەگەڵ یەکەم تیشکی خۆردا بەئاگا هاتبۆوە، جگە لەو گەریلایانەی کە لەپێناو نووستنی یەک بۆ دوو خولەکێک زیاتر کە گوێیەکانی خۆیان گرتبوو لەژێر نایلۆنەکەدا بە گشتی هەموویان بەئاگا بوون، بەڵام شاهین سەری هەموو ئەوانەی هەڵدابۆوە کە دەیانویست تەمەڵی بکەن و زیاتر بنوون، بەرچەم بە گشتی گەریلایەکی بێ قوراڵ نەبوو، بەڵام ئەویش هێشتا بەئاگا نەهاتبۆوە، برسێتی ئەویشی بێ حەوسەڵە کردبوو، چەند ڕۆژێک بوو ئەویش کێشەی ڕیخۆڵەی هەبوو، مەعیدەی گەریلاکان دەهۆڵ و زوڕنایان لێدەدا، بەسەر ئەم برسێتییەشدا نەخۆشی بەرچەم زیادی کردبوو هەربۆیە دەیویست خەوێک بکات کە هەرگیز بەئاگا نەیەتەوە.

کاتێک گەریلاکان بەئاگا هاتنەوە یەکەم کاریان کۆکردنەوە و قەدکردنی ئەو لایلۆلانە بوو کەبەسەری خۆیاندا دادابویان، ئەگەر ئەم نایلۆنە چادرانەیان کۆنەکردایەتەوە هەر لە دوورەوە کۆپتەرەکان دەیانتوانی بیانبینن، لەم چاڵەدا بەهۆی خەوەوە ئەگەر کارەسات بهاتایەتە ناراوە ئەمە زۆر ناخۆش دەبوو هەروەها ئاکامەکەشی زۆر خراپ دەبوو، هەربۆیە لەم حاڵەتانەدا خەو تەنها بێ قوراڵی نەبوو بەڵکو بەتاوانیش دەژمێردرا.

شاهین هاواری لە بەرچەم کرد، لە دەنگ بەرزکردنەوەکەیدا تووڕەیی پێوەدیار بوو، کەزانی سەرەڕای ئەم هاوارەشی بەرچەم گوێی لێنەبوو، ئەمە زیاتر تووڕەی کردبوو، سەرەڕای ئەوەی شاهین چوو نایلۆنەکەی سەر بەرچەمی هەڵدایەوە کەچی بەرچەم هێشتا لەخەو هەڵنەسا، بەپێی چەند جارێک لە پێیەکانی بەرچەمیدا، بەڵام بەرچەم نقەی نەکرد، شاهین لەبەرخۆیەوە وتی ئەرێ ئەمە مردووە، هەڤاڵ بێستا لە دوورەوە لەوانی دەڕوانی، بێستا خۆی پێڕانەگیرا و لە شوێنەکەی خۆی هەڵسا، بێستا لە شوێنەکەی خۆی بەفری کۆکردەوە و لەناو لەپی گرمۆڵەی کرد، تۆپەڵە بەفرەکەی لە پشتملی بەرچەمەوە خستە ناو پشتی و بەخێرایی گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و دانیشتەوە، بەرچەم نەیدەزانی چی بووە و فڕکەیەکی کرد، تۆپەڵە بەفرەکە هەراسانی کردبوو، لەلایەکەوە سەرقاڵی دەرکردنی بەفرەکانی پشتی بوو

لەلایەکی تریشەوە دەیووت کێ ئەمەی کرد، شاهین وتی "منیش نازانم، بۆ چییان کردووە؟ "شاهین پێدەکەنی، بەرچەمیش بە تووڕەبوونێکەوە وتی "مەبەستم تۆپەڵە بەفرەکەیە کێ خستییە پشتملمەوە؟ "پالۆش وتی "بەخوا منیش نازانم". بێستا چەند مەترێک لەولاوە هەروەکو ئەوەی ئاگای لە هیچ نەبێت پشتی لەوان کردبوو، بەرچەم تەماشایەکی بێستای کرد، بە هێواشی بەرەو بێستا چوو، بەرچەم بەدەم ڕێگەوە بەفری کۆکردەوە و گڕمۆڵەی کرد و لەناکاو خستییە ناو پشتملی بێستاوە، بێستا شڵەژا، لەتاو سەرمای بەفرەکە نەیدەزانی چی بکات، ئەگەر دەمی نەگرتایە قیژەی دەکرد، بێستا پێیووت "ئەوەچییە بۆوا دەکەیت؟ "بەرچەمیش وتی "ئەی بۆ تۆ وادەکەیت؟ "بێستاش وتی "بۆ هەڵناسیت نازانیت درەنگە! "بەرچەمیش پێیووت "یەعنی چی ئەگەر چەند خولەکێک دوا کەوتبێتم خۆ دونیا خراپ نابێت، ئێوە پێتان وایە ئەم شۆڕشە لەسەر من یەکی کەوتووە!"

ئەگەر باگەر لە دوورەوە هاواری لێنەکردنایە ئەم کێشمەکێشەی نێوان بەرچەم و بێستا لەوەدەچوو کە درێژە بخایەنێت، دوای بیستنی دەنگی باگەر کشو مات بوون، ١٥ ڕۆژ بوو برسی بوون، نۆکەکانیشیان تەواو ببوو، نۆکەکەیان کە هەفتەیەک لەمەوبەر کۆتایی پێهاتبوو ببوو بە هۆکاری ئازاری مەعیدەیان و کەسیان نەیاندویست کە تەنانەت گوێشیان لەناوی نۆکیش بێت، هۆیەکەی نەدەزانرا کە چی بوو ئەمڕۆ شاهین حەوسەڵەی نەبوو، ئەوکاتەی بەرچەمی هەڵساندبوو ئەمەی پێوەدیار بوو، لەسەر پشت خۆی درێژ کردبوو لە ئاسمانی دەڕوانی، دیاربوو کە شتێک سەرودڵی گرتبوو، شاهین وەک بەرچەم نەبوو، ڕانەهاتبوو کە تووڕەیی خۆی بشارێتەوە، هاوارکردن باشترین شت بوو بۆ شاهین کە دڵی ئاوی پێبخواتەوە، شاهین لایەنگری ئەوە نەبوو کەلەکاتی دڵتەنگیدا مرۆڤ خۆی گۆشەگیر بکات، بەگوێرەی شاهین چی پێویست بکرایە بۆ وتن لەناو هەموو کەسێکدا بهێنرێتە زمان، بەڵام ئەمڕۆ خۆی گۆشەگیر کردبوو، شاهین ئەوەی تەحەمول نەدەکرد کەلەبەرچاوی خۆی برسێتی و ناخۆشی بانگی مردنیان بۆبکات، ئێستا باشترین شت کەبیکات ئەوەبوو شێوازی بەرچەم بەکار بهێنێت و خۆی لە سوچێکدا گۆشەگیر بکات.

ئەم ڕەوشەی شاهین بەرچەمیش هەستی پێکردبوو، تەماشایەکی شاهینی کرد، دوای ئەوەی ماوەیەک لێی ورد بۆوە پاشان چووە پەنای و دانیشت، بەرچەم بە کپییەک پێیووت "سڵاو هەڤاڵ ". شاهین بێ حەوسەڵەیی خۆی نیشانداو بە نەخوازیارییەوە وەڵامی دایەوە، بەرچەم پێیووت "خۆهیچ لەئارادا نییە؟ ""نا هیچ نییە تەنها دەمەوێت خۆم درێژکەم ". بەرچەم باوەڕی بەم شێوازی وەڵامە نەبوو، زۆری پێنەچوو پالۆ و نەعمان و غالیب و ئازادە وەحشیش چواردەوریان گرت، غالیب وتی "من دەڵێم. ... ". بەڵام پێش ئەوەی قسەکەی تەواو بکات شاهین قسەکەی پێبڕی و وتی "پێت دەڵێم تۆ هیچ مەڵێ چونکە دەستی خۆت لە خوێن سوور دەکەیت ". غالیب دڵی بەم قسەیە خۆش بوو، بەڵام بە بڕینی قسەکەی دڵتەنگ ببوو، وای نیشاندا کە گوێی بە موداخەلەکەی شاهین نەداوە و پاشان وتی "من دەڵێم ئێمە هەر بەخۆڕایی لێرە کەوتوینەتە چاوەڕوانییەوە، ئێستا هیچ سەربازێکی دوژمن لە دەربەندی عەلی نەماوە، ئەو تەنەکە پڕ لە قاورمانەی هەڤاڵ دڵگەش بۆی ئامادەکردبوین لەوێ چاوەڕێمان دەکەن، بابچین ئەگەر ئەو تەنەکە قاورمانەش نەمابێتن لە ئەشکەوتەکە دەمێنینەوە "، وەحشەت چاوی لە بەرچەم بڕی بوو، بەرچەمیش وەک گەریلا کپەکانی تر بەمە ناڕەحەت ببوو. شاهین خۆی پێڕانەگیرا و وتی "وەحشەت دەتوانیت باشەیەکم لەگەڵدا بکەیت؟ "وەحشەتیش بە زەردەخەنەیەکەوە وتی "بێگومان هەڤاڵ ئێمە لەپێناو هەڤاڵی خۆمان گیانمان بەخت دەکەین ". شاهینیش وتی "زۆر باشە، ئەگەر دەتەوێت دادگایەکەی ئێمە بڕیاری کوشتنت نەدەن ئەوا خۆت بڕیاری کوشتنی خۆت بدە، ئاقڵ بە دەست بگرە بە چاوەکانتەوە ". هەموویان لە قسەکانی شاهین تێگەیشتبوون و پالۆش بزەی سمێڵی دەهات، پالۆ وتی "بەڕای من باناوی تۆ وەحشەت نەبێت با پێتبڵێین وەحشەتی زیندەیی ". وەحشەت لەم قسەیە حاڵی نەبوو هەربۆیە وتی "مەبەستت چییە؟ "پالۆش وتی "هەڤاڵ باناوت وەحشەت زیندەیی بێت زیندەیی ". وەحشەت بەشێوەیەک وتی ئێ، ئێ واینیشاندا کەلەم قسەیە حاڵی بووە، بەڵام بەهەموو شێوەیەک حاڵی نەبوونی پێوە دیاربوو، پاشان وتی "بۆمن هیچ کێشەیەک نییە ". شاهین و بەرچەم سەرقاڵی قسەکردن بوون، لەلایەکی

تریشەوە نەعمان و پالۆ و غالیب لەناو خۆیاندا گەنگەشەی ئەوەیان بوو کەلەم چاڵە چۆن ڕزگاریان دەبێت، کاتێک باگەر لێیان نزیک بۆوە هەموویان هەڵسانە سەرپێ، باگەر وتی "گەنگەشەی چیتانە؟ "غالیب وتی "ڕێگەکانی ڕزگاربوون "، باگەریش پێیووت "باشە دۆزیتانەوە؟ "غالیبیش وتی "نەخێر هێشتا نا "، باگەر وتی "پیلی بێتەلەکەم تەواو بووە کەستان پیلتان پێیە؟ "شاهین ئیشاراتی کرد بۆ حەمیدۆ، حەمیدۆ کەمێک لەولایانەوە سەرقاڵی پاککردنەوەی ئەو چەکەی بوو کەبەهۆی ئازایەتێکەی لەشەڕێکدا خەڵاتیان کردبوو، باگەر چووە لای حەمیدۆ و لێی پرسی "پیلت هەیە؟ "حەمیدۆش وتی "٤ دانەم پێیە "، "گەورە یان بچووک؟ ""پیلی قەڵەمین "، بەم شێوەیە باگەر کێشەی نەبوونی پیلی بۆخۆی چارەسەر کرد، ئیتر لەمەودوا بەئاسانی دەیتوانی بێتەلە مارکە ستاندارەکەی کە حافیزەی هەبوو بەکار بهێنێت، سەرەتا باگەر لە بێتەلەکەیەوە بە شفرە بانگەوازی بۆ هەڤاڵ ئایهان کرد، کە ئایهان وەڵامی نەدایەوە ئەمجارەیان بانگەوازی بۆ ئیبراهیم کرد، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، دوای ئەوەی ماوەیەک سەرقاڵی بانگەوازی بوو کەکەسیش وەڵامی نەدایەوە ئیتر وازی لە بانگەوازی هێنا، چەندین ڕۆژ بوو گوێی بۆ بێتەلەکانی دوژمن ڕانەدێرابوو، ئەو شفرەیەی بەکاری هێنا کە پێشوتر فێری ببوو بەبێ ئەوەی سەرقاڵی بکات دۆزیەوە، قسەکانیان زۆر ڕوون بوو، باگەر بەختەوەر بوو کە توانی بوو گوێی لە قسەکانی دوژمن بێت، بەڵام قسەکردنیان بەو شێوە ڕوونە نیگەرانی کردبوو، لەدڵی خۆیدا وتی لەوانەیە زۆر لێمانەوە نزیک بن، باگەر تەماشای شاهینی کرد و پێیووت "لەوەدەچێت هێزی دوژمن لە چیای ماران بن "، دوایش خۆی و شاهین دووربینەکەیان هەڵگرت و بەو هەورازە هەڵگژان کەلە چاڵەکەیدا ئەمانی شاردبۆوە، دەتوانرا لەسەر ئەم هەورازەوە بە ئاسانی چیای ماران ببینرێت، کاتێک کەمێک سەرنجیاندا تەنانەت نەیانتوانی سەربازەکانیش بژمێرن، جارێکی تر باگەر خۆی بە بێتەلەکەیەوە سەرقاڵ کرد، شاهین پێیووت "شفرەیەکی تریش هەیە ئەگەر حەزدەکەیت با ئەو شفرەیە تاقی بکەینەوە؟ "باگەریش وتی "باشە "، دوای ماوەیەک لەسوڕانی دوگمەی بێتەلەکە دۆزیانەوە، هەروەکو هەموو جارێک قسەکانی دوژمن کە

له نێوان خۆیان دەیانکرد له جوێن پێکهاتبوو، هەر لەبەر ئەو جوێنانەش بوو که سەرکردایەتیان بڕیاری دابوو که گوێ گرتن له دوژمن سنوردار بکرێت، لەناوخۆیاندا ئەفسەرەکان دەیانووت. .... خوێڕی کوڕی خوێڕی لێره ڕەق بوینەوه. .... چێت لێبکەم قوڕمساغ خۆمن تۆم نەناردووه بۆئەوێ. .... کێر، به ( قو )، ژن و دایکی ئەوەی که من و تۆی ناردووه بۆ ئەم شوێنه. ..... پەلەمەکه دێن پەلەمەکه. .... پەلەی چی قوڕمساغ شەشیان مردن و چەند کەسێکی تریشمان پێیان سوتا. ..... دەگرین، دەگرین. ..... مادام ئەوەنده باوەڕیان بەخۆیانه با ئەو دایک حیزانه خۆیان بێن بۆ ئێره. .... هەتا کاتژمێرێکی تر کۆپتەرێک دێت دانبەخۆتدا بگره.

باگەر به قسەکانیان پێدەکەنی، بەڵام که گوێی له جوێنەکانیان دەبوو سوور دەبۆوه، لەناکاو دەنگێکی گڕاوی له بێتەلەکەوه بەرزبۆوه، دەنگه که دەیووت "ئەگەر گوێت لێمه بەتۆ دەڵێم، ئەگەر باگەریت یان ئیبراهیم فەرق ناکات وەرن لاشەکانتان هەڵگرنەوه ئەگینا داڵو گورگ ئەیانخۆن، ئەی ئێوه هاوخەبات نین، ئەی کوا لەپێناو یەکتر گیانی خۆتان ئەبەخشن، بۆچی لاشەکانتان جێهێشتوو هەڵاتن؟ "باگەر له سیمایدا ئەو پێکەنینەی کەمێک لەمەوبەری نەمابوو، شاهینیش بەمە سەرسام ببوو، هەردووکیان لەمەبەستی ئەم قسانه حاڵی نەبوون، لەیەکەمی هێرشی دوژمن بۆسەر کەمپەکەیان تەرمی شەهیدەکانیان هەڵگرتبۆوه، ئەوەی که هەواڵیان نەدەزانرا تەنها عەلی موسا و ۲ هەڤاڵەکەی تر و ساریا و ئاریا بوو، ئەمجارەیان له بێتەلەکەوه دەنگێکی جیاوازتر بیسترا دەیووت "لەپشت بەردەکەوەبن "، شاهین به باگەری وت "مەبەستیان شەلالەکەیه ". باگەر بەدووربین تەماشای شەلالەکەی کرد، سەربازەکان بەیەک ڕیز لەپشت شەلالەکەوه قۆناغی چەکەکانیا گرتبوو لوولەکانیشیان له زەوێکا دەخشا و بەرەو ئەشکەوتەکه دەچوون، باگەر هاواری له هەڤاڵەکانی کردو پێیووتن "بەبێ ئەوەی زۆر سەر بەرز بکەنەوه تەماشای شەلالەکه بکەن، دەبینن لەئێمه پەرێشانترن ". پالۆ وتی "تەقەیان لێبکەین؟ "باگەر وتی "تەقه لەچی دەکەیت؟ "پالۆ جگەلەوشەی سەرباز هیچی تری نەووت، باگەر وتی "کێ لەناوماندا دەتوانێت بەباشی ڕێ بکات؟ "پالۆ هیچی

نەووت، تەماشایەکی سەربازەکانی کردەوە و ئەمجارەیان لە دڵی خۆیدا وتی "باجارێکیش ئێمە دەستیان لێبوەشێنین خۆ کفر نابێت"، ئەمجارەیان پالۆ بە باگەری وت "چەند کەسێکمان دەچین دەستیان لێدەوەشێنین و دەگەڕێینەوە "، باگەریش وتی "ماهۆ دەڵێت چی؟ "پالۆ وتی "ئەگەر دوژمن هێرشتی بۆهێنا تۆ خۆت دوورخەرەوە، ئەگەر دوژمن ڕاوەستا تۆ ئەوان نیگەران بکە، ئەگەر دوژمن هەڵات تۆ بەدوایدا بڕۆ "، باگەر وتی "ئەمە قسەیەکی نەستەقە، من ئەمەم نەزانی بوو، بەڵام ڕاکردن بەدوای دوژمندا بە ئێمەمانان ناکرێت کەماوەی ١٥ ڕۆژە نانمان نەخواردووە و برسین، تێگەیشتیت؟"

گەنگەشەکەی نێوانیان تاماوەیەکی خایاند، هەروەکو پێشویان دەکەوتنە چاوەڕوانییەوە، دوای نیوەڕۆ بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بزنە کێوییەک هاتە بەردەم چاڵەکەیانەوە، دوایش دانەیەکی تر و دانەیەکی تریش، بەکاوخۆیان لە گەریلاکانیان دەڕوانی و دەڕۆیشتن بەرێی خۆیانەوە، بزنە کێوێکان نەترسان و تیزیان نەکرد و بەکاوخۆیان دەڕۆیشتن، ئەگەر لەکاتێکی تربوایە ئەم بزنە کێویانە خۆیان نیشانی گەریلا و کەسی تر نەدەدا، ئەگەر بزنەکان بترسانایە و هەڵبهاتنایە لەوانەبوو سەرنجی سەربازەکانی سەرەوەیان بۆلای خۆیان ڕابکێشایە، بەرچەمیان وتی "ئەم بزنە کێویانە هەموو شتێک دەزانن! "دوایش بەرچەم باسی لەم جۆرە مەسەلانەی بۆکردن و مەسەلەی هەڵاتنی حەزرەتی موحەمەدی بە نمونە هێنایەوە کە چۆن جاڵجاڵۆکە لەبەردەم ئەشکەوتەکەی خۆی تیا شاردبۆوە ماڵی درووست کردبوو، کاتێک بزنە کێوێکان ڕۆیشتن، بەڵام دانەیەکیان لەبەردەم چاڵەکەیان وەستایەوە، چاوی لە گەریلاکان بڕی بوو، هەموویان سەرسام ببوون، کاتێک بەرچەم ویستی لێی نزیک ببێتەوە لەناکاو بزنە کێوێکە چرپەیەکی کردوو هەڵات، دەهات و دەچوو، لەچاڵەکە دوور نەدەکەوتەوە.

شاهین ڕویکردە بەرچەم، هەرچۆنێک بێت ئەم مەسەلەیەی بزنە کێویانە کاری بەرچەم بوو، بەرچەم هێشتا ئەو بزنە کێویەی لەیاد نەکردبوو کە ساڵێک بەخێوی کردبوو، شاهین پێیووت "ئەمە بزنە کێوێکەی تۆ نەبێت؟ "پالۆش وتی "نا ئەوەی ئەو کوێر بوو، بڕوانە ئەمە لە جنۆکە دەچێت"، شاهین وتی "لەوانەیە

لەسەر بەردێک کەوتبێتە خوارەوە و چاوەکانی چاک بوبێتەوە ". غالیبیشیان وتی "لەوانەیە دوای کەوتنە خوارەوەی وتبێتی لەخوا بەزیاد بێت چاوەکانم دەبینن ". پالۆش وتی "نا، نا، وانەبووە، ئێوە لە کوێربوونی بزنە کێوێکە حاڵی نەبوون، بزنە کێوێکە فەلسەفانە کوێر ببوو ". شاهینیش بە کپییەکەوە وتی "پالۆ دەستی پێکردەوە ". بێستاش وتی "ئەرێ پالۆ ئەمە فەلسەفەیەکی چۆنە؟ "پالۆ لەو حاڵەتەدا نەبوو کە شیکار بۆ قسەکەی خۆی بکات، چونکە خۆیشی نەیدەزانی کەچی وتووە و مەبەستی چییە. دوایش پالۆ وتی "ئەگەر گرنتی پاراستنی ژیانم دەکەن قسە دەکەم!؟ "بەرچەمیش وتی "قسە بکە بەئارەزووی خۆتان قسەبکەن دەزانم مەبەستان چییە ". پالۆ نەیدەزانی چی بڵێت لە دڵی خۆیدا وتی ئەم زمانەم بۆتۆتە بەڵای سەرم. دوایش پێیانیوت "ئێستا قسە ناکەم، هەرکاتێک گونجا پاشان بۆرای گشتی ڕوونکردنەوەی پێویست دەکەم ". غالیب دەیزانی کە پالۆ لەقوڕدا گیری خواردۆتەوە و کەمێکی تریش بەرچەم هێرشی بۆدەهێنێت هەربۆیە نیشاراتێکی بۆکردن و پێیانیوت "بزنە کێوێکە بگرین؟ "هەموویان بیریان لەم پێشنیارەی غالیب کردەوە، بەڵام لەوەدەچوو کە غالیب هەستی بە هەڵەی ئەم قسەیەی خۆی کردبێت هەربۆیە دەموچاوی گرژ کرد، لەهەمانکاتدا بزنە کێوێکە دوور نەدەکەوتەوە، هەتا گەریلاکان نەجوڵایەنەتەوە بزنە کێوێکەش نەدەجوڵایەوە، لەوەدەچوو شاهین پێشنیارەکەی غالیبی بەجدی وەرگرتبێت، شاهین بیری لەچۆنییەتی گرتنی بزنە کێوێکە دەکردەوە، لەناکاو شاهین وتی "چۆن بیگرین؟ "غالیب بەشێوەیەک ویستی قسەبکات کە کەس گوێی لێ نەبێت و دەمی نایە گوێی شاهین و پێیووت "شێوازی ئەمەریکی ". شاهینیش وتی "چی شێوازێکی ئەمەریکی؟ "غالیب وتی "بەڵێ شێوازی ئەمەریکی بەلاتەوە سەیرە، تاقیکردنەوەکەشی بەخۆڕاییە ". شاهین بەشێوەیەک دەنگی بەرز کردەوە کە باگەریش گوێی لێبێت و وتی "باشە دەتوانی سەرکەوتن لەم کارە بەدەست بخەیت؟ "غالیب وتی "بێگومان سەرکەوتن بەدەست دەخەم تەنها باگەر هەڤاڵ ڕێگە بدات تەواو ". باگەر گوێی لە قسەکانیان بوو بە غالیبی وت "ئەگەر دەتوانی بیگریت بڕۆ بیگرە، بەڵام بەمەرجێک نەیەڵیت سەربازەکانی سەرەوە هەستت پێبکەن ". غالیب قۆڵەکانی

هەڵکرد، هەموویان بۆدواوە پاشەکشێیان کرد. سەرەتا پشتوێنەکەی کردەوە، دوایش پشتوێنەکەی کرد بە ئەڵقە، دیاربوو کە غالیب لەکاتی سفیلیدا تەماشای فلیمی کاوبۆی زۆر کردبێت، لەوە دەچوو بەیەک فڕکەیەک بزنە کێوێکە بگرێت، بەڵام کاتێک جامانەکەی لەسەر سەری ئەسوڕانەوە بزنە کێوێکە لە شوێنەکەی خۆی فڕکەی کرد. غالیب پشتوێنەکەی تێگرت، بەڵام بزنە کێوێکە فڕکەی کردە شوێنێکی تر، ئەمجارەیان غالیب بۆی سوڕایەوە و ڕووی تێکرد، غالیب کەوتە سوڕدانی پشتوێنەکەی، بزنە کێوێکە وەک ئەوە تەماشای غالیبی دەکرد کەلەدڵی خۆیدا بڵێت ئەرێ ئەم کابرایە بۆوا دەکات، غالیب پشتوێنەکەی تێگرت، بەڵام پشتوێنەکە لە دووری بزنە کێوێکە کەوت، نێوان بزنە کێوێکە و پشتوێنەکەی غالیب دوو سێ مەترێک بوو، ئەم کارەی غالیب و سەرنەکەوتنەکەی هەموویانی دابووە پێکەنین، ئەگەر باگەر موداخەلەی نەکردایە لەوەدەچوو کە غالیب ماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە خۆی بە بزنە کێوێکەوە سەرقاڵ بکردایە.

هەتا ئێوارە بزنە کێوێکە لە چواردەوریان هات و چوو، بە بچوکترین جوڵانەوە و چرپەی دەنگ دوور دەکەوتەوە، هەتا ئێوارە نەیهێشت کەس لێی نزیک ببێتەوە بەرچەم بەردەوام بە درێژایی ڕۆژ چاوی لەسەر بزنە کێوێکە بوو. دڵی بۆ دەسوتا کە ماوەیەک بزنەکەش خواردنی نەخواردبوو، لەهەمانکاتدا بەرچەم بەوە غەمگین بوو کە نەیدەتوانی هیچی بۆبکات، بەرچەم هەرگیز لایەنگری ئەوە نەبوو کە بزنە کیوێکان بکوژرێن، بەرچەم لە نەفرەتی کوشتنی بزنە کێوی دەترسا لەوانەش بوو ئەم باوەڕییەی لە عەلەوێتێکەیەوە سەرچاوەی گرتبێت، بەرچەم دەیووت گەورەترین گوناحی دونیا لە چاوە داخراوەکانی بزنە کێویدایە، هەربۆیە ئەو پێیوابوو کە نابێت چاوەکانی بزنە کێوی بەدەستی مرۆڤ بۆیەکجارەکی دابخرێن و خوێنیان بڕێژرێت، دەشیووت بە پێچەوانەوە لەوانەیە لەهەمبەر ئەم تاوانانە بزنە کێوی تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، بەڕای ئەو دەبوایە بزنە کێوی هەمیشە ئازاد بوایە و لەسەر ئەم بەردەوە بۆسەر ئەو بەردە بازی بدایە، ئەو پێیوابوو کە دەبێت ئەو چاوە جوانانەی بزنە کێوی هەرگیز لەیەک نەیەن و خوێنی تێکەڵی ئەم خاکە

نەفرەتییە نەبێت، بەرچەم توانی لە نێوان خۆی بزنە کێوێکەدا پەیوەندییەکی ڕۆمانسی درووست بکات.

ئەم پەیوەندییە ئاوێتەی ترس و خۆشەویستی بوو، بەرچەم بەردەوام باسی لە حەزرەتێک دەکرد بەناوی شالەقار کەلە سالی ٤٠ کاندا ژیاوە، بزنە کێوێکان لەم حەزرەتە نەترساون و هەر کە بینیویانە لە چواردەوری کۆبونەتەوە، ئەوانەی ڕاوە بزنە کێویان کردووە و بزنە کێویان کوشتووە لەبەر نزای ئەم حەزرەتە ڕزگاریان نەبووە، تەنانەت جارێکیان ڕاوچییەک گوێی بۆ وریاکردنەکەوەی حەزرەتی شالەقار نەگرتووە هەربۆیە بە قودرەتی حەزرەت کەوتۆتە ژێر هەرەسی بەفرەوە و مردووە.

کە ئێوارە داهات بزنە کێوێکەش لەناو تاریکیدا خۆی ون کرد، پێش ئەوەی تاریکیش دابێت باگەر بانگی شاهین و پالۆ و عیرفان و بێستای بۆلای خۆی کردبوو، باگەر پێیانیوت "ڕەوشی سەربازەکان خراپ دیارە، بەڵام لەبەرئەوەی تاکو ئێستاش نەکشاونەتەوە بەناچاری تاماوەیەکی تریش لێرە دەمێنینەوە، هەربۆیە پێویستە چەند هەڤاڵێک بۆپەیداکردنی ئازوقە ڕەوانە بکەین"، دوای ماوەیەکی کورت لە بێدەنگی، شاهینیان وتی "دەتوانین چەند هەڤاڵێک ڕەوانە بکەین"، پالۆش وتی "دەتوانین گرووپێک ڕەوانە بکەین". لەوە نەدەچوو کە کەسیان لەگەڵ ئەم پێشنیارە نەبوبێتن، هەموویان ڕازی بوونی خۆیان هێنابووە زمان، باگەر پرسی "باشە کێ دەچێت؟" عیرفان دەستی خۆی بەرز کردەوە، باگەریش لێی پرسی "قاچەکانت چاک بونەتەوە؟" ئەویش وتی "قاچەکانم باشن، هەڤاڵ جودی و ئافاتم لەگەڵ بنێرن بەسە". ئەم پێشنیارەیان قەبوڵ کرد و دوای خۆئامادە کردن هەرسێکیان کەوتنە ڕێ، بەدرێژایی ڕێگەیان چاویان بەو ئاگرانە کەوت کە سەربازەکان بەقەد پاڵی شاخەکانەوە دایانگیرساند بوو، بەبێ ئەوەی گوێ بە هیچ بدەن چەند کاتژمێرێک ڕێگەیان بڕی، بەدرێژایی ڕێگە هەرسێکیان لە نێوان خۆیاندا هیچ قسەیان نەکرد، هەرسێکیان بەدەم ڕێگەوە کەوتبوونە ناو دەریای خەیاڵی خۆیانەوە، سەرەڕای ئەوەی شەکەتیش ببون، بەڵام هیچ پشویان نەدا، هەناسە بڕکێ ببوون، کاتێک گەیشتنە نزیک یەکەم گوندی بناری چیای بۆزان لەئەژنۆ کەوتبوون و نەیاندەتوانی یەک هەنگاو

بنێن، ماوەیەک پشویاندا، دەمیان وشک ببوو، جەستەشیان ڕچیو بوو.

عیرفان وتی "بابچینە گوندەکەوە"، جودی بە نیگەرانییەکەوە وتی "ئەی ئەگەر دوژمنی لێبوو!" عیرفانیش وتی "ئەگەر دوژمنی لێبێت لێیەتی، لێشی نەبێت لێی نییە!" جودی تەماشای ئافاتی کرد، ئافات وتی "بەڕای من باشانسی خۆمان تاقی بکەینەوە". چوونە گوندەکەوە، گوندەکە زۆر کپ و خامۆش بوو، بەڵام هەربەچوونی ئەمان هەموو سەگەکانی گوندەکە کەوتنە وەڕین، ئەمەش مانای وایە کە هەموو خەڵکی ئاوایەکە بەئاگا هاتونەتەوە، ئەگەر دوژمن لە گوندەکە بونایە مەحاڵ بوو کە ئێستا هەست بە بوونی ئەمان نەکەن، دوای وەڕینی سەگەکان بە بەردەوامی یەک لەدوای یەک گڵۆپەکانی ماڵەکان داگیرسان، هەرماڵێک کە گڵۆپی دائەگیرسان یەکێکیان یان دەهاتە بەردەم دەرگا یان لە پەنجەرەکەیانەوە تەماشایەکی دەرەوەی دەکرد.

هەرسێکیان شڵەژابوون، دەبوایە زۆر بە خێرایی بچونایەتە ماڵێکەوە، کاتێک ماڵێکی تەنیای سەرپەڕی گوندەکەیان بینی عیرفان ئیشاراتی بۆکرد، بەڕاکردن بەرەو ئەو خانووە چوون، کە چوونە باخچەی ماڵەکەوە دەنگی حەپەحەپی سەگەکانیش نەمابوو، جارێکی تر کشوماتی باڵی بەسەر گوندەکەدا کێشا، هەرسێکیان ماوەیەک لە باخچەی ماڵەکە دانیشتن، کەسیان نەیاندەزانی کە خاوەن ئەم ماڵە کێیە، ماڵەکە دوو نهۆمی بوو، خانویەکی خۆش بوو، بە خانۆکەدا دیاربوو کە خاوەن ماڵەکە دەوڵەمەند بوو لەوانەش بوو دەستی لەگەڵ دوژمندا تێکەڵ بێت ئەمەش بەمانای خیانەت کردن دەهات، ئافاتیان وتی "بەگوێرەی خانۆکە بێت خاوەن ئەم ماڵە لە جاش دەچێت!" عیرفانیش بە شڵەژاوییەکەوە لە ئافاتی ڕوانی، عیرفان لێی پرسی "لەکوێ دەزانیت کە جاشن؟" ئەویش وتی "لە خانۆکەیان بڕوانە یان ئاغایە یان موختارە یان دەستی لەگەڵ دەوڵەتدا تێکەڵە، بەگوێرەی ئەم سیانەش بێت دەبێت سیخوڕ بێت".

عیرفان وتی "باشە، سیخوڕە با سیخوڕ بێت، ئێمەش دەچین قسەیان لەگەڵ دەکەین و دەگەڕێینەوە، تۆ لە دەرگاکەیان بدە ئێمەش لێرە چاوەڕێت دەکەین"، ئافات میلی چەکەکەی ڕاکێشا و بەرەو دەرگای ماڵەکە ملی نا، بەبێ ئەوەی دەنگەدەنگ دەربکات بە هێمنییەک چەند جارێک دای لە دەرگاکە، دوای

ماوەیەک گڵۆپی باخچەکە داگیرسێنرا، دوایش دەرگاکە کرایەوە، ژنێکی تەمەن ٤٠ ساڵ دەرگاکەی کردەوە، کە ئافاتی بینی ترسا و چەند هەنگاوێک چووە دواوە، ئافاتیش پێیووت "مەترسە ئێمە بێگانە نین"، ژنەکە چەند شتێکی بە زاراوەی زازاکی هێنایە زمان، بەڵام ئافات لێی حاڵی نەبوو، پاشان ئافات وتی "میوان قەبوڵ دەکەن؟ "ژنەکەش شڵەژابوو، تەماشای ئەوملاوئەولای خۆی دەکرد و لەوەدەچوو چاوەڕێی هاتنی یەکێکی تریان بکات، کەزانی کەس نەهات پاشان وتی "ئێستا کەسمان لەماڵەوە نییە، ئێمەش چەند ژنێک بەتەنیا لەماڵەوە ماوینەتەوە داوای لێبوردن دەکەین"، ئافاتیش بەمە شەرمەزار ببوو، بەڵام بەناچاری وتی "بەڕاستە، داوای لێبوردن دەکەین، نارەحەتم کردن"، دوایش ئەوێی جێهێشت، ئافات گەیشتەوە لای هەڤاڵانی و مەسەلەکەی بۆباسکردن، کاتێک ویستیان ئەوێ جێبهێڵن جارێکی تر دەرگاکە کرایەوە. گوێیان لە دەنگی پیرەژنێک بوو، بە زازاکی قسەی دەکرد. عیرفانیش بە زازاکی لەگەڵ ژنەکەدا کەوتە قسە و دوایش هەرسێکیان چوونە ژوورەوە، ناو خانۆکە وەکو دەرەوەی خۆش و جوان بوو، بەڵام خۆشترین شت لەلای هەرسێکیان گەرمی زۆپاکەبوو، بە شەرم و مەراقەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشتن.

ژنە پیرەکە ڕێک لە بەردمییان ڕاوەستا، ژنەکە زۆر بە تەمەن بوو، بەڵام لە تیشکی چاوەکانیدا دڵنیایی بەدیدەکرا، مەحاڵ بوو بزانرێت ئایا ئەم ژنە پێدەکەنێت یان سیمای خۆی هەروایە، سەرەڕای ئەوەی نێوچەوانی خەت خەتی بوو، بەڵام لێی جوان بوو، ماوەیەک لە گەریلاکانی ڕوانی و سەرنجی دەخستە سەر جلوبەرگ و چەکەکانیان، لەناکاو ژنەکە وتی "بوکەکەمان نەیهێشت بێنە ژوورەوە، لە قسوری عافو بن ئەو لەم شتانە نەشارەزایە"، ماوەیەک لەبەرخۆیەوە ورتە ورتی بوو، ژنەکە بە کەواکەی فرمێسکی چاوەکانی سڕی، عیرفانیان بەمە سەرسام بوو، عیرفان لە بوکەکەیانی پرسی "بۆچی دەگری؟ "بوکەکەیان وەڵامی عیرفانی نەدایەوە، عیرفان ئەمجارەیان ڕاستەوخۆ لە ژنە پیرەکەی پرسی "بۆچی دەگریت دایێ خۆت سەغڵەت مەکە"، ژنە پیرەکە لێیان نزیک بۆوە و لەبەردەمیان دانیشت، ژنەکە لەلایەکەوە بە پەنجەی دەستێکی کەوتە ڕنینی فەرشەکەی ژێری و بە پەنجەکانی مووەکانی

سەر فەرشەکەی کۆدەکردەوە و پاشان کەوتە قسەکردن و پێیانیوت "کاتی خۆی باوکیشمیان وەرنەگرت، لەدەستی زاڵمەکان هەڵاتبوو پەنای بۆ گوندێک برد، بەڵام قەبوڵیان نەکرد"، ژنەکە بەدەم ئەم قسانەوە دەگریا و بەردەوامیش چاوەکانی دەسڕی، عیرفان لێی پرسی "کێ قەبوڵی نەکرد؟" ژنەکە وتی "شەو بوو باران دەباری"، دوایش بێدەنگ بوو، تەماشای هەرسێکیانی کرد، ڕووی کردە بوکەکەیان و پێیووت "خواردن ئامادەکەن"، دوایش کەوتەوە قسەکردن و وتی "شەو بوو، باران دەباری، کەشوهەوا زۆر سارد بوو، تازە دایکم وەفاتی کردبوو، کاتێک جەندرمەکان هێرشیان هێنایە سەر گوندەکەمان باوکم منی لەباوەشکرد و لە گوندەکە دەرچووین، چوینە گوندێکەوە، زۆرلێیان پاڕاینەوە تەنانەت پێمان وتن لە ئاخوڕەکەتان ئەمێنینەوە، بەڵام قەبوڵیان نەکرد، پێیان وتین ئەگەر نەڕۆن ئیخبارتان دەکەین، بەو سەرماو سۆڵە جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ گوندەکەمان، ڕێگەی شاخەکان گیرابوون، باوکم نەخۆش بوو، کەدەکۆکی خوێنی هەڵدەهێنایەوە، کە چوینەوە ناو گوندەکەمان کەسمان نەدۆزیەوە، کەسیان لە گوندەکە نەهێشتبوو گوندەکەشیان بەتەواوەتی وێران کردبوو، دووکەڵ لە ماڵەکانەوە بەرز دەبۆوە، ئەو ساڵە بوو کە ئەو کەسەی ناوی ڕێبەر بوو عەلی شەر و زەریفەی کوشتبوو، باوکم منی برد، منی کردە چاڵێکەوە کەجاران بۆ شاردنەوەی پەتاتە درووستمان کردبوو، سەرەکەی دادەخرا، باوکم پێیووتم هەتا دەگەڕێمەوە لێرە دەرمەچۆ، باوکم ڕۆی، بەڵام جارێکی تر نەگەڕایەوە، تەنانەت ناشزانم کە گۆڕەکەی لەکوێیە، لەوانەیە گۆڕیشی نەبێت"، ئەم بەسەرهاتە بۆ گەریلاکان لەو کۆمەڵە چیرۆکانە دەچوو کە پێشوتر لەبارەی خەڵکی ئێرەوە بیستوبویان.

لێرە لەهەرێمی دەرسیم کارەساتی زۆر لەم شێوەیە لەوسەردەمە هاتبوونە ئاراوە، بەڵام ڕوبەروبونەوە لەگەڵ شاهید حاڵێکی کارەساتەکانی ساڵی ١٩٣٨ تایبەتمەندی خۆی هەبوو، ژنە بەتەمەنەکە دووبارە وتی "ئێمە هەرچییەکمان بەسەرهاتبێت بەهۆی خیانەت و نەبوونی یەک نەگرتنمان هاتوونەتە ئاراوە"، عیرفان بۆئەوەی کەشوهەوای ناو ژوورەکە بگوڕێت وتی "ئەرێ ئەم گوندە جاشی هەیە یان سیخوڕی دەوڵەت؟!" ئەمجارەیان بوکەکەیان هاتە قسە و

وتی "هێزی دەوڵەت ماوەی مانگێکە لەم ناوە ئەسوڕێنەوە، هەموو ڕۆژێک ئەچن بۆ دەوروبەری چیای بۆزان و دەگەڕێنەوە، کەدەچنە هەر گوندێکەوە پەنیر و نانێکی زۆریان لێدەستێنن! "عیرفان پرسی "کێن ئەمانە؟ "ژنەکەش وتی "سەربازەکان ""ئەی ئەمڕۆ هاتن؟ ""نەخێر ئەمڕۆ هیچ نەهاتن "، "پیاوتان لەماڵ نییە؟ "ئەمجارەیان ژنە پیرەکە وەڵامی عیرفانی دایەوە و وتی "کوڕەکەم لە ئەڵمانیا کار دەکات، دوای چەند مانگێک دێتەوە، کوڕێکی تریشم هەیە لەو بچوکترە، ئەویش لە مەکتەب دەخوێنێت لە شارە بۆیە ئێمەش لێرە بەتەنیاین "، عیرفانیش وتی "زۆر باشە بالەوە زیاتر نارەحەتتان نەکەین، ئەگەر بکرێت پێویستیمان بە کەمێک ئازوقەیە "، بوکەکە تەماشای خەسووی کرد چونکە دەبوایە ئەو ڕەزامەندی نیشان بدایە. ژنەکە لە قسەکانی عیرفان حاڵی نەبوو، ڕوویکردە بوکەکەی و پێیووت "چی دەوێت؟ ""ئازوقەی دەوێت "، ژنە پیرەکەش پێکەنی و وتی "هەمانە کوڕی خۆم هەمانە، بووکی خۆم حازرت نەکردووە؟ "ژنە پیرەکە هەستاو ڕۆی و بوکەکەشی کەوتە دوای، کاتێک گەڕانەوە سینییەکیان بەدەستەوە بوو، سفرەیان لە زەوی دانا، لەسەر سینێکە سەوزە و ماست و خواردنی قاواڵتی لەسەر دانرابوو، هەرسێکیان شەرمیان دەکرد هێشتا لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوون، ژنەکە پێیووتن "فەرموون دانیشن "، عیرفان وتی "ئێمە خواردنمان بۆخۆمان ناوێت، خواردنمان دەوێت کەلەگەڵ خۆماندا بیبەین "، ژنەکەش وتی "خەمتان نەبێت، ئەوەشتان بۆ ئامادە دەکەم، بەڵام ئێوە سکی خۆتان تێرکەن "، ماوەیەکی زۆر بوو کە هەرسێکیان خواردنی وایان نەخواردبوو، سەرەڕای ئەمەش شەرمیان دەکرد، لەبەرئەوەی هەردوو ژنەکە لەوانیان دەڕوانی پارووی بچوکیان دەکرد و لەخواردن پەلەیان نەدەکرد، سەرەڕای ئەوەی ژنەکە زۆری پێدەوتن کە شەرم نەکەن و بە ئارەزووی خۆیان بخۆن، بەڵام هەرسێکیان بەنیوە سکی تێرەوە لەسەر سفرەکە هەڵسان.

ژنەکە لێیانی پرسی "خواردنی چەند کەس ئامادەکەم؟ "عیرفان وتی "بەلای کەمەوە ۱۰۰ کەسێک "، ژنەکە و بوکەکەی تەماشای یەکترییان کرد، دوای ئەوەی لە نێوان خۆیاندا چرپە چرپیان کرد پاشان ژنەکە وتی "کەواتە دەبێت کەمێک چاوەڕێ بکەن، پەنیرمان هەیە، بەڵام دەبێت هەتا بەیانی چاوەڕێی

پێگەیشتنی نانەکان بکەن ". عیرفانیش وتی "ئێمە ناتوانین لە گوندەکە چاوەڕێ بکەین ". ژنە پیرەکە بە شێوەیەک فرکەی کرد کەکەس چاوەڕێی لێی نەدەکرد و وتی "بوکێ لەگەڵم وەرە ". هەردووکیان چوون بۆ باخچەکە. هەرسێکیان کەوتنە تاقیبکردنیان، هەردوو ژنەکە گەیشتنە ئەو شوێنەی کە وەک کوونە مریشک وابوو. لەنزیک ئەم شوێنی مریشکانە کۆتکەلە داری لێ بوو بۆ زستان بەسەریەکدا هەڵیانچنی بوو. ژنەکە هەندێ کۆتکەلە داری فڕێدا. لە شوێنی کۆتکەلە دارەکاندا قەپاغێک دەرکەوت. پێیانیوت "تەماشای ئێرە بکەن "، هەرسێکیان سەرسام بوون. ژنەکە حەشارگەیەکی جوانی درووست کردبوو، پێیانیوت "من ئێرەم بۆ کوڕەکەم درووست کردووە. باوکیشم هەر لە شوێنێکی وادا ژیانی منی ڕزگارکرد، منیش دەتوانم ڕۆڵەکانم بخەمە ئێرە و ڕزگاریان بکەم. ئێوەش وەک کوڕی منن. ئەمە قسەمەتە ". جارێکی تر گەڕانەوە ژوورەوە. سەرەڕای ئەوەی جودی قەبوڵی نەبوو. بەڵام بڕیاریاندا کە شەو لێرە بەرنەسەر. دەمەوبەیانی خۆیان کردە ناو حەشارگەکەوە. ژنەکانیش هەتا بەیانی سەرقاڵی نان درووست کردن بوون. سبەی ئێوارە هەرسێکیان دەکەوتنەوە ڕێ. هەرسێکیان لە شوێنەکانی خۆیان لەناو کوونەکەدا خەویان لێکەوت.

## ١٢

ئیبراهیم لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە و لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا هەروەکو هەموو جارێکی چاوی بە چواردەوری خۆی گێڕا، ئەمڕۆ زیاتر لە ڕۆژانی تر بینی کەلە بەهار نزیک بونەتەوە و ڕۆژانی تاریک و دیلبونیان دەبێت بە پاشماوە و سرووشت سەرلەنوێ دەژێتەوە و دارەکان و باڵندەکان و گوڵەکان و ئاوەکانی دەگەڕێنەوە سەر ڕەنگی جارانی خۆیان.

بۆنی بەهار لە چیاکانی دەرسیم دەهات، بەدڵخۆشییەکەوە گەڕایەوە ناو ئەشکەوتەکە و بانگی هەڤاڵ هێلینی بۆلای خۆی کرد و پێیووت "پێویستە هەڤاڵان بدۆزینەوە، باشترین شت ئەوەیە کە بچین بۆ دەوروبەری دەربەندی عەلی"، هێلین زۆر خوازیاری بە گەیشتنەوەی دیداری هەڤاڵەکانی بوو، بەڵام لەهەمانکاتدا دەیزانی کە بەم هەڤاڵە بریندارانەوە ڕێکردن مەحاڵە، کاتێک باسی نیگەرانێکانی خۆی بۆ ئیبراهیم کرد ئیبراهیمیش وتی "سێ هەڤاڵ لەگەڵ خۆم دەبەم و دەچم، هەر کە هەڤاڵانم دۆزییەوە ئێوەش دەهێنین"، هێلینیش وتی "حەز دەکەیت با من بچم؟" ئیبراهیم بڕیاری خۆی دابوو، بانگی ڕۆدیشی کرد و بڕیارەکەی خۆی پێووت، پاشان پێیانیوت "ئێوە هەردووکتان لە گرووپەکە بەرپرسیارن، وریای خۆتان بن، بەباشی چاوتان لە هەڤاڵ ڕۆژین بێت"، ئیبراهیم بەخۆی و سێ هەڤاڵێوەی کەوتنە ڕێ، گرووپەکەش لە ئەشکەوتەکە مانەوە، هەستیان بە شتێکی ناخۆش دەکرد چونکە بڕواپێکراوترین فەرماندەیان بەجێیانی هێشتبوو، هەموویان بەمە غەمگین بوون.

برینی بریندارەکان ئازارێکی زۆریانی پێدەبەخشین، ڕۆژین بەردەوام ئەنوزایەوە، دەبوایە برینی قاچیان پاکبکردایەتەوە، حەیدەریش وەکو ئەوەی هەموو شتێک بزانێت پێیانی دەووت کە ئەم کارە باش نییە، هەرچەندە حەیدەر دەیووت دوای چەند ڕۆژێک برینەکان باش دەبنەوە، بەڵام ڕۆژین باوەڕی بەم قسەیە نەدەهێنا، ڕۆژین دەیووت کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ برینەکەی بە ناخدا دەچێت، کاتێک هیچ کەسێکیان برینەکەی ڕۆژینیان پاکنەکردەوە ڕۆژین بە نێنی لە هەڤاڵ مەلسا پارابۆوە، پێیووتبوو "ئەم برینپێچە بکەرەوە ئیتر تەحەمول ناکەم"، ئەوەندە پاڕابۆوە مەلسا تەحەمولی نەکردبوو کە

داخوازێکەی جێبەجێ نەکات، مەلساش نەیدەویست سەربەخۆیانە ئەم کارە بکات، مەلسا پێیوابوو کە ئەم کارە زەرەر بەخشە، هەرچەندە کەسێکی شەرمن بوو لەهەمانکاتدا نەشیدەتوانی قسەی کەس بشکێنێت، بەڵام دەیزانی بەم کارە پرانسیپ و بڕیارەکانی هەڤاڵانی پێشێل دەکات، هەربۆیە ڕازی نەبوبو، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نەیتوانی بوو لەهەمبەر پاڕانەوەکانی ڕۆژین دانبەخۆیدا بگرێت، کاتێک برینپێچەکەی قاچی ڕۆژینی کردەوە ئەوەی بینی مایەی سەرسوڕمان بوو، برینەکە ڕزیو بوو ڕەش هەڵگەڕا بوو هەروەها بۆنی دەهات، بەبێ ئەوەی مەڵحەمی لێبدات بەتوندی برینەکەیان پێچی بوو، مەلسا بە پەژارەیەکەوە بانگی هێلینی کرد، هەرکە هێلینیش برینەکەی بینی هاواری کرد و وتی حەیدەر، حەیدەر لەشوێنەکەی خۆی قیتبۆوە و وتی چییە؟ هێلین پێیووت "تۆ چۆن ئەم برینەت پێچاوەتەوە؟ "حەیدەریش وتی "چۆن ئەکرێت منیش بەو شێوەیە کردومە کە دەیبینت"، هێلینیش پێیووت "ئەوەی تۆ کردۆتە دوژمنیش نایکات، تۆ کەسێکی زۆر بێویژدانیت"، حەیدەر لەهەمبەر ئەم قسە چاوەڕوانەککراوەدا تاسا بوو، خۆی گەیاندە لایان، حەیدەر بە هێلینی وت "چۆن بەو شێوەیە قسە دەکەیت ئاگات لە قسەکانت بێت"، هێلین شێتوهار ببوو، ئەوەندە ڕق لە حەیدەر هەڵسابوو خەریک بوو پەلاماری بدات، بەڵام ڕۆدی چووەبەینیانەوە و هێلینی هێور کردەوە.

لەراستیدا کەسیان چاوەڕێی شتێکی ئەوتۆ نەبوون لە حەیدەر، چەندیجار حوکمی کوشتنی دەرکرابوو، بەڵام هەموو جارێک بەر لێبوردن کەوتبوو، لەکەمپەکەیاندا هیچ کەسێک نەمابوو کە شەڕی لەگەڵ نەکردبێت، هەربۆیە وشەی خۆشەویستی و فیداکاری و هاوخەباتی بۆ ئەو هیچ واتایەکی نەبوو، ئەگەر کەسوکارەکەی وەڵات پارێز نەبونایە لەوانەبوو لەمێژەوە بوایە هەڵاتبوو خۆی گەیاندەبووە ماڵەوە، بەڵام دەیزانی کە کەسوکاری ئەمەی لێقەبوڵ ناکەن، حەیدەر لە شوێنەکەی خۆی هەڵسا و چووەلای ڕۆژینەوە، تەماشایەکی برینەکەی کرد، دوایش هەروەکو ئەوەی هیچ نەبوبێت پشتی تێکردنەوە و وتی "من چیبکەم گوناحی من چییە دوژمن لێی داویت"، هێلینیش وتی "راستە دوژمن وایلێکردووە، بەڵام تۆ لەوان خراپترت بەسەرهێناوە"،

حەیدەریش وتی "دوعای خێر بکەن کە بەستمان ئەگەر نامانبەستایە خراپتری بەسەر دەهات "، دوای ئەوەی چەند هەنگاوێک دوورکەوتەوە جارێکی تر وتی "ئەم کچانەش زۆر سەیرن باشەشیان لەگەڵ دەکەیت کەچی سواری سەریشت دەبن "، دوایش وتی "هەمووتان. ..... "، پاشان چوو دانیشتەوە.

هێلین گوێی لە قسەکانی حەیدەر بوو، بەڵام هیچی پێ نەووت، بەچاوێکی پڕ لە قینەوە تەماشای کرد، دیاربوو حەیدەر لەم تەماشاکردنەی هێلین ناڕەحەت ببوو هەربۆیە لە ئەشکەوتەکە چووە دەرەوە، هێلین مەڵحەمی هەڵگرت و بە دیتۆڵ برینەکەی پاککردەوە، ئەو پارچانەی بڕی کە ڕزیو بوون و بۆنیان گرتبوو، ڕۆژین هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد و ئارەقەی دەڕێژا، چاوەکانی چوبون بە قوڵدا و نەیدەتوانی بەباشی هەناسە بدات، سەرەڕای ئەوەی ڕۆژین دەنوزایەوە، بەڵام هێلین لە پاککردنەوەی برینەکە وازی نەدەهێنا، دوای ئەوەی برینەکەی بەباشی پاککردەوە پاشان پێچایەوە.

هێلین دوای پاککردنەوەی برینەکەی ڕۆژین کۆنترۆڵی برینەکانی هەڤاڵەکانی تریشی کرد، برینی زۆربەیان سووک بوو جگە لە ڕۆژین برینەکەی گوڵزاریش سەخت بوو، ڕۆدی بێدەنگانە تەماشای هێلینی دەکرد، دوای ئەوەی لە پاککردنەوەی برینەکان تەواو بوو هێلین خۆی گەیاندە لای ڕۆدی، هێشتا لە حەیدەر داخ لە دڵ بوو، هێلین بە ڕۆدی وت "ئیتر دەبێت ڕێگری لە کارەکانی ئەم جۆرە کەسانە بگیردرێت "، ڕۆدیش پێیووت "ئارام بە پێویست بەو توڕە بوونە ناکات "، ئارامی ڕۆدی کە وەک ئەوەی هیچی نەبوو بێت هێلینی ناڕەحەت کردبوو، هێلین وتی "ئەوەی ئەم کردویەتی دوژمنایەتییە، چۆن ئارام بم، دڵنیام بە زانا بوون ئەم کارەی کردووە، من جەرگی دەناسم جەرگ "، ڕۆدیش وتی "چۆن بە زانابوون کاری وادەکرێت، لەبێ ئەزموونییەتی "، "تۆ حەیدەر ناناسیت، ئەو ڕقی لە هەموو کچێکە، چاوی پێیان هەڵنایەت، هەربۆیە تاکو ئێستا دووجار بڕیاری کوشتنی دەرکراوە "، دوای ئەوەی ماوەیەک قسەیان کرد ڕۆدی چوو بۆلای حەیدەر کەلە بەردەم ئەشکەوتەکە دانیشتبوو.

ڕۆدی بەدەم پێکەنینەوە بە حەیدەری وت "سڵاو "، ئەگەرچی حەیدەر وەڵامی نەدایەوە، بەڵام ڕۆدی کەوتە قسە و وتی "خۆت خەفەتبار مەکە، هەندێکجار

ئەم جۆرە گەنگەشانە دێنە ئاراوە، زیانی گەورە لەوانەیە هەست و هەڵوێست بە ئاقارێکی هەڵەدا بەرێت ". حەیدەریش بە سیمایەکی گاڵتەجارییەوە وتی "تۆ خۆت وەک فەرماندە، لە ئاستی من خۆت فش دەکەیتەوە، کەسانێکی زۆری فەرماندەی یەک ڕۆژەی وەکو تۆم بینیوە، بەخۆڕایی لە ئاستمدا خۆت فش مەکەرەوە "، ڕۆدی لەهەمبەر ئەم گاڵتەجارییەی حەیدەر خۆی لە گێلیدا و لەراستیدا دەیویست کۆتایی بەو گەنگەشەی نێوانیان بهێنێت، ڕۆدی پێیوابوو کە زیاتر قسەبکەن لەوانەیە گەنگەشەی نێوانیان خراپتری لێبێت هەربۆیە وەڵامی نەدایەوە و لەلای هەڵسا و چووە ناو ئەشکەوتەکە و دانیشت، دوای ماوەیەک حەیدەریش هاتە ناو ئەشکەوتەکەوە، لەناو ئەو جانتایەی نانی تیابوو نانێکی دەرکرد و چووە دەرەوە، کاتێک هێلین حەیدەری بینی نانەکەی دەرکرد هاواری لێکرد و پێیووت "تۆ دەزانیت ئەو نانە بۆ نەخۆشەکان تەرخانکراوە، وادیارە مەبەستت ئەوەیە ئاژاوە بخوڵقێنیت! "حەیدەر لە ئاستی قسەکانی هێلین خۆی لە کەڕی دا، کەلە ئەشکەوتەکە چووە دەرەوە وتی "ئەوەی لەدەستت دێت دەتوانیت بیکەیت فەرماندە کچە ڕێزدارەکە ". لە توڕەبوندا دەستەکانی هێلین دەلەرزین، ئەوەندە توڕە ببوو تەنانەت سەیری لەخۆیشی دەهات هەربۆیە لە دڵی خۆیدا دەیووت بۆوات لێهاتووە؟ مەلسا لە دوورەوە تەماشای ڕووداوەکانی دەکرد، لەمەسەلەکە حاڵی نەدەبوو، مەلسا لەبارەی ژیانی گەریلایەتییەوە زۆر بە جدی بوو، بەشێوەیەک ببوو بە گەریلا کەباشی دەزانی دەچێتە ناو ژیانێکی زۆر پیرۆز و جیاوازەوە، بەڵام کە ئەم ڕووداوانەی دەبینی وایهەست دەکرد کە لەبارەی ژیانی گەریلاوە بەهەڵەدا چووە، مەلسا پێیوابوو کە گەریلا بێ کەموکوڕە و خاوەن ئیدیعایە و ئەو کەسانەن کەلەناو کۆمەڵگەیەکی داڕوخاودا بە جوانترین شێوە خۆیان پەروەردە کردووە، لە خەیاڵی مەلسادا شێوەی حەیدەرەکان جێیان نەدەبۆوە، بەڵام ئێستا لەهەمبەر ئەم ڕووداوانەدا خۆی بە تەنیا دەبینی و هەستی بە بێچارەیی دەکرد.

هێلین کەبینی مەلسا خۆی گۆشەگیر کردووە و غەمگین دیارە خۆی گەیاندە لای و دانیشت و پێیووت "بۆوات لێهاتووە؟ ""هیچ نییە ". هێلین مەلسای بردە دەرەوە، ڕۆژێکی خۆش بوو، ئاسمان ساماڵ بوو، بەلای حەیدەردا تێپەڕین

و كەمێک چوونە خوارەوە، لە شوێنێک دانیشتن و ماوەیەک بەبێ دەنگ تەماشای ئاوی زێیەکەیان کرد، هێلین تەمومژی بێ دەنگیانی ڕەواندەوە، هێلین پرسیارێکی دۆستانەی لە مەلسا کرد "بۆچی غەمباریت؟" مەلسا سەرەتا نەیدەزانی کەچی پێبلێت، بەڵام کە باوەڕی بە دڵسۆزێکەی هێلین کرد بڕیاریدا کە دڵی خۆی بۆبڕێژێت، پێیووت "من نەمدەزانی کە بەم شێوەیەیە، ئەگەر گەریلا لەهەمبەر یەکتر بێڕێزی بکەن ئەی چۆن ئەتوانن لەهەمبەر دوژمن شەڕ بکەن؟!" هێلین لە یەکەم قسەی مەلسا حاڵی بوو کە دەردی چییە، لەبەرئەوەی خۆیشی کە تازە ببوو بە گەریلا سەرەتا لەهەمبەر هەندێک ڕووداودا بەهەمان شێوە بیری کردبۆوە، هێلین دەیزانی کە دەبێت کۆمەڵەشتێکی بە دوور و درێژی بۆباس بکات، هێلین ئاخێکی هەڵکێشا و پێیووت:

"وادیارە ئەم ڕووداوانە کاریگەریان کردۆتە سەرت، مرۆڤ بونەوەرێکی زۆر ئاڵۆزە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسە کوردیش بێت زیاتر زەحمەتترە، لە ڕابوردودا کردنی کوردێک بە شۆڕشگێڕ لە دۆزینەوەی پارچەی ئەتۆم زەحمەتتر بوو، ئەگەر کەسایەتی کورد بە کەسایەتییەکی سەخت و ئاڵۆز و بوغزاویش پێناسە بکرێت لەڕاستیدا لە هەمووشیاندا نیەت باشی دەبینرێت، لەئاکامدا مردن لە چاو دەگرن و دێنەسەر شاخ، لەگەڵ خۆیاندا پۆخڵەواتی ناو کۆمەڵگەش دەهێنن بۆسەر چیا، کەواتە کەلە سەر پردی نێوان کەسایەتی کۆنیان و نوێیاندا دەمێننەوە و کێشە دێتە ئاراوە، ئەمە تائاستێک سرووشتییە، هەموو ئەمانە دەرەنجامێکی ڕاستەقینەی ژیانن کە هەڵاتن لێی مەحاڵە".

"ناکرێت بێ ڕێزی و جوێندان بێتە ئاراوە".

"ڕاستە نابێت، بەڵام ناشتوانین نکۆڵی لەڕاستەقینێتی ئەو جۆرە کەسایەتیانە بکەین!"

"تەماشای دەموچاوی حەیدەر بکە قین و نەفرەتی لێدەبارێت خۆی لەناو بێ هودەیی ڕزگار ناکات".

"ڕاستە بێحەوسەڵەیە، بەڵام لەهەمانکاتیشدا پێناسەی خۆی هەیە، بەهۆی ئەم شەڕەوە لەگەڵ دوژمن بەردەوام لەناو خوێن و ئازار و فرمێسک و برسێتی ژیان ئەبەینە سەر، ئێمە لەخۆمان ناپرسین کە بۆ ئەم شتانە دێنە

ئاراوه چونكه ئەمە یاسای شەڕە، هەربۆیە هەموو ئەمانە دەبنە هۆكاری هاتنەئاراوەی شەڕی دەروونی، لەم حاڵەدا هەموو شتێک لە تاکی مرۆڤدا کۆتایی دێت، هەندێکەس بەسەر بێ حەوسەڵەیی و ناڕەحەتێکاندا زاڵ دەبێت هەندێکیش هەستکردن بە خۆهەڵخەڵەتاندنی لێ درووست دەبێت هەندێکیش پەشیمانی هەڵدەبژێرێت، ئەگەر بەباشی پەنجە نەخەینە سەر ناکۆکێکان شەڕ مرۆڤ بەرەو دۆڕان و هەڵدێر دەبات، سەرەتا دەبێت پێناسەی ناکۆکێکان بکەین و لەمەشدا پێویستی بە وەستابوون هەیە".

"ئەی باشە ئێمە تاکوێ لەگەڵ ئەمانەدا خەریک دەبین، ئەگەر پێیان ناکرێت با چەکەکانیان دابنێن و بڕۆن".

"ئەگەر ئێمە بەو کەسانە بڵێین دەی بڕۆن و کەسمان بە دڵ نەبێت کەس نامێنێت".

"کەواتە چاوپۆشییان لێدەکەین؟"

"چاوپۆشی ناکەین، هاوکاریان دەکەین تاکو هەستەکانیان بەرز دەکەینەوە و دەیانکەین بە مرۆڤگەلێک کە سنوری کەسایەتی خۆیشی ببەزێنێت".

"تۆ باسی بەرز کردنەوەی هەست دەکەیت، بەڵام لەو باوەڕەدانیم کە ئێمە بتوانین لەم کارە سەرکەوتن بەدەست بهێنین".

"هەموو ئەوانەی بەشداری ناو پەکەکە دەبن بە پاکژی و بە هەستی بەرزەوە بەشدار دەبن، کێشە ئەوەنییە کە دەبێتە خاوەن ئەم هەستانەیان بەڵکو کێشەکە ئەوەیە کە بەردەوامی پێنەدرێت، ئێمە دەڵێین ئەوەی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە سەختی چۆنییەتی بەرزکردنەوەی هەستەکانی نییە بەڵکو ماوەکەیەتی، ئەمە قسەیەکی ڕاستە، ئێمە ناتوانین بەردەوامی بەمەبدەین".

"بۆچی؟"

"بێگومان زۆر هۆکار هەن، پێویستە پەیوەندی لە نێوان سەرچاوەی سەرکەوتنی هەمیشەیی و هەستە بەخێوکراوەکانی ناخدا بکرێت و پێویستە هەمیشە بەدوای ئەو پرسیارەدا وێڵبین کە ئایا ئەو شتانە چین کە هەمیشە ئێمە بەرەو ناقارەکان دەبات، من بەردەوام هەرکاتێک ڕوبەڕووی ڕووداوی هەڵاتن و خیانەت دەبمەوە ئەم پرسیارە دەکەم، دەپرسم ئایا لەسەر خواستی

خۆی ئەم کارەی کرد، بەڕای من ئەمە هەڵبژاردەی ئەوان نییە، بەڕای من هەرگیز ئەمەیان نەویستووە و ئارەزووی ئەمەیان نەکردووە، تەخمینیشیان نەکردووە، ئەوان قوربانی ئەو قەدەرەن کە چەندین ساڵە کراوەتە بەر گەلی کورد لە ڕابوردودا، ئەمە وەک ئەوەوایە کە ژیانێکیان لەبەرکردووە کە هی ئەو نییە و ستراتیژی ژیانێکیان پێڕەوا بینیەوە کە خواستی ئەو نەبووە، هەڵبژاردن لە نێوان ستراتیژییەتی ئەو ژیانەی بە بەریدا دووراوە و ستراتیژی ژیانی ناو پەکەکە دەبێت بکرێت، دەبێت لەم ڕوانگەوە مەسەلەکان هەڵبسەنگێنرێت، هەموو ئەمانە لەناو ژیانی نۆڕماڵیاندا درکیان پێنەکردووە، کە دەبن بە گەریلا و کە دەبینن نامۆن بەم ستراتیژییە کەسایەتییە نوێیە خۆیان پێڕاناگیرێت و هەڵدێن، خۆشیان تەخمینی ئەم جیاوازییە ناکەن، ئەوکاتەی هەڵیشدێن ڕاستەوخۆ پەشیمان دەبنەوە، دوای لەوەش پەشیمان دەبنەوە کە پەشیمان بونەتەوە، دەرەنجام خۆیان لەناو زبڵداندا دەبیننەوە، مەبەستم ئەوەیە دەرکردنی حەیدەر ئاسانە، ئەو بەو کۆتاییەی خۆی دەزانێت، دەبێت ڕێگری لەو کەسانە بکەین کە درک بەو جیاوازییانە دەکەن و دەستبەردی کەسایەتییە کۆنەکەی خۆی نابێت".

مەلسا بەتەواوەتی گوێی گرتبوو بۆ هێلین، هەردوکیان هەستیان بەوەکردبوو کە پێویستیان بەم جۆرە قسانەیە، لەناکامدا مرۆڤ بونەوەرێکی بێ نمونەیەو تایبەتە و خودی مرۆڤ خاوەن جهانێکی تایبەتە، دەبێت بە چاوی دووبارەبونەوەی کەسایەتییە داڕوخا و پێداگر لە کەسایەتی کۆن و درووستکەری میکانیزمی سیستەماتیکی هەرەس هێنەر تەماشا نەکرێن.

مەلسا نەیدەزانی بەو شێوەیە مرۆڤ هەڵسەنگێنێت، زهنییەتی بەم مەسەلانەوە جەنجاڵ ببوو، بەخۆی دەووت ئێ باشە بۆچی حەیدەر هەموو ئەمانە نازانێت؟ ئەگەر دەزانێت چۆن دەتوانێت خۆی لەژێر پەردەدا بشارێتەوە لەهەمبەر ئەو هەموو کەسانەی کە زانان و شیکار بۆ مەسەلەکان دەکەن، کاتێک هێلین هەڵسا و چووبۆ ئەشکەوتەکە مەلسا هێشتا بیری لەو شتانە دەکردەوە، لەناکاو هەستی کرد کە حەیدەر لێی نزیک بۆتۆتەوە، پێدەکەنی، ئەگەرچی مەلسا نەخوازیاریش بوو ئەویش خەندەیەکی بۆکرد، حەیدەر

پێیووت:

"سڵاو چی دەکەیت؟"

"هیچ دانیشتووم".

"خەفەت مەخۆ، سەری خۆیشت پێوە سەرقاڵ مەکە، هەموویان هەروان
".

مەلسا وەڵامی نەدایەوە، حەیدەر پرسی:

"خەڵکی کوێیت؟"

"کوردستان".

ئەم وەڵامە سەرودڵی حەیدەری گرت، حەیدەر وتی:

"هەموو ئەم کچانە تەختەی مێشکیان نوقستانە، بەڵام تۆ جیاوازتریت!"

مەلسا هەڵسایە سەرپێ و پێیووت:

"پێموابێت تۆ تەختەت نوقسانە!"

مەلسا ویستی بڕوات، بەڵام حەیدەر دەستی گرت و ڕایکێشا، بەڵام مەلسا بەم کردارەی حەیدەر بێتاقەت بوو، مەلسا وتی "دەستم بەردە"، حەیدەر بە گاڵتەجاریەکەوەوتی:

"تۆ کەسێکی کۆمەڵایەتیت خۆ قسەکردن لەگەڵت قەدەغە نییە!؟"

"چیت دەوێت؟"

"بۆنمونە ئەگەر بڵێم عاشقتم وەڵامت چی دەبێت؟!"

مەلسا خەریک بوو بەم قسەیە شێتوهار بێت، مەلسا پێیووت:

"ڕێزی خۆت بگرە".

حەیدەر دەستی مەلسای بەرنەدا، کاتێک مەلسا بێ چارەمایەوە هاواریکرد و وتی "هێلین"، دەنگی مەلسا گەیشتە ناو ئەشکەوتەکە، هێلین بەڕاکردن خۆی گەیاندە لای مەلسا و پاشان ڕۆدیش، ڕۆدی پرسی "چی بووە؟ "مەلساش بە گریانەوە هەموو شتێکی بۆباسکردن، ڕۆدی چەکەکەی حەیدەری هەڵگرت و بردی بۆناو ئەشکەوتەکە، هێلین و مەلسا بەتەنیا مانەوە، هێلین نەیدەتوانی قسەی تر لەبارەی قسەکانی پێشووتری زیاد بکات، هێلین نەیدەتوانی هیچی تر بڵێت و بە پەنجەکانی فرمێسکەکانی مەلسای سڕی، پێیووت "بڕۆ دەموچاوت

بشۆ "، مەلسای بەقسەی کرد و دەموچاوی شۆری.

ئیبراهیم لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا بەرەو دەربەندی عەلی ڕێیان دەکرد، ئیبراهیم دەیویست بە زووترین کات بگاتە لای باگەر و دوایش هەڤاڵە بریندارەکانی ڕزگار بکات کە لەناو ئەشکەوتەکە جێی هێشتبوون، ڕوبەروی شتێک بونەوە کە هەرگیز چاوەڕێی نەبوون. ڕوبەروی چەکدارەکانی ( تیککۆ ) بونەوە ( پارتی ڕزگاری کرێکار و جوتیارانی تورکیا )، ئیبراهیم هاوینی ساڵی پار دواجار بینویانیبووی، تیککۆچێکان لەبەرئەوەی بەدرێژایی زستان قسەیان لەگەڵ کەسدا نەکردبوو دەیانویست لەگەڵ ئیبراهیمدا قسەوباس بکەن، گرووپەکەی تیککۆچێکان ٤ کوڕ و ٢ کچ بوون، فەرماندەکەیان ناوی فیکرەت بوو، بەهۆی جلوبەرگە جیاوازەکەیەوە و ئیسلوبە جوانەکانێوەی لەناو گەریلاکاندا زۆر ڕێزی لێدەگیرا، ئەم زستانەیان لەناو کەنە بەردێکدا بەسەربردبوو،لەبەرئەوەی‌شوێنەکەیان‌باش‌بووتوانیبویان‌لەم‌ئۆپەراسیۆنە خۆیان بدزنەوە، هەرکاتێک فیکرەت ئیبراهیمی ببینیایە گەنگەشەی لەگەڵ دەکرد، بەڵام ئەمجارەیان ئیبراهیم کاتی گەنگەشەی نەبوو، ئیبراهیم زیاتر بەسی لە زەحمەتێکانی زستان و ئۆپەراسیۆنەکان و ئامادەیی بەهاری بۆکردن، ئەمجارەیان نەکەوتنە ناو ئەو گەنگەشەیەی کە نەدەگەیشتنە هیچ ئەنجامێک، کە ئیبراهیم بێتەلەکەی دەستی پێیان بینی زانی کە بەباشی دەتوانن گوێ لە بێتەلەکانی دوژمن بگرن، هەربۆیە بە ئامانجی زانینی نیەتی دوژمن بە فیکرەتی وت "لە بێتەلەکەتانەوە گوێتان لە دوژمن گرت؟ "فیکرەتیش وتی "بەڵێ "، "باسی چی دەکەن؟ "فیکرەت وتی "لەم دواهەمین ٢٠ ڕۆژەدا شەڕو پێکدادانێکی سەخت هاتۆتە ئاراوە، لە دەربەندی عەلی، گامر و ئاکتاش بە کورتی لە هەموو شوێنێکی دێرسیم ئۆپەراسیۆن هەیە، جارێکیان باسی ئەوەیان دەکرد کە ٣٦ کەسیان کوشتووە، ئەرێ ئەم قسانە ڕاستن؟ "ئیبراهیمیش وتی "ڕاستە ٣٦ شەهیدمان هەیە، لە گرووپەکەی ئێمە بوون، لەئاکامی بۆردۆمانی کۆبراکان ئەو هەڤاڵانەمان شەهید بوون "، ڕەنگی دەموچاوی فیکرەت گۆڕا، نەیدەزانی کە چی بە ئیبراهیم بڵێت، دوایش وتی "لەناو ئەو شەهیدانە تیایاندا هەبوو کە من بیناسم؟ "ئیبراهیم وتی "ئەو هەڤاڵانە بوون کە پار لە کەمپەکە بینیبوتن

"، "ئەی هەڤاڵ دیار؟ "ئیبراهیم قورگی پڕبوو، ماوەیەک بێ دەنگ مایەوە، چاوەکانی پڕبوون لە ناو، ئەوانیش چاوەڕێی قسەکردنی ئیبراهیم بوون، ئیبراهیم وتی "بەڵێ، دیاریش شەهیدبوو لەگەڵ عەگید و گۆرسۆ و مەزلوم و ئەوانی تر "، هیچی تری پێنەوترا، فیکرەت بەم هەواڵە نارەحەت ببوو بە ئیبراهیمی وت "شتێک هەیە کە ئێمە پێمان بکرێت؟ ""نا سوپاس، بەڵام پێویستیم بە بێتەلە "، فیکرەت بەبێ هیچ تەرەدودێک لە گیرفانی بێتەلەکەی دەرهێنا و دای بە ئیبراهیم، ئیبراهیم ماوەیەک خۆی سەرقاڵی بێتەلەکە کرد و دوگمەی بادەدا، جگەرەیان داگیرساند، ئەو شەوە ئیبراهیم و هەڤاڵەکانی لەوێ مانەوە، سبەی نیوەڕۆ چوونە ناو دارستانەکەوە و دەستیان کردەوە بە رێکردن.

# ١٣

عیرفان و دوو هەڤاڵەکەی کە بۆ پەیداکردنی ئازوقە چوون ئەمڕۆ پێنجەمین ڕۆژیان بوو کە نەگەڕابونەوە، هەڤاڵانیش ٢٠ ڕۆژ بوو بێخواردن بوون، مردن تادەهات زیاتر باوەشی بۆدەکردنەوە، نێوان ژیان و مردن ئەوەندەی تاڵەمویەکی لێهاتبوو، داهاتوویان نادیاربوو، لە چاڵەکەدا بەردەوام گەنگەشەی ڕۆیشتن و مانەوەیان دەکرد، بەڵام هەرچییەکیان دەکرد نەیاندەتوانی چاڵەکە جێبهێڵن، نەهاتنەوەی ئەو ٣ هەڤاڵەیان تەنها هەرەسی خەیاڵەکانیان نەبوو بەڵکو ئێستا مەراقی ئەو ٣ هەڤاڵەیان ببوون و لەبارەشیانەوە نیگەران بوون، لەوانەبوو کەوتبێتنە بۆسەوە و شەهید بوبێتن یان دیل کراون، هەموو ئەم گریمانە خراپانە سەرودڵیانی گرتبوو.

باگەر پەشیمان ببۆوە لەوەی کەلەپێناو دابینکردنی ئازوقە ژیانی ئەو ٣ هەڤاڵەی خستبووە ناو مەترسییەوە، ئەگەر بە دیلی بگیرنایە ئەمە بەمانای ئەوە دەهات کە شوێنەکەیان ئاشکرا دەبێت و ژیانی ٦٠ هەڤاڵیان دەکەوێتە مەترسییەوە، هەربۆیە مانەوەیان لە چاڵەکە هیچ مانایەکی نەمابوو، ئەگەر زیاتر لێرە بمانایانەتەوە ئەوا ئەندێشە و نیگەرانێکانی زیادیان دەکرد، کەزانی لەناو بێچارەیدایە و هەتا دێت دەرگاکان لە ڕووی دادەخرێت باگەر بڕیاریدا کە پیلانسازی نوێ بکات، بانگی شاهین و پالۆ و بێستای بۆلای خۆی کرد و لەبارەی ڕێگەچارەی نوێ بیروبۆچونیانی وەرگرت، هەتا دەهات لە برسێتیدا زیاتر لاواز دەبوون و وزەشیان نەدەما و قژو ڕیشیشیان درێژتر دەبۆوە و ئەسپێکانیش زیاتر لەشیانی دەخوراند و هەتادەهات چاویان بە قوڵدا دەهات، لەم ٢٠ ڕۆژەدا پالۆ وەک ئەوەی لێهاتبوو کە ٢٠ ساڵی تەمەنی زیادی کردبێت، لەکابرایەکی ٥٠ ساڵە دەچوو، قژ و ڕیشی شاهین تێکەڵ بەیەک ببوون، دەموچاوی لەبەر تووکی درێژی قژ و ڕیشەکانی نەدەبینرا، هەندێک لە هەڤاڵانیان ژانی گورچیلە یان گرتبوو، تیاشیاندا هەبوو کە خوێنی هەڵدەهێنایەوە، باگەر کە بانگی ئەو هەڤاڵانەی کرد بۆلای خۆی پرسیاری چۆنیەتی ڕزگار بونیانی لەم چاڵە لێکردن.

شاهین دژبەری جێهێشتنی ئێرە نەبوو زاتەن چەندین ڕۆژ بوو ئەمەی

هێنابووە زمان، شاهین هۆکاری هەرە گرنگی جیابونەوەیان لەم چاڵە گرێدەدا بە نەگەڕانەوەی گرووپەکەی عیرفان، شاهین پێیانیوت "پێویستە هەموو گریمانەکان بە جدی وەربگرین، لەوانەیە دیلگیرابێتن و لەژێر ئەشکەنجەدا خۆیان ڕانەگرتبێت و دانیان بە هەموو شتێکدا هێنابێت، ئەگەر بێنەسەرمان بەبێ ئەوەی یەک تەقەشمان لێبکەن هەموومان دەگرن ". بێستاش هەمان بیروبۆچونی هەبوو پێیانیوت "دەبێت بیر لە شەهیدبونیان و خیانەتکردنیشیان بکەینەوە ". بێستا خۆیشی سەرسام مابوو کە وشەی شەهادەت و خیانەتی ئەوەندە لەیەک نزیک کردبۆوە، هەرچەندە ئەم دوو دەستەواژەیە دژی یەک بوون، بەڵام ئێستا بە جووتە لە یەککاتدا بەکار دەهێنرا. ئیتر وایان لێهاتبوو کە هاتنە ناراوەی هەردوو وشەی شەهیدبوون و خیانەت بۆ ئەوان ببوو بە شتێکی ئاسایی.

پالۆ لەهەمانکاتدا بیری لە عیرفان و برسێتیش دەکردەوە، پالۆ دەیویست هۆکاری سادەی دەرچونیان لێرە بدۆزێتەوە، لەناکاو پالۆ وتی "ڕێگەیەکمان هەیە بۆ دەرچونمان لێرە! "لەبەرئەوەی پالۆ بە ئەزمون بوو هەروەها شارەزایەکی باشی ناوچەکان بوو دەبوایە بیروبۆچونەکانی بە جدی وەربگیردرایە، شوێنێک نەمابوو وەک چیا و ڕێگەوبان و شوێنی بەردەڵان و زێ و چەم و دارستان کە سەری پێدا نەکردبێت، پالۆ یەکێک بوو لەوانەی کە شارەزایەکی باشی لەبارەی هەرێمی دەرسیمەوە هەبوو. باگەر لێی پرسی "چۆن دەتوانین؟ "ئەویش وتی "باشترین ڕێگە ناوچەی مەلاخوێدڵی یە "، ئەو شوێنەی پالۆ هێنابویە زمان ئێستا بەفری بەسەرەوە نەمابوو، ئێرە باشترین شوێن بوو لەو شوێنانەی کە خۆیان تێدا بشارنەوە، ئەگەر بیانتوانایە خۆیان بگەهێندایەتە ئەوێ ئەوان دەیانتوانی ئۆپەراسیۆنەکەی دوژمن مایەپوچ بکەنەوە، بۆگەیشتن بەوێش پێویستی بە ٧ کاتژمێر ڕێکردن بوو، باگەریش وتی "چۆن دەتوانین ڕێگەیەکی ٧ سەعاتی ببڕین؟ "پالۆش وتی "چارەی ترمان نییە، یان لێرە دەمێنینەوە یاخود هەموو هەوڵێکی خۆمان ئەخەینە گڕ تاکو دەگەینە ئەوێ ". شاهینیش وتی "بەکام ڕێگەدا؟ "پالۆش وتی "دوو ڕێگە هەیە ". پالۆ کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێنا و بە پارچە کاغەزەکان نەخشەی

ڕێگەکانی نیشاندان، هەردوو ڕێگەکە مەترسیدار بوون، دەبوایە بەسەر چیای بۆزان بپەڕێنەوە زاتەن ماوەی ٢٠ ڕۆژێک بوو مەترسییان لەچاو گرتبوو کەلە خواروی خاڵی چاودێراندا مابونەوە، پالۆ بە قەڵەم لەسەر کاغەزەکان شتی دەنوسی و بە دەستیشی ئیشاراتی دەکرد کە زیاتر حاڵیان بکات، پالۆ وتی "سەرەتا پێویستە بەدەستە چەپماندا وەربگەڕێین و خۆمان بگەهێنینە زێی کۆچگری، دەتوانین بە کاتژمێرێک بگەینە ئەوێ، بەسەر زێیەکەدا بەرەو بەرزایەکە مل دەنێین واتا بەرەو بۆزان، لێرەدا ڕوبەڕووی ڕێگریەکان دەبینەوە و خۆمانی لێدەرباز دەکەین، لە نزیک بارەگای ئاکرەک دەڕۆین و دەبێت نەهێڵین سەربازەکانی چاودێری سەرگردی بۆزان بمانبینن". شاهینیش وتی "، بەڵام لەسەر ڕێگەشمان بارەگای ئاموتکا هەیە". پالۆش وتی "ئێمە لە نێوان ئاموتکا و خاڵی چاودێریان تێدەپەڕین، زاتەن هەرکە گەیشتینە قەد پاڵەکە گەورەترین مەترسیمان گوندی ئاموتکا و بارەگاکە دەبێت، ئەگەر تێیان بپەڕێنین ئەوا دەگەینە مەلاخوادێ". بێستاش وتی "کەواتا بەلای ڕوویەکەی تری بۆزاندا دەڕۆین؟" پالۆش وتی "لەسەرووی بۆزانەوە، دەتوانین زنجیرەکانی چیالۆکەکان ببڕین، بەڵام ئەم شوێنە بە هاوینیش سەختە، بەم شێوەمانەوە ناتوانین لەوێ ڕێبکەین، بەڵام ئەگەر لەلایەکەی ترێوەی بگەینە گردی پیلاف لەوێوە ڕێبکەین ئاسانترە، بەڵام بەڕای من ناتوانین ئەو ڕێگەیەش ببڕین، ئاسانترین شت ئەوەیە کە بەسەر بۆزان بپەڕێینەوە و لەو دیوەوەی خۆمان شۆڕبکەینەوە". باگەریش وتی "زریپۆشەکان لەبیر نەکەن". کاتێک باگەر وشەی زریپۆشی بەکار هێنا هەموویان کەوتنە بیرکردنەوە، ئەگەر ئەمە ڕچاو نەکەن هیچ پیلانێکیان سەرناگرێت، شاهین وتی "ئەگەر شوێنەکانیان تەسبیت بکەین دەتوانین بەبێ ئەوەی درکمان پێبکەن خۆمان ڕزگار بکەین". باگەریش وتی "چۆن تەسبیتیان دەکەین؟" شاهینیش وتی "کاتێک چوینە خوارەوە بۆ بۆزان چەمێک دێتەپێشمان، ئەگەر بەلای گوندەکەدا تێبپەڕێین ئەوا ئاشکرا نابین، ئەگەر سەگەکانیان پێمان نەوەڕێن کێشە نایەتە ئاراوە". پالۆ جارێکی تر وتی "هەتا ئێستا زریپۆشم لە ٣ شوێن بینیوە، یەکەمیان لە چەمیشگەزەک و لە نزیک پردی تاغار کە ئاوەکەی لە نێوان هۆزات تێدەپەڕێت، ئەمە یەکەم

دوو جارێکیش لە دەرەوەی گوندەکە هەروەها لەسەر ئەو گردەشی کە ڕوویەکی چیای بۆزانی لێوەدیارە"، شاهینیش وتی "ئەو دوو شوێنەی باستکرد هەردووکیان ئەو زنیەیان لێوە دیارە کە ئێمە پێیدا دەڕۆین"، پالۆ ماوەیەک بیری کردەوە و پاشان وتی "زریپۆش هەتا کار نەکات و گەرم نەبێت ناتوانێت تەقە بکات، هەرکە گوێمان لە دەنگی کارکردنی بوو ئێمەش تەدبیر وەردەگرین"، کاتێک پالۆ ئەمانەی دەهێنایە زمان دڵیشی ئاسودە نەبوو، زریپۆشەکان هەموو پیلانەکانیانی سەروبن دەکرد، هەموو ڕێگەکان بەم هۆیەوە داخرابوون، چەند ساڵێکە بەهۆی زریپۆشە (لێوپارە) ئەڵمانێکانەوە شەهیدێکی زۆریان دابوو، ئەم زریپۆشە لێزەریان هەیە و کامیرەیان لەسەرەو و دەتوانێت تەقەی دوور هاوێژ بکات، بەکورتێکەی ئەم زریپۆشە بۆتۆتە ئالەتێک بۆ کوشتن، قورسایی گولەکەی کە ١٥ کیلۆیەکە لەکاتی تەقانیدا هەدەفی خۆی نەپێکێت و ئەو شوێنە وێران دەکات و سوپای تورک بە شەو و ڕۆژ ئەم زریپۆشانە لەسەر گردە ستراتێژێکاندا جێگیر کردبوو، هەرکە هەدەف دیاری دەکەن هەلی دەست کردنەوەی بەرامبەرەکەی نادات، ئەم زریپۆشانە بە درێژایی ٢٧ کم کە دەتوانن تەقە بکەن لەهەمانکاتیشدا تەنها دەتوانن بە دووری ٦ کم جموجۆڵە ناشازەکان تەسبیت بکەن، ئەتوانن زۆر بەباشی بە دووری ٣ کم هەدەفی خۆیان بەبێ کەموکوڕی لەناو بەرن، تەنها یەک شتیان مایەی دڵدانەوەی هێزی گەریلایە ئەویش نەڕەنەڕیانە، هەرکاتێک بەکار دەهێنرێن ئەو دەنگەی لە ماتۆڕەکانیانەوە دەردەچن بە ئاسانی دێتە گوێی گەریلاکان، ئەوکاتەی ڕوبەڕووی ئەم زریپۆشانە دەبنەوە گەریلا بۆئەوەی خۆیان لەچاو زریپۆشەکان ون بکەن تەنها ڕێگەی ڕزگاربونیان بیستنی دەنگی زریپۆشەکانە، بەکورتێکەی ئەگەر بکەونە بۆسەی ئەم زریپۆشانەوە ئەم گرووپە کە ماوەی ٢٠ ڕۆژە برسین و بێ حەوسەڵەن بەمانای لەناوچونیان دەهات.

لەئاکامدا بڕیاریاندا کە مەترسی لەچاو بگرن، بۆ ڕێکردن دەستیان کرد بە ئامادەباشی، ماوەی ٥ ڕۆژ بوو عیرفان و جودی و ئافات لە حەشارگەکەی ماڵەکەدا بوون، کاتی خۆیان لە شوێنەکەی خۆیانەوە بەسەربردبوو، ئەم میواندارێتییەی ئەم ماڵە کە زۆر بە میهرەبانە بوون لەهەمبەریان ڕەوشیانی

چاککردبۆوە، بە ڕۆژ لە حەشارگەکە دەمانەوە و بە شەویش دەچوونە ماڵەکەوە، ئێوارەیەک ژنەکە سەر حەشارگەکەی کردەوە، خواردنەکانیان حازرکرابوو، سکی خۆیان تێرکرد، کاتژمێر ٨ تەماشای مێد تف یان کرد، هەرسێکیان سەربەرز بوون کە شۆڕشەکەیان یەکەمجارە تەلەفزیۆنێکیان دامەزراندووە لە مێژووی کوردا کە نوێنەرایەتی گەلی کورد بکات.

کەتەماشایان دەکرد و بەم گۆڕانکارییەی تف یە کە سەر بەرز بوون لەلایەکی تریشەوە لەئاستی هەڤاڵەکانیاندا هەستیان بە شەرمەزاری دەکرد، خۆیان بە تۆمەتبار دەزانی، لەبەرئەوەی ئەوە ٥ ڕۆژە ئازوقەیان بۆ هەڤاڵە برسێکانیان نەبردووە، لەم بارەیەوە غەمگین بوون، ئەوانیش دەیانزانی کە برسێتییەکی ٢٠ ڕۆژە چی ئەنجامێک دەهێنێتە ئاراوە، هەستیان بە ئازاری ویژدانیان دەکرد، لە ئێستاوە بۆ پرسیاری ئەوەی بۆ درەنگتان پێچووە چەندین وەڵامیان دۆزیبۆوە، گەورەترین هۆکاری دواکەوتنیان دەبەستەوە بە گوێگرتنی هەواڵی تەلەفزیۆنەکان لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکەوە، هەرسێکیان باوەڕیان بەوەهێنابوو کەلەوانەیە گرووپەکەیان شوێنەکەیان گۆڕیبێت، ئەوان ئەو بیانویەشیان بۆخۆیان درووست کردبوو کە مادام گرووپەکە شوێنی خۆیان گۆڕی بێت ئیتر پێویستی بە هەڵگرتنەوەی ئازوقە ناکات، ئەو کەسەی کەلە مێد تف یەوە هەواڵی دەخوێندەوە باسی لە گەورەترین چالاکی دوا ساڵی گەریلای دەکرد، بێژەرەکە خوێندنەوەی هەواڵەکانی بەم شێوەیە دەستپێکرد "بەگوێرەی زانیاریکانی بارەگای فەرماندارێتی گشتی ئارگەکە" کە باس لە ئۆپەراسیۆنی ئەودیو سنور دەکات، بەڵام لەناو هەواڵەکاندا ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو ئەوەبوو کە فەرماندارێتی ئارگەکە باسی لەوەدەکرد کە گەریلاکانیان کۆپتەرێکی سەربازیان لەکاتی ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنەکاندا خستۆتە خوارەوە، هێزی سوپای دەوڵەت بە هێزێکی ١٠٠ هەزار سەربازییەوە ئۆپەراسیۆنی ئەودیو سنوریان دەستپێکردووە.

لە زاپ کە شوێنی سەرەکی بارەگای فەرماندارێتی گشتی گەریلای پەکەکە بوو شەڕ و پێکدادان بەردەوام بوو، گەریلاکان تەکتیکی نوێیان بەکارهێنابوو ناوچەکانی زاپیان چۆڵکردبوو، توانیبویان کە هێزی سەربازی دەوڵەتی

تورک بەلکێشی ناو جەرگەی زاپ بکەن، ئەو ژەنراڵەی کە ئۆپەراسیۆنەکەی دەبردبەڕێوە لە تەلەفزیۆنەکانی تورکیاوە باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن زاپیان گرتووە و چۆن گەریلایان کوشتووە و چۆن گەریلاکان هەڵاتوون و هەروەها باسی لە سەرکەوتنەکانی خۆیان دەکرد، بەڵام دوای چەند ڕۆژێک گەریلاکانی پەکەکە کۆپتەرێکیان خستبووە خوارەوە کە ژەنراڵ و ئەفسەری پلە بەرزی تێدابووە کە یەکێکیان ئەو ژەنراڵەش بوو کە چەند ڕۆژێک لەمەوبەر بۆ تەلەفزیۆنەکان باسی لە سەرکەوتنەکانی خۆیانی کردبوو و هەموویان لەو کۆپتەرە کوژرابوون، ئێستاش مێد تف لەکاتی خوێندنەوەی هەواڵەکەدا دیمەنی پارچەکانی کۆپتەرەکەیان نیشان دەدا کە گەریلاکان خستوبویانە خوارەوە، بێژەری هەواڵەکانی مێد تف لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکەوە هەواڵێکی تری زۆری خوێندەوە، باسی لە بۆسەی گەریلا و هێرشی سەربارەگا و شەڕ و پێکدادانەکانی دەکرد، بەگوێرەی هەواڵەکان شەڕ و پێکدادان لە هەموو شوێنێکی کوردستان دەستی پێکردووە.

عیرفان و ٢ هەڤاڵەکەی کە چاویان بە هەواڵەکان دەکەوت بۆیان دەرکەوتبوو کەلەبارەی زانینی گۆڕانکاریەکانەوە زۆر لە دواوە ماونەتەوە، لەهەموو لایەکەوە زەنگی سەرکەوتن لێدرابوو، بەڵام لە هەرێمی دەرسیم تراژیدیا لەئارادابوو، هەواڵەکان لەبارەی هەرێمی دەرسیمەوە هەرسێکیانی غەمگین کردبوو، بەگوێرەی هەواڵی کەناڵەکانی تورک لە هەرێمی دەرسیم بەسەدان گەریلا کوژراون هەروەها لەبارەی ئەم جۆرە هەبەتاڵنەشەوە بێژەر دەیووت کە هێشتا سەرچاوەی باوەڕپێکراو لەبارەی زانیارێکانەوە بەدەست نەهێنراون.

عیرفان تەماشایەکی جودی کرد، دەیویست پێی بڵێت لەم هەبەتاڵنە چی حاڵی بوویت، جودی لە مەبەستی تێڕوانینەکەی عیرفان حاڵی ببوو هەربۆیە عیرفان پێیووت "زاتەن ژمارەی سەرەکیمان هەر ئەوەندەیە"، جودی وتی "هەموو هێزی گەریلای دەرسیممان ناگاتە ٥٠٠ گەریلا! "عیرفان وتی "ئێوە لەگەمەی دەوڵەتی تورک شارەزا نین، دەوڵەت لەهەمبەر شەهید بوونی هەر گەریلایەک یەک یان دوو سفری بۆزیاد دەکات، ئەگەر ١٠ یان ١٥ هەڤاڵمان

شەهید بوبێتن ئەمەمانای ١٥٠ یان ٢٠٠ گەریلایە بۆنەوان ".

ژنە پیرەکە لە هەرسێکیانی دەڕوانی کەلە نێوان خۆیان قسەیان دەکرد، لەو هەبەتاڵنەی حاڵی نەدەبوو لەبارەیەوە لە گەریلاکانی دەپرسی، ژنەکە وتی "ئەریّ هیچ خەبەر هەیە؟ "عیرفانیش وتی "هیچ نییە، هەروەکو پیشەی هەموو جارێکیان دوژمن بۆخۆی درۆ دەکات، دەستیان لە چەند گەریلایەک وەشاندووە نێستا دەیکەن بە سەدان "، ژنەکەش وتی "ئەی باشە بۆچی حەشارگە بۆخۆتان ناکەن، لەسەردەمی سەیدڕەزادالەهەر ماڵێکدا حەشارگە هەبوو، دەوڵەت بێ بەزەییە، لەکوێ بتگرێت لەوێ دەتکوژێت "، دوای ئەوەی ماوەیەک قسەوباسیان کرد پاشان هەرسێکیان چوونە ژوورێکەوە، لە نێوان خۆیان لەبارەی ڕێگەوبانی گەڕانەوەیان قسەیان کرد. گەڕانەوە ژوورەکە، بە ژنەکەنیان وت کە ئەم شەو بەڕێ دەکەون، ژنێکیان وتی هەتا کەشوهەوا گەرم دەبێتەوە دەتوانن لێرە بمێننەوە، بەڵام هەرسێکیان لەسەر ڕۆیشتن سووربوون، بەڵام ئەو شوێنەی بۆی دەچوون ئەو چاڵە نەبوو کە باگەر و هەڤاڵەکانی لێیبوون و چاوەڕێی ئەمانیان لێدەکرد، ئامانجیان نەوەبوو کە بگەڕێنەوە بۆ کەمپەکە کۆنەکەی خۆیان.

# ١٤

ناوەڕاستی مانگی نیسان بوو، بۆنی گژوگیاو پونە و ڕەیحان و گوڵاو لە دارستانەکەوە دەهات، کە ئەمەش تامەزرۆی باگەر و هەموو گەریلاکان بوو، دوای برسێتیەکی ٢٠ ڕۆژە دەوروبەری دەربەندی عەلییان جێدەهێشت، بەگوێرەی شێوازی پیلانی پالۆ بەڕێدەکەوتن، کەشوهەوا زۆر خۆش بوو، خۆرێکی زۆر گەرم هەناویانی گەرم کردبۆوە، دەیانتوانی لەبەردەم تیشکی خۆردا خۆیان گەرم بکەنەوە، دەبوایە سەرەتا بگەیشتنایەتە زێی کۆچگری، برسێتی زۆری بۆهێنابوون، بەشێوەیەک کە چاویان ڕێشکەوپێشکەی دەکرد، تەنها شتێک کە دڵیان پێی خۆش بوو گریمانەی ڕزگاربونیان بوو لەناو بازنەی ئۆپەراسیۆنەکە، ئەو گژ و گیا و ڕووەکانەی کە تازە بە تازە لەکەناری ڕێگەکاندا سەریان دەرخستبوو

گەریلاکان دەیانڕنی و دەیانخوارد، ئەوەشیان نەدەزانی کە جگە لە دەربەندی عەلی بەفر لە کوێی تر هێشتا لە زەویایە، گەنگەشەکانی نێوانیان تەنها لەسەر بناغەی گریمانەکانیان دەچوو بەڕێوە، لەناو خۆیان باسیان لەوەدەکرد کە ئایا کوێ هێشتا بەفری پێوەیە و کوێ هێشتا تەنکی بەفری پێوەیە و کوێ بەفری تواوەتەوە و کوێ لالە و گوڵزاری گرتووە، بەڵام دەردی سەرەکی باگەر ئەوەبوو کە بەزووترین کات بگەنە زێی کۆچگری، ماوەی ١٥ خولەک ڕێگەیاندا بە گەریلاکان کە پشووبدەن، ئەژنۆکانیان لەکار کەوتبوو، ئیتر ئەژنۆکانیان نەیاندەتوانی خاوەنەکەی ڕاگرێت، بۆ هەندێ گەریلایان هەڵهێنانی یەک هەنگاو وەک بڕینی سەدان کم ی لێهاتبوو، چیای بۆزان یان گرد و قەدپاڵە نزمەکان ئێستا لەبەرچاویان ببوو بە گەورەترین کێوی دونیا.

وەحشەتیان واتا ئازاد لە ڕێگە چەند جارێک ڕشایەوە، بەهۆی هەڵهێناوەی زەرداو نارەقەی دەردابوو، هەندێ گەریلایان بەشێوەیەک دەکۆکین کە خەریک بوو جگەریان لە دەمیان بێتە دەرەوە، بورانەوەی بەرچەم هەموویانی بێتاقەت کردبوو، بەرچەم نەیدەتوانی قسەبکات و نەشیدەتوانی ڕێ بکات، پاڵۆ هەرتوانی بووی کە چەند مەترێک لەکۆڵی بکات، نەشدەتوانرا بەدوای خۆیاندا ڕایبکێشن، بەرد و دار و قوڕ و چڵپاو و بەفر لەبەردەم ڕاکێشانیدا ڕێگربوون، لەوەتەی بەرچەم ببوو بە گەریلا یەکەمجاری بوو کە نەدەتوانرا هەڵیبگرن، هەموویان دەیانزانی کە خۆی هەست بەم ڕەوشەی خۆی بکات لەخۆی قەبوڵی نەدەکرد و غروری پێی دەڕوشا، ناچارمان کەلەبەر خاتری بەرچەم کەمێک چاوەڕوانی بکەن، لەئاکامدا دەموچاویان شۆری و هاتەوەسەرخۆی.

بەدرێژایی ڕێگە ناچارمان چەندیجار بە چواردەوری ئاوی تاغار بخولێنەوە، ڕێگەکەی چەتوون بوو هەربۆیە دەبوایە ڕێگەوبانێکی زۆر ببڕن و بە چواردەورەکاندا بخولێنەوە، کاتێکی زۆریان بەسەربرد تاکو شوێنێکی گونجاویان بۆ پەڕینەوە لە ئاوەکە دۆزیەوە، لەئاکامدا خۆیان گەیاندە زێی کۆچگری، لە شوێنێکی گونجاو ئاگریان کردەوە و گەڕان بە شوێن خواردندا، لەکەناری ئاوی زێی کۆچگری شتێک پەیدا نەکرا بۆ خواردن گونجاو بێت، بە بڕیاری باگەر ناچارمان کە بزنە کێوی بکوژن، لەم حاڵەتانەدا کەس گوێی

بۆ چیرۆکەکانی بزنە کێوێکان نەدەگرت، زاتەن ئەو ناڕەحەتییە و زەحمەتی و نەگبەتییەی تووشی هاتبوون لە گەورەترین بەدوعا گەورەتر بوو، دۆزینەوە و کوشتنی بزنە کێوی زۆر زەحمەت نەبوو، لەئاکامدا بزنە کێوییەکیان دەستگیر کردوو سەریان بڕی، لێنانی گۆشتی ئەم بزنە کێوییە دوای ٢٠ ڕۆژ برسێتی وەک دەرچوونی بیتاقە وابوو، سکیانی تێردەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی ٢٠ ڕۆژ بوو هیچیان نەخواردبوو ئەم گۆشت خواردنەیان کردبوو بەسەر مەعیدە برسی و پڕ لە ئازارەکانیان ئەمەش مەعیدە و ڕیخۆڵەی هەموویانی تێکدا بوو، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە هەموویان لەتاوی زوو، زوو ڕاکردنیان بۆسەر ئاو پشتوێنەکانیان کردبۆوە و نەیاندەبەستەوە.

بەکەناری زێیەکە بەرەو ژوور هەڵگژان، هەتا هەڵدەچوون سەرما و بەفر ناڕەحەتی دەکردن، چیای بۆزان چەندین مەتر بەفری لەکۆڵ خۆی گرتبوو، بەڵام هەموویان ناچاربوون کە لە هەڵگژان بەردەوام بن، لەوانەبوو ئەم دیمەنە جوانانەی ئەم چیایانە پێشوتر وەک تابلۆیەکی جوانی ڕۆمانسی بیریان لێکردبێتەوە، بەڵام ئێستا بەسەخترین شێوە ڕوبەڕوویان ببۆوە، ئێستا بۆیان دەردەکەوت کە هەموو شتێک لە خەیاڵ کردن پێکنەهاتووە بەڵکو واقیعیش هەیە، دونیا تاریک داهاتبوو، گرووپی کەشفکردنیان خۆیان گەیاندبووە سەر لووتکەکە و چاودێری چواردەوری خۆیانیانی دەکرد، بۆ گەیشتنی هەموو گرووپەکە گرووپی چاودێری ماوەی کاتژمێرێک چاوەڕوانی ئەوانیان کرد، هەرچەندە هەڵگژانیان بۆسەر لووتکە و گەیشتنیان ناڕەحەت بوو، بەڵام ئێستا چاوەڕوانیشیان هەر دەردە سەری بوو بۆ گرووپی چاودێر، تیایاندا هەبوو کە قاچەکانی ڕچیوبوو هەستیان بە قاچی خۆیان نەدەکرد، تیاشیایان هەبوو دەیویست هەرچۆنێک بێت بخەوێت، تیاشیایاندا هەبوو دەستەکانی گۆی نەدەکرد، بۆ ڕێگرتن لەمانەش هەڵبەزینیان بوو.

کە هەموویان گەیشتنە سەر لووتکەی چیای بۆزان ئیتر شتێک نەمابوو کە بیکەن، دەبوایە تەنیا ڕێیان بکردایە، لەبەرئەوەی لێرە نە پەنایەک هەبوو پەنای بۆبەرن نەداریش هەبوو هەتا لەسایەیدا خۆیان بشارنەوە، چواردەوری بۆزان تەختایەکی سپی بوو، بە عیناد و بەسەرکێشی خۆیان کەمێک ڕێیان کرد،

ماوەی کاتژمێرێک بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە ماندوبونیان و بەدەم هەناسە بڕکێیانەوە ڕێیان دەکرد. ئەوکاتەی لە گوندی ئاکرەک نزیک بونەوە دەیانزانی کە دەبێت زۆر بە دەیقەت بن، ئەگەر ئەم گوندەیان تێپەڕاندایە لێرە بەدواوە بەفریش نەدەما، هەرلەبەر ئەمەش بوو دەیانویست پەلەبکەن و لە جیاتی بەفر پێ بە وشکایدا بنێن، دوای ئەوەی کەمێک ڕێیان کرد ناچارمان کە گردەکەی بەردەم بارەگاکە ببڕن، مانگەشەو ئەو ناوەی ڕووناک کردبۆوە، دەیانتوانی کە گوندەکە ببینن، کەلە شوێنەکەی خۆیان سوڕانەوە و بەرەو دارەکان ملیان نا بەتەواوەتی بارەگاکە دیار نەما، لەشێوەی ناوبەری ناویان و بە ڕاکردن لە هەندێک شوێن و بە ڕاوەستان لە هەندێک شوێنی تر ڕێگەیان کرد، دەبوایە هەوڵیان بدایەوە کە دوژمن درکیان پێنەکات و بەدیقەت بن، هەتا لە تیشکی گڵۆپەکانی گوندی ئاکرەک نزیک ببونایتەوە ترپەی لێدانی دڵیان زیادی دەکرد، بەڵام وەڕینی سەگەکانی گوندەکە هەموو شتێکی لێیان تێکدا، هەنگاوەکانیان خێراتر کرد، ناچاربوون بگەنە شوێنێکی دڵنیا تاکو خەڵکی گوندەکە نەیانبینێت، ماندوبونی خۆیان لەبیر چۆبۆوە، ئیتر ئاسەواری بەفر نەمابوو پێیان لە وشکایی خاک گیرکردبوو هەروەها هەوراز و بەرزایش نەمابوو، ئێستا بەسەر ڕێگەی ماشێنەوە ڕێیان دەکرد، هەموویان لە ئامادەباشیدا بوون، بەشێوەیەک دەجوڵانەوە واهەست دەکرا کە هەر ئێستا شەڕ و پێکدادان دێتە ئاراوە، ئەگەر بیانتوانیایە لەسەر پردەکە بپەڕنەوە ئەوا ئیتر مەترسی لە ئارادا نەدەما.

سەرەتا گرووپێکیان بەسەر پردەکە پەڕییەوە، دوایش ئەوانی تر، هیچ ناخۆشییەک نەهاتە ئاراوە، کەخۆیان گەیاندە بن گابەردێکی گەورە هەناسەیەکی ڕەحەتیان هەڵکێشا، لەو شوێنەی لێی دانیشتبوون لە خوارەوەی چەمێک هەبوو، ئەوێ بۆ حەوانەوەیان شوێنێکی خۆش بوو، بەڵام شاهین هەرلەخۆیەوە ئەمەی پێباش نەبوو، شاهین چووەلای باگەر و پێیووت "بالەم قەدپاڵە دانەنیشین! ئێمە نازانین زرێپۆشەکان لەکوێن، ئەگەر شەڕ بێتە ئاراوە هەتا بە گردەکەدا سەردەکەوین شەهیدمان لێدێتە ئاراوە". باگەر تەماشای دوای خۆی کرد، قەد پاڵەکەیان دوای ٥٠ مەترێک چەمێک ناوقەدی بڕی بوو، دەبوایە لێرە پشویان بدایە یان بچن بۆ خوارەوە بۆ چەمەکە.

بەرچەم بە کۆنترۆڵکردنی بێتەلەکەوە سەرقاڵ بوو، باگەر بۆنەوەی شارەزای ناوچەکە بێت بەردەوام پرسیاری لە پالۆ دەکرد، پالۆ وتی "ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەی خوارەوە چەم نییە، ئەمە ڕێڕەوێکی ئاوە کە خەڵکی دێیەکە درووستیان کردووە، لایەکی هەتا چەمەکەی گوندەکە درێژ دەبێتەوە هەروەها لەسەرەوەش چەندین ڕێڕەوی وایتر هەیە، خەڵکی گوندەکە ئەمەیان بۆ بێستانەکانی خۆیان درووستکردووە"، بەرچەم بە بێتەلەکەی دەستێوەی لە باگەر نزیک بۆوە، بەرچەم وتی "پێموابێت لەم نزیکانە هێزی دوژمنی لێیە! "باگەر بێتەلەکەی لێسەند، لە بێتەلەکەوە دەنگێک دەیووت "گەورەم هەموویان لە شێوەی شریدن تەقەیان لێبکەم؟! "باگەر تەماشای هەڤاڵەکانی کرد کە پشویان دەدا، هەموویان لە شێوازی شریدی دانیشتبوون، باگەر بەمە شڵەژا و هاواریکرد "هەمووتان ڕاکەن بۆ چەمەکە"، کاتێک گەریلاکان بە چەپ و ڕاستدا کەوتنە ڕاکردن کارلەکار ترازا و بوو بە ڕۆژی قیامەت، فیشەکەکانی زرێپۆشەکە دەکەوتە نێوان گەریلاکانەوە، ئەو فیشەکانەی دەکەوتنە نێوان گەریلاکانەوە ئاگریان لێدەباری، تەپوتۆز بەرزببۆوە و بەرد و درەختەکان پارچەیان دەچوو بە ئاسماندا و گەریلایان تیابوو غلببۆوە و تیایاندا هەبوو بەدەم دەکەوت و نەیاندەتوانی کەهیچ بکەن، قەد گردەکە پڕبوو لە خوێن و پارچەی گۆشتی گەریلا، لەبەرئەوەی بڵاوەیان لێکردبوو نەیاندەزانی کە کێ و چۆن بەرەو کوێ چووە.

باگەر چەکەکەی لەدەست پەڕی بوو، کە گەیشتە ڕێڕەوە ئاوەکەی خوارەوە ڕووبەڕووی دڵگەشە قۆزەکەیان بۆوە، باگەر لێی پرسی:

"هەڤاڵانی تر چییان لێهات؟"

"زۆربەیان کەوتن و هەندێکیشیان خۆیان گەیاندە ئەو دیو گردەکەوە"، باگەر وتی "چەند هەڤاڵت بینی؟"

"گرووپێک بوون ئەم ژماردن".

"ئەی باشە چەمەکەی سەرەوە لەگەڵ ئەم چەمە یەک دەگرنەوە؟"

"نازانم".

"بابڕۆین".

بەو شەوە تاریکە بەرەو دەستی باشوریان لەناو ڕێڕەوە ئاوەکەدا کەوتنە ڕێ، باگەر هەستی بە زریکانێک کرد لە دەست و قاچی، تەماشایەکی خۆی کرد، هیچ حاڵی نەبوو، تەماشای دواوەی خۆی کرد و کەوتە چاوەڕوانییەوە. دڵگەش وتی "لێرە چاوەڕێ بکەین". باگەریش وتی "باکەمێک چاوەڕێ بکەین لەوانەیە هەڤاڵان بێن"، کات درەنگ بوو، کەمی مابوو ڕۆژ هەڵبێت، هەرکە دونیا ڕۆشن بۆوە دوژمن خۆیان دەگەیاندە ئێرە، نەیاندەتوانی لەم ڕێڕەوە بمێننەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش دڵگەش بە باگەری نەدەووت با لێرە بڕۆین، باگەر لەدڵی خۆیدا واهەستی دەکرد کەلەوانەیە هەڤاڵی هەبێت لەناو ڕێڕەوەکە و لەوانەیە بریندار بوبێتن و هاواربکەن و بڵێن لێرە جێمان مەهێڵن، باگەر نەیدەویست لەبەرخاتری خۆی بژی بەڵکو دەیویست لەپێناو هەڤاڵەکانیدا تەمەنی درێژ ببێتەوە، ئەگەر ئەژیا دەیویست لەپێناو هەڤاڵیدا بژی، جەستەی پارچەکراوی هەڤاڵەکانی چەند مەترێک لەولاوە لەژێر فیشەکدا مابونەوە، باگەر وەک ئەوەی لێهاتبوو کە پارچەی جەستەی هەڤاڵانی دەبینێت، دوای نەمانی تەقەی زریپۆشەکان دونیا ئەوەندە بێدەنگ و کشومات بوو هەروەک ئەوە وابوو کەلەم گەردوونە هەرنەوان بژین.

باگەر مەراق ئەوەی هەبوو کە بزانێت کێ شەهید بووە، دەیویست بزانێت ئایا شاهین یان پالۆ یاخود بەرچەم یان وەحشەت یان بێستا یان غالیب یان گەریلایەکی تر ئەرێ کامیان شەهید بوونە، ئەی کێ ڕزگاری بووە، ئەوانەی ڕزگاریان بووە چی دەکەن، ئەی ئێستا کێ چاوەڕوانی شتێک لەخۆی دەکات، ئەم پرسیارە بێ وەڵامانە ناخی خواردبوون، ئێستا باگەر نە چەکی پێ بوو نە هەڤاڵانیشی لەگەڵیدا بوون، باگەر لە دڵگەشی پرسی "ئەوانەی شەهید بوون کێن؟ تۆ کەسیانت بینی؟ "دڵگەشیش وتی "کەسم نەدی"، باگەر لەوەدەچوو کە هەست بکات کە یەکەمجارێتی کە چواردەوری بگیردرێت، هەستی تەنیای خنکاندبووی و لەلایەکی تریشەوە دەیویست ئەسپی هێرشکردن و تۆڵە تاوبدات، ئەگەر بیتوانایە هێرشی بۆ شوێنێک بکردایە ئەوە دڵی ئاوی دەخواردەوە، ئەی باشە چۆن و هێرش بۆکوێ بەرێت؟ ئەو تەنانەت چەکیشی پێنەبوو، ئەی ئەیتوانی ئەم هەموو ئازارە لە دڵی خۆیدا جێبکاتەوە؟ دوای ئەو

هەموو شەهادەتە ئیتر چۆن واتای ژیان دەمێنێت؟

بەیانی کەیەکەم تیشکی خۆت بەرزبۆوە جۆشوخرۆشیش زیادی کرد، بەڵام دوای کەمێکی تر ئەم جۆشوخرۆشیە سەری خۆی نایەناو بێدەنگییەوە، ئیتر باگەر نەقسەی پێدەکرا و نە جوڵانەوەیەکیشی هەبوو کە پێی بوترێت هێشتا لەژیاندایە، بەو شێوە تاساوییە لە شوێنی خۆی مابۆوە، دڵگەش چاوەڕێی باگەر بوو کە فەرمانێکی پێبکات، بەڵام فەرماندەکەی لەو حاڵەتەدا نەبوو کە هیچ فەرمانێک بکات، دەشیبینی کە باگەر بەمەش زۆر غەمبارە، لەناکاو دڵگەش چاوی کەوت بە خوێن بەسەر بەرگەکانی باگەرەوە، دڵگەش پێیووت "هەڤاڵ برینداریت"، باگەر لەوەدەچووتازە هەستی پێکردبێت سەرەتا تەماشای قۆڵەکانی کرد پاشان قاچەکانی، باگەر وتی "وابزانم شتێکم بەرکەوت "دڵگەش جامانەکەی لە ملی کردەوە و قۆڵی باگەری بەست، ویستی تەماشای قاچیشی بکات، بەڵام باگەر ئەمەی قەبوڵ نەکرد، ئەگەر هێزی دوژمن بهاتنایە بۆ ئێرە نەیاندەتوانی لەم ڕێڕەوی ئاوەدا خۆیان بشارنەوە، دڵگەش ئەمەی دەزانی هەربۆیە بە هیوای پەیداکردنی شوێنێکی گونجاو کەمێک ڕێی کرد، نەیتوانی کوونە بەرێک بدۆزێتەوە، نەشوێنێکیش کە بتوانن بیکەن بەسەنگەر و شەڕی لەپاڵدا بکەن، دوایش هەرلەناو ڕێڕەوەکەدا ڕێڕەوێکی تری دۆزییەوە کە خەڵکی گوندەکە درووستیان کردبوو، گەڕایەوە لای باگەر، دڵگەش پێیووت "کەمێک لەولاوە لەناو ڕێڕەوەکەدا کونێک هەیە "، باگەریش پێیووت "پێویست بەمە دەکات؟ "دڵگەشیش وتی "دەتوانین خۆمان لەوێ بشارینەوە"، باگەر بە شێوەیەکی نەخوازیارانە ڤیتبۆوە و کەمێکیش قاچی دەشەلی، دەستی گرت بە شانی دڵگەشەوە، کە گەیشتنە ئەو شوێنەی دڵگەش باسی کردبوو باگەر چاوێکی گێڕا، ئەم شوێنە لە تونێلێکی دوومەتری دەچوو، دیاربوو خەڵکی گوندەکە لێرەش ویستوبویان ڕێڕەوێکی تر بکەنەوە، بەڵام وادیاربوو پەشیمان ببونەوە، چوونە تونێلەکەوە، ئێرە ئەوەندە پان بوو کە هەردووکیان دەیانتوانی لەهەمبەر یەکتر دابنیشن، باگەر هەستی کرد کە دڵگەشیش چەکی پێنییە، لێی پرسی "چەکەکەت کوانێ؟ "دڵگەشیش وتی "لەدەستم پەڕی، بەڵام دەمانچەم پێیە "، دوایی باگەر کەوتەوە یادی کەلەبەرئەوەی لە کەمپەکەیان دڵگەش

چێشتخانەی بوو دەمانچەی دابوو پێی، ئێستا هەردووکیان بەو دەمانچەیەوە مابونەوە.

دونیا بەتەواوەتی ڕووناک ببۆوە، شوێنەکەیان کەمێک شێداربوو، لەبەرئەوەی کە شوێنەکەیان شێداربوو ئەو شوێنەی لەسەری دانیشتبوون لەشیانی تەڕ کردبوو، هەستیان بە لەرزینی خۆیان دەکرد، دڵگەش لەسەرمادا هەڵدەلەرزی، خۆی گڕمۆڵە کردبوو، هەوڵیدەدا کە لەرزینەکەی نەهێڵێت، کەوتنە چاوەڕوانییەوە، باگەر لە دونیای بیرکردنەوەدا بوو، بیری لەیەکەم ڕۆژانی هاتنی بۆ هەرێمی دەرسیم دەکردەوە، هەستی بە هەمانشت کردەوە کە لە ڕێگە بەرەو دەرسیم هەستی دەبزوان، ئەوکاتە خوازیاری ئەوەبوو کە بەزووترین کات بگاتە هەرێمی دەرسیم، لەهەمبەر عینادی و قینی لە دوژمن بیری لە خۆشەویستی و جۆشوخرۆشانی ئەو یەکەم ڕۆژانەی دەکردەوە کە هاتبوو بۆ هەرێمی دەرسیم، لەدڵی خۆیدا وتی ئەی من چۆن دەتوانم بەم حاڵەوە لەهەمبەر سەرۆک ئاپۆ بوەستم؟ بیری لە دکتۆر باران کردەوە، پێش چەند ساڵێک باران مردنی هەڵبژاردبوو، ئایا باشترین شت بکرێت ئەمەی بارانە؟ ئایا ئەمە بەدەلی سەرکەوتن و هیچ لەدەست نەهاتنە؟ باگەر دەیزانی کە سەرۆک ئاپۆ لایەنگری خۆکوشتن نییە و ڕەخنەی ئەم کارە دەکات، ئەگەر ئەمە قەبوڵیش نەکرێت لەهەمانکاتدا شێوازێکە لە شێوازەکانی بەدەلداین.

باگەر تەماشای دڵگەشی کرد، دڵگەش قاچەکانی گڕمۆڵە کردبۆوە و نوسانبووی بە سکێوەی، ئەویش لە باگەری دەڕوانی، بەزەیی بە دڵگەش هاتەوە، دڵگەش ساڵانێکی دوورو ودرێژە بەبێ وەچان لە چێشتخان سەرقاڵی ئامادەکردنی خواردن بووە بۆ گەریلا و لەم عەمبارەوە بۆ ئەو عەمبارە چووە و ئازوقەی دابینکردووە، فیداکاری و دڵسۆزێکەی و گرێدراوی بە هەڤاڵەکانێوەی مایەی شانازی هەڤاڵەکانی بوو، هەتا ئێستا باگەر گوێی لە هیچ سکاڵایەکی نەبووە کەلە دڵگەش کرابێت یان خۆی کردبێتی و خۆی لە ئەرک دزیبێتەوە، هەتا توانیبێت کاری کردووە، لەمبارەیەشەوە غیرەی بە دڵگەش دەکرد، هۆکارەکەشی نەدەزانی، بەڵام غیرەی پێدەکرد، ئەگەر خۆیشی وەک گەریلایەکی بێناو بکوژرایە ئەمەی بۆخۆی بە گەورەترین خەڵات دەبینی لەم

هەلومەرجەدا، کاتێک دڵگەشی بینی هەڵوێستەیەکی کرد، ئەویش هەڵوێستەی کرد، گوێیان لە دەنگێک بوو، دڵگەش لە تونێلەکە کەمێک دەرچوو گوێی گرت، دەنگی سەرباز بوو، جارێکی تر گەڕایەوە ناو تونێلەکە، دڵگەش بە باگەری وت:

"سەرباز".

"دەمانچەکەتم بەرێ".

دڵگەش تاسابوو، دڵگەشیش پێیووت "نەخێر نایدەم"، ئەمجارەیان باگەر سەری سوڕما، بە دەنگێکی توڕەوە پێیووت "دەمانچەکەتم بەرێ"، دڵگەش دڵی پڕبوو لە گریان، خەریک بوو دەگریا، لێوەکانی تەتەڵەیان دەکرد، دڵگەش لە باگەری پرسی:

"چیدەکەیت بە دەمانچەکە؟"

"تۆ حەقت چییە کوا دەمانچەکەم بەرێ".

دڵگەش هەرچییەکی دەکرد نەیدەویست دەست بەرێت بۆ دەمانچەکەی و دەری بهێنێت، بۆئەوەی نەگری فرمێسکەکانی ناخی خۆی دەخواردەوە وەک ئەوەی نزرگەی گرتبێت وابوو، چاوەکانی پڕببوون لە فرمێسک، لەلایەکەوە نەیدەویست دەمانچەکە بدات بە باگەر لەلایەکی تریشەوە نەیدەتوانی درێژە بە بەجێنەهێنانی فەرمانەکەی باگەر بدات، باگەر لێی پرسی:

"بۆچی دەگریت؟"

"نازانم ئەترسم خۆت بکوژیت".

باگەر بەم قسەیەی دڵگەش خەریک بوو شێت ببێت، نەیدەزانی کەچی پێبڵێت، نەیدەویست دڵی دڵگەش بشکێنێت، بەڵام دەشبوایە دەمانچەکەی لێبستێنێت، باگەر پێیووت:

"مەگری کوا دەمانچەکەم بەرێ".

"بەڵێنم بدەرێ کە خۆت ناکوژیت پاشان دەمانچەکەت دەدەمێ؟"

باگەر هەر لە چاوەکانی دڵگەشی دەڕوانی، پێیووت:

"ناتوانم ئەم بەڵێنەت بدەمێ".

باگەر دەستی درێژکرد بۆ ناو قەدی دڵگەش و دەمانچەکەی دەرهێنا، میلی هێنایەوە.

دڵگەش وتی "پێویست بە خۆکوشتن ناکات لەوانەیە ئێرە نەدۆزنەوە "، دڵگەش زۆر هەوڵیدا و ئەوەی لەدەستی هات کردی تاکو باگەر لە خۆکوشتن پاشگەز بکاتەوە، باگەر ماوەیەکی زۆر بوو پێنەکەنی بوو بە خەندەیەکەوە بە دڵگەشی وت:

"ئەمە جەنگە، ئێمە خۆمان بۆ مردن ئامادەکردووە وانییە؟ من ناتوانم رێگە بدەم کە بە دیلی بمگرن، ئەمە وەک خیانەت هەژمار دەکرێت، تۆ پێویستە لەمە حاڵی ببیت، کەزانیمان بە دیلی دەگیرێین و دەکەوینە دەستی دوژمن دەبێت تۆ بمکوژیت، ئەگەر بە دیلی بکەومە دەستی دوژمن ئەمە دەبێتە هۆکاری بەرز بوونەوەی ورەی دوژمن، من ناتوانم لەهەمبەر ئێوە و گەل و خۆشمدا خیانەت بکەم، ئێستا دەبێت بەباشی گوێم بۆ ڕاگریت، من ئەم چالاکی خۆکوشتنە لەپێناو ئەوە ئەنجام دەدەم کە بە دیلی نەکەومە دەستیان، پێویست ناکات تۆ ئەمە بکەیت و وەکو من خۆت بکوژیت، تۆ دەبێت بە شاهیدحاڵی من، ئەگەر تۆش بەدیلی بگرن تەنها ئەشکەنجەت دەکەن کە دڵنیام ئەشتوانیت بەرگەی ئەمە بگریت ".

دڵگەش زۆر بە وردی گوێی بۆ باگەر ڕاگرتبوو، هیچی پێ نەووت، کەوتنەوە چاوەڕوانی، دەنگی سەربازەکان جارناجارێک دوور و جارناجارێک نزیک دەبۆوە، لەناکاو دەنگی چەند سەربازێک هات لەبان سەریان، باگەر لوولەی دەمانچەکەی خستە ژێر چەناگەی و گوێی بۆ سەربازەکان ڕادێرا، سەربازێک وتی "گەورەم هەشتیان لێرەن "، دەنگێکی تر وتی "هەموویان مردوون "، لەبێتەلەکەیانەوە دەنگی تر دەهات، بەڵام لێی حاڵی نەدەبوون، بەڵام دەنگی سەربازەکە بەباشی دەگەیشتە باگەر و دڵگەش، سەربازەکە وتی "ناخێر گەورەم یەکێکیان زیندووە، ئەوە ٢٠ ڕۆژە لەم ناوەن، زیاتر دوور ناکەونەوە، نۆکیان خواردووە، هەواڵی ئاکتاش نازانن، فەرمانتە گەورەم "، دەنگەکەی بێلەکەش وتی واز لە لاشەکان بهێنن و چەکەکانیان کۆکەنەوە و بگەڕێنەوە سەنگەرەکانتان.

باگەر هێشتا دەمانچەکەی لەژێر چەناگەی گرتبوو، دڵگەش وتی ڕۆیشتن، باگەر تەماشایەکی دڵگەشی کرد، هێشتا چاوەکانی دڵگەش تەڕ بوون، باگەر

نەیدەتوانی زیاتر تەماشای چاوە پڕ لە پاڕانەوەکانی دڵگەش بکات هەربۆیە نەیتوانی زیاتر لێی بڕوانێت، باگەر وتی "هەتا ئێوارە لێرە دەمێنینەوە دەمانچەکە بخەرەوە قەدی خۆت".

دڵگەشیش بە قسەکانی باگەر پێکەنی.

## ١٥

دەستی حەیدەریان بەستەوە، لەسوچی هەرە دواوەی ئەشکەوتەکە دانیشتبوو، تورشاوێکەی دەموچاوی دەریدەخست کە زۆر بێتاقەتە، جارێکی تر خۆی تووشی بەڵا کردبوو، کە هەستی کرد بە هەڵە لە مەلسا حاڵی بووە کارلەکارترازا بوو، حەیدەر پێیوابوو کە مەلسا کەسێکی ساویلەکە و بێ نومێدە و بێزارە و لەبەرئەوەی خۆیشی وابوو بۆیە بەهەمان شێوە بیری بۆ مەلسا چووبوو، هەڵە چاوەڕوان نەکراوەکەی حەیدەر، خەیاڵ و تێزەکانی هێلینی لەکەدار کردبوو، گەورەترین هەڵەی حەیدەر ئەوەبوو بە چاوی لاوازێکەی خۆیەوە لە چواردەورەکەی دەڕوانی، بەڵام یەکێک لە هۆکارەکانی بێهودەیی هێلین حەیدەر خۆی بوو، حەیدەر هەستی کردبوو کەلە ئاکامی نەزانینێکەیەوە خۆی کەوتۆتە داوی خۆیەوە.

کەسیان لەبارەی حەیدەرەوە قسەی خێریان نەدەکرد، هەربۆیە دەبوایە ڕێوشوێنی گونجاو بگرنە بەر، هێلین هەموویانی کۆکردەوە، لەبارەی کردنی هەرشتێک لەهەمبەر حەیدەر دەبویست بە گشتی بڕیاری لەسەر بدەن، دەبوایە حەیدەر بەرامبەر ئەو کارە قێزەوانەی کردبووی شتێکی لەهەمبەر بکرێت، هێلین کە هەموو هەڤاڵەکانی کۆکردبۆوە بەبێ ئەوەی درێژە بە قسەکانی بدات پێیانیوت "پێتان باشە لەبارەی حەیدەر چیبکەین، پێشوتریش سزای کوشتنی بەسەرا سەپێنرابوو، بەڵام هەمووجارێک خۆی لەم سزایە ڕزگار کردووە، ئیتر دەبێت بڕیارێکی موتڵەق لەمبارەیەوە بدەین".

گەریلایەکیان تیابوو بەناوی ئەنوەر ئەویش وتی "ئێمە لەم حاڵەتانەدا ناتوانین بڕیار بدەین، ئێمە ئەو دەسەڵاتەمان نییە هەروەها ڕەوشیشمان گونجاو نییە،

لەکێ پرسین ڕازیت حەیدەر بکوژین ڕاستەوخۆ دەست هەڵدەبڕێت هەروەها لەبارەی بڕیاری کوشتنیشی نە ئێمە و نە بارەگای گشتیش ناتوانێت ئەم بڕیارە بدات، ئێمە ناتوانین بەبێ ئاگاداری سەرکردایەتی بڕیارێکی وابدەین "، هێلینیش پرسی "ئەی باشە چیبکەین؟ "ئەنوەریش وتی "باشترین شت ئەوەیە حەیدەر بگەهێنینە بارەگای سەرەکی با ئەوان بڕیار بدەن "، گوڵیزار بەو برینداریەی خۆیەوە دەستی بەرز کردەوە، توڕە دیاربوو پێیانیوت "دەبێت ماف ژیان بەو جۆرە کەسانە نەدرێت، بەناوی حقوق و یەکسانییەوە لەخۆمانمان بارکردووە، پێویستە لەهەمبەر دوژمن ئەوەندە بەخشندە نەبین، من پێمباشە هەر ئێستا بکوژرێت "، هێلین وتی "ئێمە مافی ئەم بڕیارەمان نییە "، دوای ئەم قسەیەی هێلین حەیدەر بە سیمایەکی گاڵتەجاریەوە و بە پێکەنینێکی چاو حیزانە تەماشای گوڵیزاری کرد.

گوڵیزار هەستی بەم تێڕوانینەی حەیدەر کرد هەربۆیە بەبێ ئەوەی مۆڵەتی قسەکردن وەربگرێت هەڵیدایە ووتی "با بیکوژین، من هەموو بەرپرسیاریەک لە ئەستۆ دەگرم "، ڕۆدی بۆئەوەی ڕەوشی گەنگەشەکەیان بەرەو ئاقارێکی تری سەختدا نەڕوات دەستی هەڵبڕی بۆئەوەی قسەبکات و دوای ئەوەی مۆڵەتی پێدرا پاشان وتی "پێویست بە گەورەکردنەوەی مەسەلەکە ناکات، ئێستا لەناو جەرگەی شەڕداین، با لە مزاری سەرەکی خۆمان دەرنەچین، با بەهۆی کێشەی ناو خۆمانەوە خۆمان نەپوکێنینەوە، یەک، دوو هەڤاڵێک بیبەن بۆ دەربەندی عەلی و ڕادەستی بارەگای بکەن، ئیتر بارەگا چی بڕیارێک دەدات ئارەزووی خۆیانە "، هێلینیش وتی "من ئەمەم پێباشە باوابکەین، پێویست ناکات حەیدەر بەو شێوەیە گەورە بکەینەوە "، هێلین ماوەیەک کەوتە چاوەڕوانییەوە، جگە لە تێڕوانینە غەزەبێکەی گوڵیزار کەس دژبەری ئەم پێشنیارە نەبوو هەربۆیە هێلین وتی "کۆبونەوەکەمان تەواو بوو ".

ڕۆدی و هێلین بە جیا لە شوێنێک لەبارەی چۆنیەتی بردنی حەیدەر کەوتنە ناو قسەوباسەوە، زۆربەیان بریندار بوو، ئەوەی دەیتوانی ڕێبکات لەناویاندا هەر ٣ بۆ ٤ گەریلایەکیان بوو، نەیاندەزانی چۆن دوو کەس دیاری بکەن بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، دوای قسەوباسێکی زۆر مەلسا و ئەنوەریان بە گونجاو

بینی، هێلین هەردووکیانی بانگکرد و بڕیارەکەی خۆیانیانی پێووتن، هێلین بە کورتی پێیانیوت "حەیدەر بە ئێوە ڕادەسپێرین، ئەنوەر شارەزای دەربەندی عەلییە، ئەنوەر لە پێشەوە و مەلساش لەدواوە ڕێبکات،حەیدەریش بخەنە ناوەڕاستی خۆتانەوە، دەستی مەکەنەوە، بەسەلامەتی خۆتان بگەهێننە بارەگاکە و گریمانەیەکی زۆر هەیە کە ڕوبەڕووی هەڤاڵ ئیبراهیمیش ببنەوە خۆتان ڕەوشەکەی تێبگەهێنن"، دوای ئەم قسە و باسانە کەوتنە ئامادەباشی ڕێکردن، دوای ئەوەی نان و کەمێک تۆراغیان هەڵگرت دەمەوئێوارە بەڕێکەوتن، بە هەورازەکانی گامردا ڕێیان کرد، هەرچەندە دونیا تاریک بوو ئەمجارەیان ڕوبەڕووی تەمومژی گامریش ببونەوە، لەو شەوە تاریکەدا پەردەیەکی سپی تەمومژ بەسەر دارستانەکەدا دادرابوو، بەگشتی ئەم ناوچەیە بە ڕۆژ تەمومژی هەیە، بەڵام ئەمجارەیان بەپێچەوانەوە بوو، سەرەڕای ترسی ئەوەیان هەبوو لە ونکردنی ڕێگە، بەڵام لە ڕێکردن بەردەوام بوون، ئاسمان هەوراوی بوو، لەوە دەچوو کە کەمێکی تر باران دابکات، لەهەمانکاتدا وەرزی باران بارین بوو، مەلسا دەردی دۆزینەوەی ڕێگەی نەبوو لەهەمانکاتدا ترسی ونکردنیشی نەبوو، بەڵام ئەنوەر هەوڵی دەدا کە لە ڕێگەکەی خۆی لانەدات، لەڕاستیدا ئەنوەر وەک ناو لەپی دەستی شارەزای ئێرە بوو، چەندیجار لێرەوە هاتبوو ڕۆیشتبوو، بەڵام ئێستا ڕەوشەکە جیاواز بوو، بەهۆی بەفر و تەمومژ و بارانیشەوە لەوانەبوو ڕێگەکەی لێتێک بچێت، لەدڵی خۆیدا وتی ئەگەر حەیدەر هەستیکرد ناتوانین زیاتر ڕێ بکەین دەگەڕێم بۆ شوێنێک تاکو لێی بمێنینەوە، لەو ڕێگەیانەی تێدەپەڕی چاوی بۆ ئەشکەوتیش دەگێڕا، بەڵام لەسەر ڕێگەکەیان چاوی بە هیچ شوێنێکی گونجاو نەدەکەوت، هەتا تاریکی زیاتری بکردایە ئەنوەر زیاتر نیگەران دەبوو، تەماشایەکی دواوەی کرد، حەیدەر بە شێنەیی ڕێی دەکرد، مەلساش بە هەناسە بڕکێوە بەدوای حەیدەرەوە بوو.

ئەنوەر ئەوەی وەبیرهاتەوە کەکاتی خۆی لەگەڵ حەیدەر بەیەکەوە هاتبوون بۆ ئێرە، ڕاوەستا، دوودڵ بوو لەبارەی ئەوەی ئایا لە حەیدەر بپرسێت کەلەم ناوە ئەشکەوت هەیە یان نا، ئایا کردنی ئەم پرسیارە لەجێی خۆیەتی یان نا؟ پرسیارنەکردن لەوانەبوو خراپتر بێت، لەناکاو حەیدەر خۆی گەیاندە ئەنوەر

و ئەنوەریش پێیووت "لێرە ئەشکەوتێک هەبوو وانییە؟ "حەیدەر نەیدەویست وەڵامی بداتەوە، تەماشای چواردەوری خۆیکرد، ئەنوەر پرسیارەکەی دووبارە کردەوە "ئەشکەوتی لێیە؟ "حەیدەریش بە دوودڵییەکەوە وتی "هەیە "، بەشێوەیەک خۆی نیشاندا کە نایەوێت جارێکی تر پرسیاری لێبکاتەوە، ئەنوەریش بە توڕەبونێکەوە وتی "بەڵێ هەیە خۆ لێت ناپرسم لەکوێیە "، حەیدەریش وتی "لە پێشمانە دوای ۱۰ خولەکێک پێی دەگەین "، ئەنوەریش پێیووت "دەی بکەوەپێشم "، حەیدەر کەوتە پێش ئەنوەر، ئەنوەر بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن ئەمنیەتی چەکەکەی کردەوە، ئەنوەر باوەڕی بە حەیدەر نەبوو ئەگەر هەڵبهاتایە تەقەی لێدەکرد، حەیدەریش ئەمەی دەزانی، ئەشکەوتەکە بەگوێرەی قسەکانی حەیدەر دۆزرایەوە، دوای ۱۰ خولەکێک گەیشتنە ئەشکەوتەکە، کەشوهەوا زۆر سارد بوو، دەبوایە بە زووترین کات ئاگریان بکردایەتەوە.

ئەنوەر لەلای حەیدەر مابۆوە و مەلساش بۆکۆکردنەوەی دار و پووش لە ئەشکەوتەکە هاتبووە دەرەوە، دوای ماوەیەک بەباووشێک چڵ و لقی بچکوکەوە گەڕایەوە ناو ئەشکەوتەکە، ئەشکەوتەکە لە ژوورێکی گەورەی دەکرد، کوونی ئەشکەوتەکە هەرلە دەرگا دەچوو، یەکێک نەزانێت تۆپێکی لێدراوە و بەو شێوەیە کوونیان کردووە، ناوەوەی وشک بوو، بەفر و باران نەیدەگرتەوە، لەناو ئەشکەوتەکە ئاگریان کردەوە، لە چواردەوری ئاگرەکە لێی دانیشتن، شەرمی نێوانیان بە ڕووی تیشکی ئاگرەکەی بەردەمیانەوە دیاربوو، مەلسا نیگەران و غەمگین بوو ئەمەشی بە سیمایەوە دیاربوو کە هەرگیز پێی ڕانەهاتبوو، حەیدەر دەموچاوی دابوو بەیەک و بەتەواوەتیش لاواز ببوو، هەستی دەکرد کە بەتەواوەتی لە هەموو شتێک دابڕاوە و نومێدەکانیشی وەک چۆلەکەیەک فڕی بوو، لەهەمانکاتدا نەشی دەزانی کە نومێدەکانی چین، هەستی دەکرد کە ئیتر لەدوا ڕێگەی کاروانەکەیەتی، حەیدەر دەبوایە بە قەدەری خۆی ڕازی بوایە یان دەبوایە بۆ ڕزگاربوونی ڕێگەیەکی بدۆزیایەتەوە، بەڵام نەیدەزانی کە کامەیان هەڵبژێرێت، مردن بە فیشەک وەک سزا ئازاری دەدا، بەڵام لەهەمانکاتدا کۆتایی بە خراپکارێکانی ناو ناخیشی

دەهێنا، دەشیزانی کەلە ئەنجامی ئەم کارە باشەی لەگەڵ دەکەن بە مردنی لەم مەینەتیەی ڕزگاری دەبێت، ئەو هەستی بە گەورەیی ڕق و قینەی ناخی دەکرد، هەتا ڕق و قینی گەورە ببونایەتەوە ماخولانی دەگرت، دەیزانی کەلە شۆڕش بەتەواوەتی دابڕاوە.

مەلسا هێشتا بڕیارێکی تەواوی نەدابوو کە ئایا لە حەیدەر توڕەبێت یان بەزەیی پێدابێتەوە، هەروەکو هێلین وتی ئایا حەیدەر ئەو کەسەیە کە دەبێت بەزەیی پێدابێتەوە؟ مەلسا خۆی لەم مەسەلەیە بە دوورگرت، لەوە دەچوو کە نەتوانن ڕێگەبگرنەوەبەر، باران زۆر بە دژواری دایکردبوو، ڕەشەبا تۆزەکانی سەر کڵپە و خۆڵەمێشەکەی بەناو ئەشکەوتەکەدا بڵاودەکردەوە، ئەنوەر تەماشای حەیدەری دەکرد کە بە دەستی بەستراوەیی لە سوچێکدا دانیشتبوو، دوای ماوەیەک ئێشکگرێکەی خۆی ڕادەستی مەلسا کردوو خەوی لێکەوت.

مەلسا لە دەوری کڵپەکان دانیشت، هەستی بە تەنیایی دەکرد، بە پژاڵێک خۆی بە تێکەڵکردنی پشکۆکان سەرقاڵ کرد، تۆزی پشکۆکان بەسەرو چاویدا هاتن و سوور هەڵگەڕا بوو، لەوملاولەولای خۆیەوە چەند چڵێکی تری کۆکردەوە خستییە ناو پشکۆکانەوە، پشکۆکان ئاگریان زیادی کرد و ناو ئەشکەوتەکە کەمێک ڕووناک بۆوە، تەماشایەکی هەردووکیانی کرد نوستبوون، ئەنوەر خۆی گرمۆڵە کردبوو، لەوەدەچوو لەناو خەوێکی خۆشدا بێت، هیچ دەنگێک لە حەیدەرەوە نەدەهات، جامانەکەی دابوو بەسەرخۆیدا، دیاربوو لەبەرئەوەی دەستەکانی بەستراببوون نەیتوانی بوو جامانەکە بدات بەخۆیدا، مەلسا هەڵسا و بە جامانەکەی خۆی حەیدەری داپۆشی و گەڕایەوە و لە چواردەوری ئاگرەکە دانیشتەوە، ڕابوردوی هاتەوە بە ئەقڵدا، بیرەوەریەکانی منداڵی کەوتەوە خەیاڵ، چەند ڕووداوێکی تاڵیشی کۆنی هاتەوەیاد، بەڵام ئێستا ئەوەندە بێ حەوسەڵە و بێزار ببوو تاقەتی ئەوەی نەبوو کە زیاد بیریان لێبکاتەوە، ئەگەر زیاتر بیری لێبکردنایەتەوە لە دەستیان ڕزگاری نەدەبوو هەروەها چەندین نهێنیشی هەبوو کەلە دڵی خۆیدا هەڵیگرتبوون، هەرکاتێک تەنیا دەبوو کە بیری لەو نهێنیانەی خۆی دەکردەوە پێکەنینی بە نهێنێکانی خۆی دەهات، چاوی کەوتەوە سەر ئاگرەکە، جارێکی تر بە پژاڵەکەی

دەستی ئاگرەکەی خۆشکردەوە، بۆئەوەی زیاتر ئاگرەکەی خۆشبکات چەند چڵ و لقێکی بچوکی خستە سەر ئاگرەکە، هەستی بە چرپەچرپێک کرد، هەڵوێستەیەکی کرد، ئاوڕی دایەوە، حەیدەر لەبان سەری ڕاوەستابوو، مەلسا دەستی برد بۆ چەکەکەی و لە حەیدەری پرسی "چی بووە؟""دەمەوێت بچم بۆ بۆسەر ئاو دەستەکانم بکەرەوە"، مەلسا نەیدەتوانی بڵێت باشە لەهەمانکاتدا نەیتوانی بڵێ نەخێر، تەماشای ئەنوەری کرد، ئەنوەر خەوتبوو، مەلسا بە حەیدەری وت "پێویست ناکات دەستت بکەمەوە بڕۆ بەردەم ئەشکەوتەکە و کاری خۆت بکە و بگەڕێوە"، حەیدەر چوو بۆ بەردەم ئەشکەوتەکە، مەلسا ڕێگەی داکە هەتا ئەو شوێنە دووربکەوێتەوە کە دەیتوانی ببینێت، مەلسا میلی چەکەکەی ڕاکێشا، حەیدەر بە خێرایی کارەکەی خۆی تەواو کرد و بەلای مەلسادا تێپەڕی و چوو لە شوێنەکەی خۆی درێژ بۆوە.

مەلسا ماوەیەک کەوتە تەماشاکردنی حەیدەر، حەیدەر هەوڵیدا کە ئەو جامانەی مەلسا پێشوتر دابووی بەسەریدا جارێکی تر بیدات بەخۆیدا، بەڵام لەبەرئەوەی دەستەکانی بەسترابوون نەیدەتوانی، مەلساویستی یارمەتی بدات، چەکەکەی لە شوێنەکەی خۆی دانا و چوو بۆلای حەیدەر، کاتێک جامانەکەی هەڵبڕی تاکو بیدات بەسەر حەیدەردا حەیدەر فڕکەیەکی کردوو چەکەکەی مەلسای هەڵگرت، مەلسا لە شڵەژاویدا نەیدەزانی چیبکات، چەکەکە لە نێوان هەردوو دەستە بەستراوەکەی حەیدەر بوو، ڕووی کردبووە مەلسا، ئەگەر پەنجەی بە زامندا بهێنایە هەرسی فیشەکەکە بەر مەلسا دەکەوت، لەبەرئەوەی ئەمنیەتی چەکەکە پێشوتر مەلسا کردبویەوە ئەمە کارئاسانی بۆ حەیدەر دەکرد، حەیدەر پێیووت "ئەگەر هاوار بکەیت دەتکوژم، ئەگەر هیچم لەگەڵ نەکەن هیچتان لێناکەم ئەگەر وازم لێبێنن تەنانەت چەکەکەتیشتان دەدەمەوە"، مەلساش پێیووت "کەس هیچت لێناکات"، حەیدەریش وتی "کەواتە بچۆلای ئەنوەرەوە"، مەلسا چووە لای ئەنوەرەوە، حەیدەر پێیووت "درێژ بە"، مەلسا خۆی درێژ کرد، حەیدەر وتی "خۆت بەسەر دەمدا درێژکە"، مەلسا لەسەر دەم خۆی درێژ کرد، حەیدەر وتی "هیچ دەنگ دەرمەکە، چەکەکەت لەبەردەم ئەشکەوتەکە دائەنێم و خۆم ئەگەهێنمە لای گرووپەکەی ئیبراهیم بەدوامدا

مەیەن ". مەلسا هیچ قسەی نەکرد، ماوەیەک بێدەنگی هاتەئاراوە، مەلساش بۆئەوەی بزانێت کە حیدەر ڕۆیشتووە یان نا سەری سوڕاند، حەیدەر هێشتا لە شوێنەکەی خۆی مابوو. مەلسا پێیوابوو کە لەوانەیە دوو دڵ بێت، پێیوابوو لەوانەیە پەشیمان بوبێتەوە، مەلسا پێیووت "چەکەکە بەجێبهێڵە و باسی ئەم مەسەلەیە بۆکەس ناکەم ". حەیدەر پێکەنی و چەند مەترێک لێی هاتە پێشەوە، لەبەرئەوەی حەیدەر بەردەم ئاگرەکەی گرتبوو مەلسا بەتەواوەتی دەموچاوی حەیدەری نەدەبینی، مەلسا ویستی خۆی بجوڵێنێت، بەڵام حەیدەر زووهاتە دەست، هەموو فیشەکەکانی ناو مەخزەنەکەی پێوەنان، ئەنوەر بەبێ ئەوەی لەخەو هەڵسێت بەرفیشەک درابوو. هەردووکیان لەسەردەم درێژ ببوون، خەڵتانی خوێن بوون، چەند فیشەکێک بەر سەری مەلسا کەوتبوو، کەدەموچاوی شێواندبوو. ئەنوەریش فیشەک بەرسەری کەوتبوو.

حەیدەر ماوەیەک تەماشای هەردووکیانی کرد، وادیاربوو دەیویست لەم کارەی باشتر وردبێتەوە، چەکەکەی لە زەوی دانا و چڵیکی ئاگری هەڵگرت، بە تیشکی ئاگرەکەی دەستی تەماشای هەردووکیانی کرد، خوێنەکانیشی بینی، پارچەیەک لە مێشک و دەماغی مەلسا بە دەسکەنێک پرچەوە پەرپبۆوە قەد دیواری ئەشکەوتەکە، حەیدەر لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە، هێشتا باران دەباری، بەراکردن لەوێ دوورکەوتەوە، بە ددانەکانی دەیویست پەتەکەی دەستی بکاتەوە، بەڵام نەیدەتوانی، لەڕێکردن بەردەوام بوو، دەمەوبەیانی کە چاوی بە گڵۆپەکانی شاری ئۆڤاجک کەوت هەستی کرد کە گەیشتۆتە کۆتایی، هەنگاوەکانی بەرەو ئۆڤاجک خێراتر کرد.

٢٧ ڕۆژ بوو برسێتی بەردەوام بوو

## ١٦

هۆکارێکی زۆر هەبوون کە مرۆڤ بە مردن ڕازی بکات، ئیتر نەیاندەتوانی کوزەلە بخۆن و نەشیان دەتوانی بەسکی برسی ئاوی سازگار بخۆنەوە، جەستەیان وشک هەڵگەڕابوو،

تەمەنیان هەر ١٨ ساڵێک بوو، دەموچاویان زەرد هەڵگەڕابوو، چاوە بە قوڵا چۆکانیان و خەتی ژێر چاوەکانیان نیشانەی ئەوەبوو کەلە مردنەوە نزیکن، هیواکانیان وەک ئاوێنەی شکاویان لێهاتبوو.

ساریا کۆمەڵە قسەیەکی لەدەم دەردەچوو کە خۆیشی لێی حاڵی نەدەبوو، ئەو وشانەی کەلەناو حوجرەکانی دەماغیدا بۆ حاڵەتی تەنگانە هەڵیانگرتبوو کە ئێستا دەیویست بەکاریان بهێنێت بێواتا مابونەوە، ئەو بە ئەقڵی خۆی ئەو قسانەی دەکرد کە مەبەستێتی، بەڵام وشەکان کەلەدەمی دەردەچوون جیاواز بوون.

ئاریا هەستی دەکرد کە ئەو شتانەی ڕوبەڕووی بونەتەوە جەستەیان بەرگەی ناگرێت، ئەو بە قەدەری خۆی ڕازی ببوو هەربۆیە هیچی نەدەووت و لە چاوەڕوانیدا بوو، دەیزانی کە ئەم کارەی ئاسانترین هەڵبژاردەیە. لەراستیشدا نەیدەتوانی کەلەمە زیاتر شتێکی تر بکات، کاتێکی زۆری بۆ ڕەخسابوو بۆ بیرکردنەوە، بەڵام لەم چاڵەدا هەر خەیاڵێکی تری بکردایەتەوە ڕوبەڕووی مردنی دەکردەوە.

هەفتەیەک لەمەوبەر پێش ئەوەی ساریا خەوی لێبکەوێت کەوتبووە ناو دەریای خەیاڵەوە و زۆر باوەڕی بە خەیاڵەکانی خۆی هێنابوو، تەنانەت خەویشی بە هیواکانێوەی بینیبوو، سبەی کەچاوی کردبۆوە سەرەڕای ئەوەی ئەم خەیاڵ و خەوەی وەک ئەوە وابوو کە وەک بەستەڵەکیان لێهاتووە، بەڵام هێشتا دەستبەرداری خەیاڵ نەبوو بوو، بەخۆیشی وتبوو کە هەتا مردن دەستبەرداری ئەم خەیاڵانەی نابێت، بەڵام ئێستا توانای خەیاڵ کردنیشی نەمابوو.

هەردووکیان بەخەیاڵی شیرین و تاڵەوە چەندین ڕۆژیان بەسەربردبوو، لەم چەندین ڕۆژەیاندا ئەوەندە بەیەکەوە قسەیان کردبوو هەروەها ئەوەندە بابەتیان وروژاندبوو کە بۆ هەردووکیانیش مایەی گاڵتەجاری بوو، لەوەش دڵنیابوون کەلە ڕۆژانی شێنەییاندا لە ڕوویان نەدەهات ئەم قسانەیان بهێننەوە بیری یەکتر تەنانەت لەوەش دڵنیابوون کە شەرمیش دەکەن بۆکەسانی تری باس بکەن، باسیان لە بابەتێکی زۆر کردبوو، وەک بەرزترین چیا

کامەیە و ساردترین شوێن کوێیە و کام شوێنی زمان هەست بە توونی بیبەر دەکات و دوای مردن قژ و نینۆک درێژ دەبنەوە یان نا هەروەها باسی گوناح و شەڕ و خێر و باسی گوێزی هیندی و باسی چاو پیسی و کێ زیاتر تەڕ دەبێت ئەوەی لەبەر باران ڕادەکات یان ئەوەی وەستاوە و هۆکاری نزگرە و چەند ڕۆژ بەرگەی مانگرتنی مردن ئەگیردرێت هەروەها لەبارەی مژارێکی تری زۆری تریشەوە قسەیان کردبوو، بەڵام لەناو مژارەکانیاندا زیاتر لەبارەی برسێتییەوە هەڵوێستەیان کردبوو، بەهەڵسەنگاندنی چالاکی مانگرتنی زیندانە سیاسێکانەوە گەیشتبوونە ئەو قەناعەتەی کە برسێتی هەر ٦٠ ڕۆژێک تەحەمولی دەکرێت، لەهەمانکاتدا دەیانزانی کە ئەو هەڤاڵانەی مانگرتنیان کردبوو خوێ و شەکراویان خواردبۆوە، هەربۆیە پێیان وابوو کە تەنها ٤٠ ڕۆژ بەرگەی برسێتی دەگرن چونکە ئەمان نە خوێیان هەبوو نە شەکراویش.

ئەوان دڵنیا بوون لەوەی کە هەتا ٤٠ ڕۆژ دەتوانن بژین، بەڵام بیریان لەوە دەکردەوە کە هەتا ئەوکاتە چیبکەن باشە، ئەو ڕۆمانەی دەیانخوێندەوە لەبەرئەوەی مەراقی ئەوەیان بوو کە بزانن لە دەرەنجامدا شاهین چی بەسەر هاتووە دەیانویست تەواوی بکەن، هەربۆیە جارێکی تر لە کۆتایی بەشی سێیەمدا لە بەشی چوارەمەوە دەستیان کردەوە بە خوێندنەوەی و دەیانویست بزانن مەسەلەکان چییان بەسەرهاتووە.

بەشی چوارەم:

**( هەمیشە لەخۆم دەپرسم، ئەو شتە چییە کە مرۆڤ پێرفێکت دەکات، ئەی بۆچی مرۆڤ لە جیاتی ئەوەی خونچەیەکی ژەهراوی ئەچێنێت لە ناخیدا تۆیەکی جوانکاری ناچێنێت بۆئەوەی بتوانێت زیاتر بژێت؟ بۆچی مرۆڤ لەجیاتی دارستانێکی بۆن خۆش و خاوەن جوانترین داری دونیا بێت کەچی ژیانێکی تاریک و نوتەک و کشومات هەڵدەبژێرێت. ناتوانم هۆکاری ئەو لۆژیکە بۆ ئەو کەسانە بدۆزمەوە کە ژیانێکی پڕ لە خەفەت و بەدبەختی هەڵدەبژێرن، ئەو شتەی تریش کە لێی حاڵی نابم ئەوەیە کە ئەوانەی کە ژیانێکی پڕ لە ئازار و پڕ لە نەفرەتی هەڵدەبژێرن، هەرئەوانەش جورئەتی**

ئەوەدەکەن کە ئەشکەنجەی کەسانی تر دەکەن. بۆچی مرۆڤ ئەمە دەکات؟

شامیل هەڵاتبوو. ئەمەش لەکاتێکدا هاتە ئاراوە کە من پێموابوو ڕزگارمان بووە. کاتێک ئێمە وەک ئەوەی وابوو کە بەسەر پردی سیراتولموستەقیمدا پەڕیوینیتەوەو هەموو ئازارو ناڕەحەتێکانمان تێپەڕاند حاڵی بوون لەم کارەی شامیل زەحمەت بوو. کەچی کەمیشمان مابوو بۆ وەرزی بەهار. مەترسێکان کەم ببونەوە. خۆزگە لەم کات و ساتانەدا حاڵی هەڤاڵ قارەمانتان دەبینی. هەرگیز ناتوانم پێناسەی ڕووخساری بکەم. سیما ئەسمەرەکەی ڕەشقەترانی هەڵگەڕابوو. لەوە دەچوو کەلەماوەی چەند خولەکێکدا ئەختیار بوبێت. دەموچاوی وشک ببۆوە. وەک ئەوەوابوو کەلە شوێنەکەی خۆی ڕەق بوبێت. وەک ئەوەی لێهاتبوو کە هەڤاڵ قارەمان ڕۆشتبوو کەسێکی تر شوێنی گرتبێتەوە.

دەبوایە هەموو شتێک سەرلەنوێ دەستی پێبکرایەتەوە. هەموو ئازارەکانمان بە شوێن پێی شامیلدا سڕانەوە. هەموو هەوڵ و تەقەلاکانمان بەزایە چوو. ئێمە ماوەی مانگێک بوو کە زۆربەمان نەخۆش بوو کە تیاماندا هەبوو نەیاندەتوانی ڕێش بکات. بەڵام دەبوایە لە هەندێک شوێندا ڕاشمانبکردایە و هەروەها زۆرجاریش سەرلەنوێ ڕوبەڕووی فەلاکەتی نوێ دەبوینەوە. ڕەوشی هەڤاڵ بەرخودان هیچ باش نەبوو. برینەکانی پشتی ئازاریان دەدا. ئەسپێکان هێرشیان بۆ سەر برینەکانی دەبرد. ئەسێ هەموو لەشی هەڤاڵ بەرخودانی گرتبۆوە و بەتەواوەتی بێ حەوسەڵە ببوو.

کەوتینە ڕێ. جگە لەمەش هیچی ترمان پێنەدەکرا. دوای ئەوەی نیو کاتژمێر ڕێمانکرد. شاهین ڕایگرتین. دەیووت کە ئەمەم پێ قەبوڵ ناکرێت. ئێمە کە ئەوەندە ئازار و مەینەتیمان چێشتووە هەڵاتنی شامیل گەورەترین دوژمنایەتییە هەربۆیە دەبێت هەرگیز لێی خۆشنەبین. شاهین ٣ کەسی دەست نیشانکرد کە بچن بۆئەوەی شامیل بدۆزنەوە و بهێننەوە. سەرەتا قارەمان ئەمەی قەبوڵ نەکرد. بەڵام کاتێک لەگەڵ شاهین ڕوبەڕووی یەک بونەوە قارەمان ناچارمان قەبوڵی بکات.

٣ گەریلا کەوتنە ڕێ. هێشتا چەند هەنگاوێکیان هەڵنەهێنابوو قارەمان

ئیشاراتی بۆکردم کە منیش لەگەڵیاندا بڕۆم. کاتێک لە دڵی خۆمدا وتم ئیتر کاتی پشودانمانە لەناکاو ئەم بەڕێکەوتنەم هاتەئاراوە، ڕامکرد و خۆم گەیاندە ٣ هەڤاڵەکەمان. بەدوای شوێن پێی شامیلەوە ڕێمان دەکرد، کەشوهەوا زۆر سارد بوو. دەست و قاچەکانمان لەگۆ کەوتبوون، ڕەشەبا سەرماکەش وەک گوێزان بە دەموچاوماندا تیغی دەکرد. هەڤاڵ شەڤگەرمان لەدوای دوو کاتژمێر ڕێکردنماندا ئیتر پەکی کەوت. هەموومان ئەترساین کە بەهۆی سەرماوە ڕەق ببینەوە. ئەمەش بەم کەشوهەوایە شتێکی چاوەڕوان کراوبوو. ئەگەر کەمێک جوڵەمان کەمببوایەتەوە لەوانەبوو خوێنمان ببەستایە. لەم حاڵەتانەدا مرۆڤ بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەگەر بەم شێوەیە بمرێت دەبێت لەدوای خۆی چۆن باسی بکەن و چی پێبڵێن. بێگومان دەوترا ٤ گەریلا کەوتنە دوای خانینێک. بەڵام لە ڕێگە ڕەق بوونەوە. باشە ئەمە کارێکی باش بوو. ئەی ئەمەی دەهێنا؟ مەخابن وەڵامی ئەم پرسیارانە ئێستا هیچ واتایەکی نەمابوو.

ئەگەر عینادیمان نەبوایە کە هاوکاری جەستەمانی دەکرد لەوانەبوو سەرما بمانیکوشتایە. ئەمەشمان دەزانی، ئایا جارێکی تر دەبوینە خاوەن ئەو شانسەی کە بەناو دارستانەکان و سەوزایەکاندا بگەڕێین؟ ئەمەشمان نەدەزانی، ئەی ئایا جارێکی تر ئاوە سازگارەکانی زێ و چەم و کانیاوەکانمان دەخواردەوە؟ ئەمەشمان نەدەزانی، ئەی ئایا جارێکی تر ئاوابوون و هەڵاتنی خۆرمان دەبینی لەگەڵ مانگەشەو و ئەستێرەکانی ئاسماندا؟ ئەمەشمان نەدەزانی. ئەوەی ڕاستی بێت حەوسەڵەی هیچ بیرکردنەوەیەکمان نەبوو تەنها ڕێمان دەکرد.

شەڤگەر نەیدەتوانی ڕێ بکات. چەند جارێک کەوت و هەڵسایەوە، لێی نزیک بومەوە و قوڵیم گرت. ویستم چەند شتێکی خۆش بچرپێنمە پەناگوێچکێوەی. بەڵام نەمتوانی. لەبەرئەوەی منیش پێویستیم بە مۆڕاڵ بوو لەدڵی خۆمدا دەمووت شامیل هەڵاتووە با هەڵبێت بۆچی ئێمە بەدوایدا دەڕۆین. لەهەمانکاتدا نەمدەتوانی ئەم قسانەی ناخم بەکەسیان بڵێم. بە شەڤگەرم وت خۆڕاگر بە. بەڵام دەنگم لەبەرئەوەی دەرنەدەچوو ئەم

قسەیەمی بە جدی وەرنەگرت، ئەوەندە لەم شێوازی قسەکردنەم ئاشکرا ببوو کە هەروا دابووم بەبادا تەنانەت قەناعەتم بە قسەی خۆیشم نەبوو.

کاتێک شەڤگەر بە دەنگێکی گریانییەوە وتی من ئەمرم ئیتر ئاگام لەخۆم نەما، هەتا لە توانامدابوو هاوارمکرد. شەڤگەر وایدەزانی کە بەزەیم پێدا دێتەوە. شەڤگەر هەستایە سەرپێ. پێم وت مردن نییە، ئەگەر خۆت شلبکەیت بێگومان ئەمریت، ئەم هاوارکردنەم ورەی بە خۆیشم بەخشی، دەستمان کردەوە بە ڕێکردن، ڕێگەیەک هاتە پێشمان کە شوێن پێی لێبوو، ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو کە ئەم ڕێگەیە بەرەو شامیلمان دەبات، شوێنەکەی ئێمە بەرەو دارستان دەچوو، بارەگە سەربازێکەی ئاکراک چەند کاتژمێرێک لێمانەوە دوور بوو. لەوانەبوو شامیل بیویستبێت بچێت بۆ ئەوێ، هەمووومان بەو شێوەیە بیرمان دەکردەوە، بەڵام کەسیشمان ئەمەی نەدەهێنایە زمان، هەنگاوەکانمان خێراتر کرد، دەبوایە پێش ئەوەی شامیل لە بارەگا سەربازێکە نزیک ببێتەوە ئێمە بمانگرتایەتەوە. دوای ئەوەی چەند خولەکێک کەوتینە ناو دارستانەکە لەناکاو شامیلمان بینی، شامیل باوەشێ داری کۆکردبۆوە و لەبەردەم خۆی دانابوو خۆیشی بەدیارێوەی دانیشتبوو، پشتی لە ئێمەبوو، سەرەڕای ئەوەی پێیەکانمان کە دەکەوتە سەر بەفر دەنگیان دەردەکرد، بەڵام ئەو هەر ئاوڕی نەدایەوە، لێی نزیک بوینەوە، ئەژنۆکانی بە سنگێوەی نابوو، بەهەردوو دەستیشی قاچەکانی گرتبوو، دارەکانی خستبووە سەریەک، بەڵام ئاگری تێبەرنەدابوون، شانی دادابوو بە دارە کەڵەکەبۆکانەوە، هیچ نەدەجوڵایەوە.

بانگی شامیلمان کرد، بەڵام وەڵامی نەدایەوە، چەمامەوە و تەماشام کرد چاوەکانی داخرابوون، شانیمگرت و ڕاموەشاند، بەڵام هیچ هەڵوێستێکی نەبوو، ویستم بەرزی بکەمەوە، بەڵام نەمتوانی، جەستەی زۆر ڕەق بوو، دوایش وەک لقەدارێک بەلادا هات، شەڤگەر وتی "مردووە". هەمووومان تاسابووین، کەسمان نەماندەویست باوەڕ بەم وشەی مردووە بکەین، شامیل مردبوو، ڕەق ببۆوە و ئاگری نەکردبۆوە، دەموچاوی مۆر هەڵگەڕابوو، ڕیش و سمێڵی شەختەی گرتبوو، نەمتوانی لەوە زیاتر تەماشای بکەم،

ئەمە ترسناکترین شێوەی مردن بوو، بێگومان هەموو ڕوویەکی خیانەت تراژیدیا بوو، بەڵام تەحەمولی ئەم شیوازەیەمان نەدەکرد، لەدڵی خۆمدا نەشمدەتوانی پێشی بڵێم خیانەتی، زاتەن شتێک نییە بەناوی خیانەتی موتڵەق، لە ڕەوشێکدا دەژیام کە نەمدەتوانی بگریم و نەشمدەتوانی توڕە ببم، لەم حاڵەتەدا من سەرزەنشتی خیانەتم نەدەکرد چونکە خودی مردن بەسەر خیانەتەوە خۆی زاڵ کردبوو، هەموو شتێک وەک ئەوە نەبوو کە بینیبومان، ئەوە بە بەرچاومانەوە بوو کە شامیل زۆر سەرمای بووە، بۆئەوەی ڕەق نەبێتەوە ویستویەتی ئاگر بکاتەوە، بەڵام لەوە دەچێت کە نەیتوانی بێت، دیمەنێکی زۆر بە ئازار بوو، لەئاکامدا بەدەلی خیانەت گرانە و سرووشت سزاکەی دابوو، ئەوەی ڕێگەی خۆی لێتێک بچێت کۆتاییەکەی هەرەوای لێدێت، پێویستە مرۆڤ بەسەر ئەو ڕێگەیەوە بڕوات کەبە ڕاستی دەزانێت و باوەڕی پێیەتی، باوەڕم بەو هۆکارە نەدەکرد کە ئەمی ڕوبەڕووی ئەو مەرگە کردبۆوە، کۆمەڵە پرسیارێک لە ئاستمدا خۆیان قیتدەکردەوە، لەم حاڵەتی بێچارەییەدا خەریک بوو شێت ببم، دەبوایە بە زووترین کات خۆمان لەم دیمەنە جەرگ بڕە دوور بکردایەتەوە، زاتەن ئەگەر زیاتر چاوەڕێمان بکردایە هەمووومان وەک شامیلمان لێدەهات، ویستمان بینێژین هەربۆیە ماوەیەک بەسەر بەفرەکەدا ڕامان کێشا، هێنامانە ژێر بنی دارێکی ناو قەدقەوی، بڕمان کردەوە کە لێرە بینێژین، هەوڵماندا کەبە قامەکانمان چاڵ هەڵبکۆڵین، بەڵام ئەمە کارێکی مەحاڵ بوو، دەستمان لەگۆ کەوتبوو، هەرگیز ئەم کارەمان پێنەدەکرا، هەربۆیە لەم کارە پاشگەز بوینەوە، بە هەڤاڵانم وت "دەی بابگەڕێینەوە"، شەڤگەریش وتی "ئێمە نایەین! "منیش پێم وت "چۆن دەتوانیت شتێکی وابڵێیت شێتی تۆ؟! "ئەویش وتی "چارەی ترمان نییە ئیتر بەرگەناگرین"، لەم سەرما و سەرچیا و برسێتییە و نزیک بونەوە لە مردن دەکرا چییان پێبوترایە؟ ئەی باشە بۆچی ئێستا بەرگەی ناگرن؟ لە شەڤگەرم پرسی "بۆچی؟ "ئەویش وتی "نامەوێت بگەڕێمەوە"، دەنگی تەتەڵەی دەکرد، لەوانەبوو ئەم قسانەی لەبێ چارەییدا دەکرد، کەمی مابوو بەزەییم شوێنی توڕەبوونم بگرێتەوە، تەماشای هەڤاڵ سەعیدم کرد،

پێم وت "تۆش ئەڕۆیت؟ "ئەویش وتی "منیش ئەڕۆم ". هەمان پرسیارم لە هەڤاڵ شیرانیش کرد. هەمان شتی هێنایە زمان. دیاربوو لە نێوان خۆیان قسەیان کردبوو. ڕێککەوتبوون. بەتەنیا مابومەوە. ئەگەر یەکێکیان ئەم قسەیەی بکردایە ڕێگە چارەیەکم هەر ئەدۆزییەوە. بەڵام ئێستا هەرسێکیان لەسەریەک نامانج ڕێککەوتوون هەربۆیە نەمدەزانی کەچی بکەم.

پێیانم وت "ئێمە لەبەر خائینێک گەیشتوینەتە ئێرە. ئەگەر ئێمەش وەک ئەو بکەین کۆتایەکەشمان هەروەک ئەو دەبێت ". کە گوێم لە دەنگی خۆم دەبوو شەرمم لەخۆم کرد بەشێوەیەک قسەم دەکرد کە لێیان ئەپاڕامەوە. خۆم کۆکردەوە و جارێکی تر کەوتمە قسەکردن و پێیانم وتەوە "ئەگەر خۆتان ڕادەستی دوژمن بکەن ئەمە مانای وایە هەموو هەڤاڵەکانتان لەناو ئەچن. چەندین ڕۆژە بەیەکەوە ئازار و زەحمەتی ئەچێژین. ئێوەش ئێستا ئازارێکی تر زیاد مەکەن. ئەرێ ئێوە هیچ ویژدانتان نییە. هەر هیچ نەبێت بیر لە هەڤاڵ بەرخودان بکەنەوە. هەڤاڵانمان هەن کە نەخۆشن و تیاشماندا هەیە کە ناتوانن ڕێ بکەن. ئەرێ ئێوە ئەقڵ و ویژدان و مەرحەمەتی خۆتان لەدەست داوە؟! "شەڤگەر وتی "تۆش لە ئێمە حاڵی بە. خۆمان ڕادەستی دوژمن ناکەین. مەراق مەکە. ئەگەر بشمرین خۆمان ڕادەستی دوژمن ناکەین. بەڵام لەمە زیاترمان پێناکرێت ". منیش پێم وت "کەواتە خیانەت و بێ شەرەفی قەبوڵ دەکەن؟ "شەڤگەر وتی "ڕاستە هەرچییەک بڵێیت ڕاستە. بەڵام ئیتر تەحەمولمان نەماوە و پێمان ناکرێت ". دەنگی شەڤگەر زۆر ڕەق بوو. هەتا ئەوان بەو شێوەیە قسەیان بکردایە منیش ئەوەی بە دەممدا دەهات پێیانم دەووت. پێیانم وت "حەق وایە بەیەک فیشەک بکوژرێن ". وەڵامی ئەم قسەیەمیان نەدایەوە. سەعید بە شێوەیەک قسەی دەکرد کە زۆر کپ بوو وتی "باسی ئێمە بۆ هەڤاڵ قارەمان بکە. ئەو لە ڕەوشمان حاڵی دەبێت ". ئەم قسانەیانم وەک گاڵتە دەهاتە بەرچاو. لەداخدا هەموو لەشم گڕی گرتبوو. پێم وت "مەڵێ هەڤاڵ تۆ خائینیت ". سەعید هیچی نەووت. هەتا من هاوارم بەسەریاندا بکردایە ئەوان بێدەنگتر دەبوون. هەرچییەکم پێیان بوتایە قەبوڵیان دەکرد. سەری خۆیان شۆڕدەکرد.

دوای ئەوەی ماوەیەک هیچم پێ نەما کە پێیان بڵێم دەمویست تفیان لێبکەم و پەلاماریان بدەم، بەڵام ئەو توانایەم نەبوو، بێ حەوسەڵە بووم، تەنانەت بیرمکردەوە کە لەوێ بیانکوژم، بەڵێ کوشتن، دەمویست هەرسێکیان لەوێ بکوژم، لەراستیدا توانای ئەمەشم نەبوو، بەڵام بۆئەوەی هەوڵ بدەم تاکو پەشیمانیان بکەمەوە بەدەم پاڕانەوە پێیانم وت "بۆخاتری خوا مەڕۆن، من دەزانم دەکەونە دەستی دوژمن، دەبنە هۆکاری شەهید بوونی ۹۰ هەڤاڵ ئەم کارە مەکەن "، هەرچییەکم کرد نەمتوانی ڕایان بگۆڕم، وادیار کە خیانەت کەوتەناو دڵ و دەروونی مرۆڤەوە دەرکردنی مەحاڵە، شەڤگەر وتی "چەکەکانمان لەکەناری ڕێگەکەی پێشمان بەجێدەهێڵین دەتوانی لەوێ هەڵیانگریت "، هەرسێکیان کەوتنە ڕێ، هەتا ماوەیەکیش پشتیان لەمن نەکرد، دیاربوو لە من ترسابوون، ئەگەر پشتیشیان لە من بکردایە تەقەم لێیان نەدەکرد، من ئەو توانایەم نەبوو، بەتەواوەتی لەیەک دوور کەوتینەوە، نەمدەتوانی بچم چەکەکان هەڵگرمەوە، دەمزانی ئەگەر چەکەکانیشم بهێنایەتەوە نەمدەتوانی هەڵیان بگرم، دەبوایە بە خێرایی بڕۆشتمایە و ئەم هەواڵەم بگەهێنایەتە هەڤاڵ قارەمان، لەو شوێنەی لێی گیرسابوینەوە دەبوایە بەجێمان بهێشتایە، ئێمە ویستمان ڕێگری لەیەک خائین بکەین، بەڵام ئێستا ببوون بە چوار، بەخێرایی کەوتمە ڕێ، هەستم بە قاچەکانم نەدەکرد هەردووکیان لە گۆ کەوتبوون، پەنجەکانم هەستیان بەهیچ شتێک نەدەکرد، چەکەکەم بەشانمەوە ڕەق ببۆوە، ئەگەر ڕوبەڕووی دوژمنیش بهاتمایەتەوە نەمدەتوانی چەکەکەم لەشان دابگرم، لەئاکامدا لەوانەبوو پێش ئەوەی بگەمەوەلای قارەمانیش ڕەق ببومایەتەوە، ئەمە یەکەمجار بوو کە بەم شێوەیە ڕوبەڕووی مەرگ ببمەوە، لەدڵی خۆمدا نەترسام لەوەی کە نەک چارەنوسم وەک چارەنوسی شامیلی لێبێت، نەمدەتوانی زاڵ بم بەسەر لەش لەرزینەکەمدا، کە هەندێکجار ئەژنۆکانم لە کاردەکەوتن و سمم دەدا وامهەست دەکرد کە کۆتایم هاتووە، خەریک بوو شێت ببم، شامیل مرد، سیانەکەی تریشمان هەڵاتن، چۆن دەمتوانی ئەم هەواڵە بەدەمە قارەمان، بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەوکاتەی ئەم هەواڵەم پێگەیاندن هەڤالان چۆن

هەڵوێستێک دەنوێنن، لەوە دڵنیابووم کە شاهین چەکەکەی هەڵدەگرت و بەدوایاندا دەچوو، قارەمانیش وەک ئەوەی کە هەر هیچ نەبوبێت پێدەکەنێت، بەڵام لەوانەیە من ڕەخنە بکەن.

باشە تۆ بڵێی بمتوانایە لەهەمبەریان ببومایە بە ڕێگر؟ تەنها دەزویەکی باریک هەیە لە نێوان ڕێگربکردن و خواستەکەی من، لەهەردوکیاندا ژیام، نسلوبە پاڕانەوەکەم ئەبێ هێزی بەوان بەخشبێت؟ ئەمە نەدەبوو مانای کە ئەم ژیانە چیتر تەحەمول ناکرێت؟ بەدەم ئەم بیرکردنانەوەم جوڵانەوەم کەمی کردبۆوە، واملێهات کە ئیتر نەمدەتوانی هەنگاو بنێم، هەرکاتێک مەسەلەیەکی ناخۆش پەردەی سەر دڵی گرتبێت خەوم دەهات، هەربۆیە ئێستاش دەمویست خۆم درێژ بکەم و بخەوم، لەهەمانکاتیشدا دەمزانی کە ئەمە بەمانای مردن دەبێت، من لەوە دەترسام کەبەسەر قسەی خۆمدا زاڵ نەبم، هەرکاتێک لە ڕێگە هەستم بە خەو بکردایە شامیلم دەهێنایەوە بەرچاوی خۆم، ئەمەش دەبووە مایەی نەهێشتنی خەوم و زیاتر توڕەبونم و وایلێدەکردم کە بیر لە شەهیدبوونی ٩٠ هەڤاڵ بکەمەوە و واملێدەهات کە تین بەخۆم بدەم تاکو بەتواناتر بم، ئەو هۆکارانە وەک قامچیان لێهاتبوو هەمیشە خۆیان ڕادەوەشان و منیان دەترسان و دڵم خورپەی دەکرد، بیرکردنەوە لەوەی کە کاتێک ئەم هەواڵە نەگەهێنمە لای هەڤاڵان هەڵوێستەکانیان کەلە ئەقڵمدا نەخش دەکرد سەرقاڵی دەکردم و هۆکار بوو کە هەمیشە ناگام لەخۆم بێت، نەمدەویست کەلەمە زیاتر هەڤاڵ قارەمان خەفەت بخوات، لەو ڕۆژەوەی یەکەم کەمپمان ئاشکرا ببوو تاکو ئێستا زەحمەت و ناڕەحەتییەکی زۆری چێژابوو، سەرلەنوێ خۆی لەناو دەریای بێچارەیدا دۆزیبۆوە، بەرپرسیارێتی شەکەتی کردبوو، ئێستا قسە خۆشەکان و گاڵتەکانی هەڤاڵ قارەمان وەک پەڵە هەورێکی کۆچەریان لێهاتبوو لە چاوان ونبوون، هەندێکجار دوژمنایەتی کارێکی سەختە، هەندێکجاریش مرۆڤ دەخاتە ناو گێژاوی خۆیەوە، کاتێک من بیرم لەخۆم و لە هەڵاتۆکان و قارەمان دەکردەوە لەهەمانکاتدا ڕێگەیەکی زۆرم بڕی بوو، خەیاڵکردنەوەکانم ئەگەر کەمیش بووبێت منیان لە دژواری ڕێکردنەکەم

به دوور گرتبوو، بەڵام هەرکاتێکیش تەماشایەکی خۆمم دەکرد بەخۆمم دەووت تەواو ئەمجارە دەمرم. قاچەکانم گوێیان بۆ قسەکانم نەدەگرت، وەکو سەرخۆش بەملاوئەولادا دەکەوتم، پێموابوو تەنها جەستەم نا بەڵکو زەهنیشم ڕچیوە، وامهەست دەکرد کە مردن لە شتێکی وادەچێت، لە شوێنەکەی خۆم وەک نەوەی بزماریان لێدابێتم چەقیو بووم. گوێم بۆ چواردەوری خۆم ڕاگرت، دەمویست گوێم لە دەنگ بێت، جگە لە گفەگفی ڕەشەبا هیچ دەنگێکی تر نەدەهات، لە چواردەورم نە تیشکێک نە دەنگێکیش هیچ بونەوەرێکم لێوە دیار نەبوو، لەهەمانکاتدا نەمدەتوانی بگریم و فریاد و فوغانیش بکەم، ئەگەر بشمویستایە نەمدەتوانی بگریم. هەرچۆنێک بوو هیچ سودێکیشی نەبوو، کاتی خۆی گوێم لە پەندێک ببوو، دەوترا ئازار مرۆڤ کامڵ دەکات، لەم کاتەدا لەم پەندە توڕە ببووم. ئازار خەڵکی کامڵ ناکات بەڵکو شێتوهاری دەکات، ئەم پرسیارەم دەکرد بۆچی دەبێت هەر ئێمە کامڵ ببین؟ ئایا ئەوانەی کە پێویستیان بە کامڵ بوونە تەنها گەلی کوردە؟ ئەگەر بەم ئازارانەوە کامڵ دەبم بابەگیان من کامڵ بوونم ناوێت، دوایش دەنگێک لە ناخمدا پێیووتم تۆ هەڵەیت، ئەگەر هەستی ئازار نەبوایە و ئەگەر ئەو هەموو ئازارانەی لەلام درووست ببوون منیان نەهێنایەتە ناو ئەم شۆڕشەوە لەوانەبوو منیش لەگەڵ ئەو ٣ کەسەی تردا ڕێگەی خیانەتم بگرتایەتەبەر، خیانەت نەکردنم بێشک لە ئازار هۆکارێکی سەرەکیەتی.

ئێستا بیرکردنەوە لەلای من ببوو بە کارێکی زەحمەت، خەیاڵ و پرسیار و وەڵامەکانیش ماندویانی کردبووم، هەتا بیرم بکردایەتەوە ئازاریشم زیادیان دەکرد. هەموو شتێک بۆمن ببوو بە ئازار، زۆرم لەخۆمدەکرد و کەوتمەوە ڕێکردن، خۆیشم نەمزانی کە چۆن توانیم لەناکاو گەیشتمەوە لای هەڤاڵان، ئیتر دەمتوانی بمرم و دەشمتوانی بە ئارەزووی خۆم بگریم. قارەمان شۆک ببوو، کە منی بینی پێشوازییەکی گەرمی لێکردم، لەبەرئەوەی دەیزانی کە خەریکە ڕەق دەبمەوە خۆی پێمەوە سەرقاڵ کرد، تاماوەی کاتژمێرێک هیچم پێنەوترا، بە بەفر مەساجیان بۆ قاچەکانم کرد و خواردنیان دامێ، چاکەت و جامانەکەی خۆیان بەسەرمدا دادابوو، جارێکی تر لێرەوە هەموو

شتێک کۆتایی پێدەهات یان سەرلەنوێ دەستی پێدەکردەوە.

کەهۆشم هاتەوە هەستم کرد کەلە گوندێکم، ڕووداوەکانم بۆ هەڤاڵان گێڕایەوە. زۆر بە وردەکراییەوە بەبێ ئەوەی دێڕێک بپەڕێنم هەموویانم بۆباسکرد. لەناکاو بیستم کە کەسێکی تریش لەلامەوە درێژ بووە. شاهین بەدیار سەرێوەی دانیشتبوو. دیاربوو شاهین غەمبار بوو. پرسیارم کرد کە ئەوە کێیە درێژ بووە، پێیان وتم کە هەڤاڵ بەرخودانە. لەهۆشخۆی چوبوو. تاکو ئەم کاتەش کەس نەیدەزانی کە نەخۆشێکەی چییە. ئەوەی کە دەمانزانی ئەوەبوو کە ئەسپێکان برینیان لە هەموو گیانیدا کردۆتەوە. ئێمە تەخمینی ئەوەمان نەدەکرد کە ئەم مەسەلەیە ئەوەندە گەشە بکات. کەتەماشای جەستەیمان کرد بەراستی دیمەنێکی دڵتەزێن بوو. هەرگیز بیرم لەوە نەکردبۆوە کەلەلای مرۆڤێکەوە ئەوەندە دڵم خورپە بکات. ئەسپێکان لەناو برینەکانیدا دەسوڕانەوە. هەڤاڵ قارەمان داوای کرد کە ئاوی بۆ بهێنن، کەئاویان هێنا هەڤاڵ قارەمان بەدەستی خۆی بەرخودانی شۆری. بەشێکی زۆری ئەسپێکان پاککرانەوە. بەڵام لەشی پەڵما. برینەکانمان پاککردەوە و بەستمان. کەوتینە چاوەڕوانییەوە. دوای دوو کاتژمێر هۆشی هاتەوە سەرخۆی. بەسەرپێوە بوو. خۆیشی باوەڕی نەدەکرد کەلە هۆشی خۆی چووە.

دوای ئەوەی پێداویستێکان ئامادەکران جارێکی تر کەوتینە ڕێ. بەکەناری زێی چەت سوڕاینەوە و بە شوێن شوێنێکی گونجاو دەگەڕاین. بەبێ شارەزایانە ڕێگەمان دەکرد. بەدرێژایی ڕێکردن ئەوەی نەیدەتوانی ڕێبکات و ناڕەحەتی دەچێژا ئەمجارەیان بەخودان نەبوو بەڵکو هەڤاڵان چیا و ئاگری بوون. بەرخودان دەیووت خۆزگە ئەوانیشمان بشۆردایە. ئێمە دەمانزانی کە ئەوانیش بەهۆی برینەکانی ئەسپێکان ناتوانن ڕێبکەن. کاتێک هەمووومان بە هەڤاڵ چیا و ئاگرییەوە سەرقاڵ بووین ئەمجارەیان هەڤاڵ شێخ مووس کەوتە هاوارکردن. وامانلێهاتبوو کە ئەگەر ڕوبەڕووی ڕووداوی کتوپڕ ببویناتەوە لەلای کەسمان مایەی سەرسوڕمان نەمابوو. شێخ مووس خۆی لەناو بەفرەکەدا درێژکردبوو ئەنوزایەوە. قارەمان و

شاهین بۆ هێورکردنەوەی شێخ مووس هەموو هەوڵێکیاندا. شێخ مووس لەبەرخۆیەوە وڕێنەی دەکرد، جارناجارێکیش دەیووت گوایە کەسانێک هەن کەلەبارەی ئەمەوە قسە دەکەن. لەناکاو شێخ مووس نقەی نەما، کەوتەسەر ئەژنۆ و بەخەندەیەکی گریاناوییەوە تەماشای قارەمانی دەکرد، تێڕوانینەکانی جەرگمانی بڕی بوو، هەمووومان هەستمان بە شێت بوونی شێخ مووس دەکرد، قارەمان لێی پرسی چیبووە؟ ئەویش وتی "هەمووتان لە پڕێکدا بوون بە سیخوڕ! "قارەمان نەیدەزانی کەچی پێبڵێت، قارەمانی بەناچاری پێیووت "سیخوڕی چی؟ "شێخ مووس پێکەنی، کاتێک قۆڵیمان گرت بۆئەوەی هەڵیسێنینەوە کەوتە هاوارکردن و وتی "ناتوانن هەڵم خەڵەتێنن هەمووتان بوون بە سیخوڕ". هەموو کەسێک ڕێزی شێخ مووسی دەگرت و خۆشەویست بوو، بەڵام ئێستا قسەی هەلەقوبەلەق دەکرد، یەکەمجار بوو کەلەناو گەریلادا ڕووبەڕووی شتیوا ببینەوە، لەراستیدا نەماندەزانی کەچی بکەین، نەماندەتوانی لەوێ بەتەنیا جێیبهێڵین. قۆڵێمان گرت و بەزۆر ڕێمان پێکرد، لە ڕێگە لایدەدا و بە چەپ و ڕاستدا ڕایدەکرد و هەر لە خۆیەوە هاواری دەکرد و هەندێک جاریش بەسەر دەم لەسەر بەفرەکە خۆی درێژ دەکرد و وەکو منداڵیش دەگریا، کەسەرمای دەبوو دەستەکانی نیشان قارەمان دەدا و دەیویست پێی بڵێت ئەها چیم بەسەر هاتووە و بەزەییتان پێمدابێتەوە، ئێمە لە ئاستی ئەم دیمەنە جەرگمان پارە، پارە ببوو، قارەمان باوەشی پێدا دەکرد و نێوچەوانی ماچدەکرد و دەستەکانی دەوشی و شێخ مووسیش بەمە هێور دەبۆوە، هەندێکجار دەبوو بە هێرشبەر و هەندێکجاریش بە منداڵ و بە هەستیار و جارناجارێک دەگریا و هەندێکجاریش پێدەکەنی، بەڵام لەهەر جموجۆڵ و ڕەفتارێکیدا وەک ئەوە وابوو کە خەنجەر لەناو دڵی ئێمە بدات.

هەمووومان چیا و ئاگریمان لەبیر کردبوو بە شێخ مووسەوە سەرقاڵ ببووین، لەناکاو گوێمان لە ئاگری بوو هەرچی جوێنی ناشرین هەیە هێنایە زمان، ئێمە لەناو گەریلادا بە گوێبیستنی جوێن ڕانەهاتبووین، دیاربوو زۆر تینی بۆهاتبوو بۆیە بەو دەنگە بەرزە جوێنی دەدا کە هەمووومان گوێمان

لێبێت، تەماشای ئاگرینمان کرد، قارەمان پێیووت "چیبووە؟ "ئاگریش وتی "هاروون پێم دەڵێت با هەڵبێین ". ئێمە دەمانزانی کە هاروون سیخوڕە، لەنامەکەی بارەگای گشتی کە بۆمانیان ناردبوو پێیان وتوبوین کە نەهێڵین هیچ کەس ئەمە بزانێت، لێکۆڵینەوە لەگەڵ هاروون لەبارەگای گشتی ئەنجام دەدرا، بەڵام ئێستا لەبارودۆخێکی ئاوادا ئەم تەکلیفەی هاروون هەرکێیەک بیکردایە سزاکەی مردن بوو، دیاربوو سەرەڕای ئەم هەموو ئازارانە نەیویستبوو دەستبەرداری سیخوڕی ببێت، قارەمان چوو بۆلای هاروون و دەستی گرت و بردیە پەنایەکەوە و لەهەمانکاتیشدا چەکەکەی لێسەند، لەناو هەموو هەڤاڵاندا قارەمان وتی "هەمووتان گوێ بگرن ". هەموومان وەک ماستی مەیومان لێهات، پاشان وتی "هاروون وەک سیخوڕ هاتۆتە ناو ڕیزەکانمانەوە هەروەها لەگەڵ کەسێکی تردا بڕیاریانداوە کە وەک سیخوڕ ببن بە گەریلا، ئەویتریان دانی بەم ڕاستییە هێناوە، ئێمە چاوەڕێی ئەوەبووین کە هاروون دان بەم ڕاستییە بهێنێت و پێمان بڵێت دەوڵەت منیان هەڵخەڵەتاند، ئێمە ئەم زانیاریەمان بە ئێوە و بە خۆیشی نەووت کە دەزانین سیخوڕە، بەڵام هاروون دەستبەرداری خواست و ئامانجەکەی خۆی نەبووە و لە دژوارترین ڕەوشیشدا ویستویەتی خیانەتی تر بهێنێتە ئاراوە، بەڕای ئێوە چی لێبکەین؟ "لە پێش هەموو کەسێکەوە ئاگری دەستی هەڵبڕی و وتی "بابیکوژین ". قارەمانیش وتی "پێشنیاری تری جیاواز هەیە؟ "کەس قسەی نەکرد، هەموومان بەسەرپێوە بوین، بەرخودان پشتی بە بەردێکەوە دادابوو دانیشتبوو، قارەمان لەناو هەموو گەریلاکاندا شاهینی دیاریکرد و پرسیاری بیروبۆچونی ئەوی کرد، شاهینیش وتی "کەیفی خۆتە ". قارەمان ئەم پێشنیارەی ئاگری خستە دەنگدانەوە کە کێ بە پێشنیارەکەی ئاگری قایلە، هەموومان دەستمان بەرز کردەوە، ئەوەی کە دەستی بەرز نەکردەوە تەنها بەرخودان بوو.

سەرەڕای ئەوەی زۆرینەی دەنگ لایەنگری سزای کوشتنی هاروون بوو، بەڵام قارەمان پەلەی نەکرد، قارەمان وتی "چەکمان کرد، ناتوانێت زەرەر بەکەس بگەهێنێت، ئێستا هەمووتان دەزانن کە سیخوڕە، بەدرێژایی

ڕێگە ئەگەر کێشە بهێنێتە ئاراوە بڕیارەکە جێبەجێ دەکەین ". هەرچەندە ئەم قسانەی قارەمان بە دڵی زۆربەشمان نەبوو، بەڵام کەس هیچی نەووت، خۆمان ئامادەکرد بۆ سەرلەنوێ کەوتنەوە ڕێ. بەڵام هێشتا بەرخودان هەڵنەسابوو پشتی بە بەردەکەوە بوو، بانگیان کرد، بەڵام وەڵامی نەدایەوە، ئەوکاتە شامیلم کەوتەوە بەرچاو. قارەمان لێی نزیک بۆوە و پێیووت "هەڵسە بەڕێدەکەوین ". بەڵام بەرخودان وەڵامی نەدایەوە. قارەمان چەمایەوە و چەناگەی هەڵبڕی، چاوەکانی نوقابوون. چەند جارێکی تر بانگی کردەوە. بەڵام ئەمجارەشیان بەرخودان وەڵامی نەدایەوە. سەری نابەسنگێوەی، ئێمە لەناو ئەندێشەدا لەوانمان دەڕوانی. هەڤاڵ بەرچەم لە نزیک بەرخودانەوە بوو پەنجەی خۆی خستە سەرملی بەرخودان، ئەمجارەیان لەوە نەدەچوو کە بورابێتەوە، بەرچەم وتی شەهید بووە.

کەسمان باوەڕمان بەمە نەکرد، کەمێک لەمەوبەر بەخودان پێدەکەنی و گەمەی دەکرد و قسەی دەکرد، جارێکی تر سەری خۆی خستەوە سەر دڵی، بەرخودان شەهید ببوو، ئەمەمایەی قەبوڵکردن و باوەڕبوون نەبوو، پالۆ و شاهینیش کۆنترۆڵیان کرد، کەوتبوونە ناو کەشوهەوای ماتەمینییەوە، شاهین تەماشایەکی چیا و ئاگری کرد، دوایش قارەمانی بردە پەنایەکەوە، دوای ئەوەی چەند فسکە فسکێکیان کرد گەڕانەوە، بەرخودانمان هەڵگرت و لەخوارووی ڕێگەکە لە بەفر چاڵێکمان درووست کرد و ناشتمان، بڕیاریشمان وابوو کە جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ ئێرە و بە خاکی بسپێرین بێگومان ئەگەر لە ژیاندا بوینایە.

دڵم ترسێکی تێدابوو، ئایا چی دەهاتە ئاراوە؟ لەوەدەچوو وەڵامی ئەم پرسیارە شاهین بیزانێت و لێمانی دەشاردەوە، مەراق شێتی کردبووم، خۆم پێڕانەگیرا و لە شاهین نزیک بومەوە، لێم پرسی مەسەلە چییە؟ سەرەتا نەیویست هیچم پێبڵێ، دوایش تەماشایەکی چواردەوری خۆی کرد و بە چرپەیەک پێیووتم "هیوادارم چیا و ئاگریشمان شەهید نەبن! "لەدوای ئەم قسەیەی شاهین تەماشایەکی هەردوکیانم کرد، منیش پێم وت "بۆچی؟ "دەنگم گریاناوی بوو، شاهینیش وتی "لەوانەیە یەکەمجارمان بێت شتیوا

ببینین، بەڵام پێشوتر ئەم حاڵەتەم بیستبوو، ئەسپێ و برسێتی و ماندووبوون توشی نەخۆشییەکت دەکات کە وەک نەخۆشی سورێژە و زەردوو وایە، جەستە بەرگەی ئەم جۆرە نەخۆشیانە ناگرێت، لە نەخۆشییەکی زەهراوی دەچێت، ئەگەر ماوەیەکی درێژ جەستە ماندوبێت و ئەسپێش تێیبدات بەدەن توانا و تاقەتی نامێنێت". کاتێک بەدەم فسکەفسکەوە ڕێمان دەکرد لەناکاو گوێمان لە دەنگی شێخ مووس دەبووت "منیش ئەکوژن وانییە، بەرخودان نەمردووە بەڵکو لەوێ چاوەڕێمان دەکات". قارەمان باوەشی پێداکردوو ماچی کرد، قارەمان بەشێوەیەکی زۆر نەرم و نیان قسەی دەکرد کە باوەڕ بە هەموو قسەکانی بکرێت، بۆ هێور کردنەوەی هەڤاڵان ئەوەی لەدەستی هات کردی، شێخ مووس هێور بۆوە.

شەهید بوونی بەرخودان و هەڵاتنی شامیل و دوایش سیانەکەی ترمان و شێت بوونی شێخ مووس و نەزانینی ئەوەی کە گرووپەکە بەرەو کوێ ئەبرێت هەموونەمانە لەناخماندا تۆی بێ ئومێدیان دەناشت، هەستم دەکرد کە هێواش، هێواش ئومێدەکانمان وەک بەفری بەهار ئەتوێنەوە، هەستم دەکرد کە قارەمانیش هەروا بیردەکاتەوە، لەوانەبوو لەمەدا هەڵەبم، بەڵام لە ڕێکردنەکەمان و قسەکانماندا هەستێکی وا لەلام درووست ببوو، پاشەڕۆژی ۹۰ گەریلا هیچ لە ڕوون نەدەچوو، لەوانەیە بە بچوکترین ئۆپەراسیۆنی دوژمن بەشێوەیەک پەرشوبڵاو ببوینایەتەوە کە نەتوانین بەئاسانی یەکتر بگرینەوە.

هەتا بەیانی ڕێمانکرد و لەدەمەوبەیاندا لەژێر بناری ئاڤگەسۆر خۆمان جێگیرکرد، لەیەکەم دەستپێکی ئۆپەراسیۆنەکەدا لێرەوە ڕێمان گرتبووەبەر، سوڕابوینەوە و سوڕابوینەوە جارێکی تر هاتینەوە هەمان جێگا، ناوجەرگەی ئۆپەراسیۆنەکەمان بڕی بوو، بەڵام نە ئازوقەمان هەبوو نە کۆگای ئازوقەش، ئەو ئازوقەی لە گوندەکەوە لەگەڵ خۆمان هێنابوون هەربەشی چەند ڕۆژێکی دەکرد، بەبێ ئەوەی بگەینە قەڵای سەید ڕەزا بەقەد پاڵی ئەو شوێنەی بەردەڵان بوو کە دارستانەکەشی بچووک بوو خۆمان جێگیرکرد، نایلۆنە چادرەکانمان کردەوە و دامانبەسەر خۆماندا

و خەوتین. لەدوای ئەو هەموو ماندوبیە سەرەڕای ئەوەی کەشوهەواش سارد بوو، بەڵام ئەم نوستنەمان بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ بوو.

هەموومان لەگەڵ یەکەم تیشکی خۆردا خەوتبووین. دەمەونیوەڕۆ بەئاگا هاتینەوە. ئەوانەی هەڵدەسا بە چاوێکی سەیرەوە لەوانی تری دەڕوانی، ئەوەی لەناوماندا لە خەو هەڵنەسابوون ئاگری و چیا بوون، کەسیش هەستی بەمە نەکردبوو، بێگومان جگە لە من و قارەمان و شاهین کە ئەوانی ترم بینی لەژێر نایلۆنەکە درێژ ببوون ئەو غیرەتەم لەخۆم نەبینی کەبچم هەڵیان سێنم، نەمدەویست جارێکی تر گوێم لە وشەی شەهادەتێکی تر ببێتەوە، ئیتر دەبوایە کۆتایی بەم ڕەوشە بهاتایە، تەماشای شاهینم کرد، ئەویش لە قارەمانی دەڕوانی، من دڵنیابووم لەوەی کە هەرسێکمان یەک هەستکردنمان هەبوو، ئەو هەڤاڵانەی هێشتا درێژ ببوون ئەگەر شەهید بونایە ئەم کارەساتە بەتەواوەتی کاریگەری دەکردە سەر گرووپەکەمان، ئەگەر شەهید بونایە وەک مردنی ئێمەش هەژمار دەکرا، هەربۆیە کەسمان غیرەتمان نەدەکرد بچین نایلۆنەکە هەڵدەینەوە، بەڵام لەئاکامدا هەر قارەمانمان ئەم غیرەتەی نیشاندا.

قارەمان نایلۆنەکەی لاداو شانی هەڤاڵ ئاگری ڕاوەشان، ئاگرین چاوەکانی کردەوە و دایخستەوە، ئاگرین لەژیاندا بوو ئەمەش دڵخۆشی ئێمە بوو، جارێکی تر ڕایوەشاندەوە، ئاگرین جارێکی تر چاوەکانی کردەوە و بەبێ هیچ گوێدانێک و گرنگییەکەوە تەماشای قارەمانی دەکرد، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت جارێکی تر چاوەکانی داخستەوە، ئەمجارەیان قارەمان چیای ڕاوەشان، چیا هیچ نەجوڵایەوە، یەک دووجاری تر ڕایوەشاندەوە، بەڵام هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، قارەمان بانگی شاهینی کرد، شاهینیش بەخێرایی خۆی گەیاندە لای قارەمان، منیش لەوانم دەڕوانی، قارەمان وتی "دەنگ ناکات". شاهین سەرینا بەسەر سنگێوەی و پەنجەی خستە سەر ملی، نەدەنگی دەهات و نەجوڵەشی دەکرد، بەڵام سیمای لەکەسێکی زیندوو دەچوو، چاوەکانی ئەوەندە بە جوانی داخرابوون کەلەوە دەچوون هەر ئێستا بکرێنەوە، ئەو دەموچاوە بریسکەدارەی و نێوچەوانە پاکەکەی

**و برژەنگە ڕەش و درێژەکانی لە کەسێکی مردووی نەدەکرد. قارەمان لە شوێنەکەی خۆی کەوت وەک ئەوەوابوو کە ئەژنۆکانی شکابێتن و نەتوانێت بەپێوە خۆی ڕاگرێت، لەناکاو هەڤاڵ قارەمان وتی "مەخابن هەڤاڵ چیا شەهید بوو"، ).**

کۆتایی بەشی چوارەم.

# ١٧

باگەر بە یارمەتی دڵگەش دەیتوانی ڕێبکات. هەتا ڕێی بکردایە خوێنی زیاتر لەپێ ئەچۆڕی، ئازاریشی تادەهات زیادی دەکرد، کاتێک لە ڕێڕەوەکە دەرچوون بەرەو کانی گوندەکە کەلە ڕاستیدا ئەوان نەیاندەزانی کە بۆکوێ دەچن، ئامانجی سەرەکییان ئەوەبوو کە لە سنوری دەربەندی عەلی دەربچن، بەڵام بەچوونی سەربازەکانی بارەگای ئاکرەک بۆ دەوروبەری بۆزان ڕەوشیانی زیاتر خراپتر کردبوو، باگەر لە دڵگەشی پرسی بوو ئەگەر تۆ فەرماندەی گرووپەکە بویتایە هەڤاڵانت بۆکوێ دەبرد؟ دڵگەشیش بیری لە دەربەندی عەلی و بۆزان و گامر کردبۆوە و هێنابویە بەرچاوی خۆی و دوایش پێی وتبوو "لەوانەبوو بیانمبردایە بۆ پۆشێ"، دڵگەش ڕاستی دەکرد، ئەو تاکە شوێنەی کە دوژمن بیری لێنەدەکردەوە پۆشی بوو، بەڵام بۆگەیشتن بەئەوێ دەبوایە بەسەر بۆزانەوە بڕۆشتنایە، بەسەدان ڕێگە هەبوو بۆ پۆشی کە هەریەکەشیان چەندین کاتژمێر بوو بەپێ، بەڵام پۆشی تەنها گریمانە بوو، چوونی هەر گرووپێک بۆ شوێنێک بە گوێرەی پیلانی فەرماندەکەیان بوو، ئەگەر شاهین لە ژیاندا بێت ئەوا گرووپەکە بۆ شوێنێکی گونجاو دەبات، بێستاش هەمان شتی دەکرد، بەڵام ئەگەر پالۆ بووبێت بە فەرماندەی گرووپەکە لەوانەبوو ڕەوشەکە بگۆڕدرێت، ڕوون و ئاشکرابوو کە پالۆ بۆی بلوێت ئەوا لە نزیکترین شوێن سەنگەر دەگرێت و لەگەڵ دوژمندا دەکەوێتە شەڕەوە، دڵگەش و باگەریش تەخمینی ئەوەیان نەدەکرد کە ئایا پالۆ گرووپەکە بۆکوێ دەبات، نەیان دەزانی کێ لە ژیاندا ماوە و کێ بووە بە فەرماندەی گرووپەکە، بەگوێرەی ئەوان چی شوێنێک زۆر گونجاوە دەبێت گرووپەکە بچێت بۆ ئەوێ.

کاتێک گەیشتنە بەرزایی قەدپاڵەکانی گوندەکە کەوتنە چاوەڕوانییەوە، هەتا بەیانی لێرە دەمانەوە و چاودێری دەوروبەریان دەکرد و بڕیارێکیشیان دەدا، بۆئەوەی لەناو جەرگەی ئەم ئاگرەدا ڕزگاریان ببێت سەرەتا دەبوایە ئەو دەربەندەیان ببڕیایە کەلەدوای گوندەکەوە بوو، ئەمە نزیکترین ڕێگەیان بوو، لەهەمانکاتیشدا مەترسی ترین ڕێگە کردنیشیان هەرئەمە بوو، دوژمن لەحاڵەتی نۆبەراسیۆنی وادا لە دەربەنەدەکاندا بۆسەیان دادەنا، بەم

شێوەیە دوژمن دەیویست ڕێگەی هاتووچۆی گەریلا بگرێت و جموجۆڵیان تەسک بکاتەوە، بۆئەوەی بزانن کە ئایا لەدەربەندەکە دوژمنی لێیە یان نا دەبوایە کەمێک لە شوێنەکە بچنە خوارەوە، کە ڕۆژ بۆوە دڵگەش وتی کە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ئامادەیە کە زۆر سوور بوو لەسەر ئەم خواستەی خۆی، باگەریش بۆئەوەی دڵگەش نەکەوێتە ناو مەترسییەوە ئەم پێشنیارەی ڕەدکردەوە، لەراستیدا دەردی باگەر ئەوەبوو کە نەیدەویست شەهادەتی تر بێتە ئاراوە، باگەر ئێستا تەنها بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە، بەڵام دڵگەش زۆر سوور بوو لەسەر خواستەکەی خۆی بۆیە باگەریش ناچارما کە ڕێگەی بدات.

باگەر پێیووت "ئەگەر بە دیقەت دەبیت و بەسکە خشکێ دەچیت ڕێگەت دەدەم "، ئەویش پێیووت "زۆرباشە هەروا دەکەم "، باگەریش وتی "خۆت نیشانی کەس مەدە، ئەگەر سەربازت بینی بگەڕێوە، خۆت مەخە ناو مەترسییەوە "، دڵگەش بە قسەکانی باگەر ڕازی بوو، لەئاکامدا چووە خوارەوە، یەک، دوو هەنگاوێک دوورکەوتەوە، باگەر جارێکی تر پێیووت "وریای خۆت بە "، دڵگەشیش بە پێکەنینەوە بەڵێی بۆکرد.

سەرەڕای ئەوەی دڵگەش برسیش بوو، بەڵام هێشتا گورجوگۆڵ بوو، بەخێرایی بەرەو خوارەوە چوو، ئەم گورجوگۆڵییەی ببووە مایەی سەرسوڕمانی باگەریش، لەدڵی خۆیدا باگەر وتی "ئەگەر بەو شێوەیە گورجوگۆڵ بێت هیچی لێنایات "، باگەر لەوەدەچوو بەم قسانەی دڵی خۆی بداتەوە، نەیدەویست لەم ڕەوشەدا گریمانەی خراپ بهێنێت بە ئەقڵی خۆیدا، هەتا دڵگەش لەچاو ونبوو باگەر هەر تەماشای کرد، کەلە چاویشی ونبوو ئەمجارەیان مەراق و ئەندێشە وەک تا دایگرت، بەهۆی ئەم مەراقە و ئەندێشەیەوە هەموو دڵدانەوەکانی دڵی فڕین.

دڵگەش بەسەر گردەکەوە زۆر وریایانە و بە شێوەی چەماوەیی بەرەو خوارەوە دەڕۆی، ئەو بەنیاز بوو چاوێک بگێڕێت بەسەر کوونی دەربەندەکە و بگەڕێتەوە و بەنیاز نەبوو خۆی بخاتە ناو مەترسییەوە، لەدڵی خۆیدا دەیووت "دەی کەمێکی تر، دەی کەمێکی تر بڕۆ "، هەتا کاتێکی زانی کەوتە سەر ئەو

ڕێگەیەی کە دەچوو بۆ ناو گوندی ( دەرە ) وە، بە ٢٠٠ مەترێک لەسەرووی ڕێگەکە لە پشت گابەردێک دانیشت و کەوتە تەماشاکردنی دەوروبەری، لێرەوە نەیدەتوانی دەربەندەکە ببینێت، سەرەڕای ئەمەش دەیویست لێرە بمێنێتەوە و تاقیبی دەروروبەرەکە بکات، هەستی بە هیچ بونێکی مەترسی نەکرد هەربۆیە هەناسەیەکی خۆشی هەڵکێشا، کەمێک چووە خوارترەوە، ئیتر وایلێهات ڕێی نەدەکرد، بەسکە خشکێ دەڕۆی، ئەگەر بچوایەتە لای جادەکە لەسەرەوە باگەر دەیتوانی ببینێت، دڵگەشیش بۆئەوەی باگەر ببینێت و بۆی دەربکەوێت کە هیچ مەترسیەک لە ئارادانییە بەرەو جادەکە ڕۆی، ئاوڕی لە گردەکە دایەوە، بەهۆی دووریەوە باگەری نەدەبینی، بەرەو دەربەندەکە کەمێکی تر چووە پێشەوە، ڕاوەستا، ئێستا لەم شوێنەی خۆی نەیدەتوانی کە نە دەربەند و نە گردەکەش ببینێت، دوای پشودانێکی تر کەمێک لەسەرووی ڕێگەکەوە بەرەو دەربەندەکە کەمێک ملی نا، ئەو دەی وت دەی هیچ نابێت کەمێکی تر کەمێکی تر، کەهەستی بەخۆی کرد لە دەربەندەکە نزیک ببۆوە لەم شوێنەی خۆیەوە دەیتوانی دەربەندەکە ببینێت و لەگەڵ شوێنی دوو سەنگەری کۆنی سەربازێکان، هیچ سەربازێک لە دەربەندەکە بەدینەدەکرا، سەنگەرەکان چۆڵ دەبینران، پێیوابوو لەوانەیە لە سەنگەرەکاندا خۆیان شاردبێتەوە، هەربۆیە بۆماوەیەک چاوی لە سەنگەرەکان بڕی، کە هیچ جموجۆڵێکی نەبینی ئیتر گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە سەرباز لێرە نییە، بەم شێوەیە دەیتوانی بانگی باگەر بکات.

بەهێواشی خۆی قیت کردەوە و جارێکی تر تەماشای چواردەوری خۆی کرد، هەموولایەک ئارام بوو، دڵگەش لەبن دەنگی و ئارامی ئێرە نیگەران بوو، ماوەیەک گوێی بۆ ئەم ئارامی و بێدەنگییە گرت، لەبارەی بانگکردنی باگەرەوە دوو دڵ بوو، لەناکاو هەستی بە ئازاری مەعیدەی کردوو سەری سوڕی خوارد، ئەمە ئازاری برسێتی بوو، خەریک بوو بڕشێتەوە، کەلە گردەکە هاتبووە خوارەوە هەموو تینی خۆی بەکارهێنابوو، بەئەژنۆدا هات، دەستەکانی بە سکیەوە گرت، زەرداوی هەڵدەهێنایەوە، کەئەمەش ئازارێکی زۆری دەدا، وەک ئەوەوابوو کە ژەهر هەڵبهێنێتەوە، ئارەقێکی ساردی دەردەدا

که هەموو بەدەنی گرتبۆوە، ئەگەر قومێک ئاوی بخواردایەتەوە لەوانەبوو ئازاری نەمایە، ئەی باشە لەکوێ ئاوی بۆ پەیدا دەکرا، بەفر لەژێر ئەو بەردەدا کەوتبوو کە چەند مەترێک لەولایەوە بوو، بۆ دڵۆپێک ئاو حەزی چووە سەر بەفرەکە و بەرەو ئەوێ هەنگاوی نا، مشتی پڕکرد لە بەفر و خستییە دەمێوەی، هەناوی هۆنک بۆوە ( هۆنک وشەیەکی کرمانجییە واتا فێنک خەڵکی دەڤەری ئامەد بەکاری دەهێنن. .. وەرگێڕ )، بەدەنگی تەقینەوەیەک دڵی خورپەی کرد، فیشەکێک ڕێک بەر بەردەکەی بەردەمی کەوت، لە شوێنەکەی خۆی چەقی، بە شڵەژاوییەوە تەماشای چواردەوری خۆی کرد، دوایش چەند تەقەیەکی تر کرا، دڵگەش نەیدەزانی کەچی بکات، چەکیشی پێنەبوو، نەیدەتوانی بجوڵێتەوە، نەشیدەزانی کەلە کوێوە تەقەی لێدەکرێت، تەماشای بەرزایەکەی بەردەمی خۆی کرد، چاوی کەوت بە سەنگەری بچوک کەلەو بەرەوە درووست کرابوو، سەرنجی ئەوێی دەدا، بەڵام کەسی نەدەبینی، ئەم تەقە تاک و تەرایانە وەک ئەشکەنجە وابوو بۆ ئەو.

دڵگەش بیری لە باگەر کردەوە، تۆبڵێی ئەویشیان دۆزیبێتەوە؟ باوەڕی بەم گریمانەیە نەدەکرد، هەستی کردبوو کە ئەوانەی تەقەی لێدەکەن یاری لەگەڵ دەکەن، ئەگەر بیانویستایە ئەیانتوانی بیکوژن، لەوانەش بوو بیانەوێت خۆیان بەم گەمەیە مەست بکەن، ڕێک لە بەرزایەکەی پێشەوەی یەکێکی بینی کە قیت بۆوە، سەربازێک بوو کە جلوبەرگی سپی بەفراوی لەبەردابوو، بۆتەقە کردن نیشانی گرتبۆوە، دڵگەش بەشێوەیەک تەماشای دەکرد وەک ئەوەوابوو کە چاوەڕێی بکات تاکو تەقەی لێبکات، لەناکاو فیشەکێک ڕێک لە شانی چەپیدا، کەوتە سەر بەفرەکە، لە شوێنەکەی خۆی قیت نەبۆوە، لەو شوێنەی سەربازەکە تەقەی لێوەدەکرد سەربازی تریش خۆیان قیتکردەوە و هەموویان بەراکردن بەرەو دڵگەش هاتن، دوو سەربازیان لە پێشەوەیان بوون، بەشێوەی نیشان گرتنەوە دەهاتنە پێشەوە، چەند مەترێک مابوو بگەنە لای دڵگەش سەربازێکیان هاواری کرد و وتی "لەسەردەم خۆت درێژکە و دەستەکانت بخەرەسەر سەرت "، دڵگەش هیچ گوێی بە قسەکانی نەدا، سەربازەکە دووبارەی کردەوە "لەسەردەم خۆت درێژکە یاخود دەتکوژم

"، دڵگەش وەڵامی هەر نەدایەوە. سەربازێک لەدواوە بە هاوڕێکەی وت "راوەستە تەقە مەکە"، ئەمە ئەفسەرەکەیان بوو، دڵگەش دەیویست ئاگای لە هەموو شتێک بێت بۆیە زۆری لە زەهنی خۆی دەکرد، سەربازەکان خۆیاندایە بانی و لەسەردەم درێژیان کرد، دەستیان لەدواوە بەستەوە، لەپشت بەردەکە بە چوارمشقی دایاننا، خوێن لە شانێوەی دەهات، هەستی بە ئازار دەکرد، ئەفسەرەکە تەماشای ئەو شوێنەی کرد کەلێوەی هاتبوون و هاواری کرد وەرن دەتوانن بێن.

ئەو کەسەی بانگیان دەکرد ئەو سەربازە بوو کە تەقەی لە دڵگەش کردبوو، سەربازەکە هات و لە دڵگەش نزیک بۆوە، ڕێک چووە بەردەمی، هەردووکیان دڵگەش و سەربازەکە چاویان بڕییە یەکتر، بەڵام سەربازەکە چاوی لە ئاستی چاوی دڵگەش لادا، سەربازەکە کڵاوە سەربازییە سپێکەی لەسەری داکەند، کە دڵگەش دەموچاوی بینی وەک ئەوەوابوو کە فیشەکێکی تریان نابێت بە دڵێوەی، ئەو سەربازەی لەناو بەرگە سپییە بەفراوێکەدا کە تەقەی لە دڵگەش کردووە و برینداری کردووە و بەم دەردەی بردبوو هاوڕێ منداڵێکەی خۆی بوو واتا عەلی موسا.

ئەفسەرەکە لە عەلی موسای پرسی:

"ئەی ناسیت؟"

"دەیناسم".

"ناوی چییە؟"

"دڵگەش".

"پلەی چییە؟"

"بەرپرسی لۆجیستییە، بەڵام فەرماندەی مەفرەزەش بوو".

"چەند ساڵە لەناو پەکەکە دایە؟"

"گەورەم بەیەکەوە هاتبووینە ناو پەکەکەوە".

دڵگەش بە وەڵامەکانی عەلی موسا سەرسام نەبوو بوو بەڵکو سەرسامی ئیسلوبی قسەکردنەکەی بوو، عەلی موسا بە هەموو شێوەیەک وەک ئەندامانی تیمی تایبەتی سەربازی سوپای تورکی لێهاتبوو، دڵگەش هەڵدەلەرزی،

ئەفسەرەکە بۆ هەڵخەڵەتاندنی دڵگەش بە سەربازەکانی وت "تو خنی ئەم گەنجە مەکەون لەکەسێکی باش دەچێت ". دڵگەش باشی دەزانی کە ئەفسەرەکە مەبەستی چییە. ئەفسەرەکە بە دڵگەشی وت "تۆش وەک عەلی موسا هاوکاریمان دەکەیت وانییە؟ "دڵگەش تەماشای دەموچاوی ئەفسەرەکەشی نەکرد، چاوی لەو خوێنانە بڕی بوو کە دەکەوتنە سەر بەفرەکە. ئەفسەرەکە جارێکی تر وتی "دەڵێی چی هاوکاریمان دەکەیت. تیمارت دەکەین و برینەکانت چاک دەکەینەوە و وەکو عەلی موسا ژیانێکی زۆر بەختەوەر بەسەر ئەبەیت. ژیانێکی خۆشتر ببینیت باشتر نییە؟ "دڵگەش نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە. هەتا دەهات ئازاری شانی زیادی دەکرد. بەستنەوەی دەستەکانی لەدواوە هۆکاری ئازارەکانی بوون، ئەفسەرەکە کەمێک زیاتر لێی نزیک بۆوە و پێیووت "بەباشی گوێم لێبگرە. تەنها شتێکم لێت دەوێت. بە شەرەف و بە ناموسم ئەگەر ئەوەی دەمەوێت بمدەیتێ وەک پاشا ئەتژێنم ". دڵگەش تەماشایەکی عەلی موسای کرد. عەلی موسا لەبەرچاوی دڵگەش سیمای ناشرین ببوو. عەلی موسا پێیوابوو کە دەموچاوی دڵگەشیش وەک ئەوەی خۆی لێدێت. دڵگەش بیری لەو خراپیانە دەکردەوە کە ئەفسەرەکە دەیتوانی بیکات. زاتەن دڵگەش ئەو ئازارانەی دەکێشا کە دەبوایە بیکێشیایە. هیچ کەسێک نەیدەتوانی کە ئازارەکانی کەم کاتەوە یان زیادی بکات. هەربۆیە دڵگەش پێیوابوو کە ئەم ئەفسەرە لەمە زیاتری پێنەدەکرا. هەربۆیە دەبوایە لەم حاڵەتەدا دەستی لە هەموو شتێک بشۆردایە و بە قەدەری خۆی ڕازی بوایە.

ئەفسەرەکە پێیووت "شوێنی باگەرمان پێ بڵێ بەسە ". دڵگەش بە دەنگێکی ڕقاویەوە پێیووت "نازانم ". لە دەنگیدا باوەڕ بوونی زاتی بەخۆی، هەستی پێدەکرا. ئەفسەرەکەش وتی "کەواتە نازانی ها؟ "گۆچانەکەی لە دەستی سەربازێک وەرگرت، پاشانیش خستییە سەر برینەکەی دڵگەش و بەهێزی خۆی لەسەر برینەکەی یاری پێدەکرد. نوزانەوە و هەستکردن بە ئازار خەریک بوو بیخنکێنێت. وەک ئەوەوابوو کە ئاگر سەرەتاپا لەشی گرتبێتەوە. تاکو ئەم ساتەش دڵگەش هەمیشە توانیبووی ئەو ئازارانەی لەناو ناخیدا بوون بشارێتەوە. بەڵام ئەم ئازارە جیاواز بوو. تەحەمول کردنی زەحمەت

بوو، هەرچییەکی لەدەم دەهاتە دەرەوە کەس لێی حاڵی نەدەبوو، هەتا دڵگەش هاواری بکردایە ئەفسەرەکە زیاتر برینەکەی ئەکولانەوە، جارێکیان کە خۆیشی نەیزانی چۆن پێی کرا دەستی کرد بە جوێندان، دەیزانی کە ناتوانێت لەوەزیاتر دانبەخۆیدا بگرێت، هەتاگۆچانەکە زیاتر لەناو برینەکە بچەقێنرایە ئازاری زیادی دەکرد، لەناکاو هیچ دەنگێک نەما، وەک ئەوەوابوو کە کەس لە چواردەوری دڵگەش نەمابێت، هەموو شوێنێک تاریک داهاتبوو، تۆ بڵێی بورابێتەوە؟ هەوڵی دەدا کە هۆشی لەلای خۆی بێت، لە قسەکانی خۆی حاڵی نەدەبوو، لە قسەی کەسیش حاڵی نەدەبوو، دوای ماوەیەک هۆشی هاتەوە سەرخۆی، ئەمجارەیان عەلی موسا کەوتە قسە و پێیووت "من هاورێی منداڵیتم، نامەوێت زەرەرەت پێبگات، شوێنی باگەرمان پێبڵێ، ئەی باشە ئەو چی بە ئێمە داوە؟ جگە لە خوێن و مردن چیترمان بینی؟ بڕوانە ئەم ئەفسەرە هەموو شتێکمان دەداتێ، ئەگەر شوێنەکەیمان پێ بڵێیت خۆ دونیا خراپ نابێت، پێویست بە ترس ناکات، باوەڕ بە من بکە، من خراپی تۆم ناوێت، دەی شوێنەکەی باگەرمان پێبڵێ؟!"

دڵگەش تەماشای دەموچاوی عەلی موسای کرد، کە بەوردی لێی وردبۆوە جگە لە نەفرەت و قین هیچی تری تیا نەبینییەوە، دەیویست پڕ بەدەمی خۆی تف لە دەموچاوە ناشرینەکەی بکات، قێزی لێدەکردەوە، عەلی موسا جارێکی تر قسەکانی دووبارە کردەوە "شوێنی باگەرمان پێبڵی وەک پاشا ئەژیت"، دڵگەش لێی پرسی "چەند کەست کوشت؟" عەلی موسا وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە، تەماشای ئەفسەرەکەی کرد، ئەفسەرەکە وتی "٥٠ ی تێپەڕاندووە بە دڵ و گیان کار بۆ دەوڵەت دەکات، لەماوەیەکی کەمی تردا ٥٠ دانەی تر دەکوژێت"، دڵگەش وتی "شوێنی باگەر نازانم"، دڵگەش دەیویست ئیتر کۆتایی بە قسەی نێوانیان بهێنێت، عەلی موسا پێیووت "شوێنەکەیمان پێناڵێت ها؟" دڵگەشیش بە عەلی موسای وت "دەی ژمارەیەکی تر بەسەر ٥٠ دانەکەدا زیادکە"، عەلی موسا وەڵامی نەدایەوە، چەند هەنگاوێک هاتە دواوە، چووە پشت ئەفسەرەکەوە، ئەفسەرەکە وتی "ئەی گەوادی کوڕی گەواد"، تەماشای عەلی موسای کرد و پێیووت "بیتۆپێنە"، عەلی موسا دەمانچەی

ئەفسەرەکەی وەرگرت و میلی ڕاکێشا، چوو لەبەردەم دڵگەش ڕاوەستا، لەسەرەوە تا خوارەوە تەماشای دڵگەشی کرد، ئەمجارەیان چاوی لە ئاستی دڵگەش هیچ لانەدا، دڵگەشیش تەماشای عەلی موسای دەکرد، چاوی پڕبۆوە ناو چاوی، عەلی موسا لوولەی دەمانچەکەی خستە بان سەری، هەستی کرد کە دەستی دەلەرزێت، هەستی بە ئازارێکی دەروونی دەکرد، خۆیشی نەیدەزانی بۆچی هەست بەو ئازارە دەکات، ئەمە تۆڵە سەندنەوەیەکی بێ ئامانج بوو، هەولوتەقەلایەکی بێ ئامانج و حوزنێکی بێ ئامانجیش بوو، عەلی موسا کە هەستی دەکرد لە بواری هەموو شتێکدا بێ ئامانجە زیاتر دەستەکانی دەلەرزین، عەلی موسا پێیووت "دوا قسەی خۆت بکە!" ڕووخساری دڵگەش هیچ نەگۆڕا، هێشتا لە چاوانی عەلی موسای دەڕوانی.

عەلی موسا تەقەیەکی کرد، فیشەکێکی نابە نێوچەوانی دڵگەشەوە، خوێن و پارچە گۆشتی سەری دڵگەش پریشکەی کرد، فیشەکێکی تری تەقاندەوە، دانەیەکی تر و دانەیەکی تریش، هەتا تەقەی بکردایە دەیویست زیاتر و زیاتر تەقە بکات، ترس وەک سێبەر بەدوای عەلی موساوە بوو، لەراستیدا ئەو تەقەی لە ترسەکانی خۆی دەکرد، دەماغی دڵگەش پارچە، پارچە ببوو، خوێن بە هەموولایەکدا بڵاوببۆوە، عەلی موسا هەستی بە ئاسودەیی کرد.

کاتێک عەلی موسا و سەربازەکانی تر پاشەکشێیان کرد و ناوچەکە بێ دەنگ بۆوە باگەر بڕیاریدا کە بەرەو ناوچەی پۆشێ بڕوات، هێشتا دونیا تاریک نەبوبوو، دەبوایە مەترسی لەچاو بگرێت، هەستی بە ئازار دەکرد کە دڵگەشی بەرەو مردن ڕەوانە کردبوو، بەخۆی دەووت "دەمتوانی کە نەیەڵم بڕوات"، ئەم قسانەشی دوای ئەوەکردی کە کارلەکار ترازابوو، هەرچەندە فەریادی بکردایە و خەفەتیشی بخواردایە هیچیان دڵگەشیان نەدەگەڕاندەوە، دوای ماوەیەکی زۆر لە ڕێکردن لە دڵی خۆیدا وتی "ئەی ئەگەر نەمردبێت؟" باگەر بە چاوی خۆی نەیدیبوو کە دڵگەش شەهید بوبێت، تەنها سەربازی بینیبوو هەروەها گوێشی لە دەنگی تەقە ببوو، هەموو تەقەکان هەرچەندە چەند فیشەکێک بوون، ئەی ئەگەر ڕێگەیەکی بۆهەڵاتن دۆزیبێتەوە و هەڵاتبێت و گەڕابێتەوە ئەو شوێنەی کە بەجێی هێشتبوو، لەم حاڵەتەدا چی بکردایە،

کەوتەوە یادی کە پێیووتبوو لێرە چاوەڕێت دەکەم، لەبارەی گەڕانەوەیان نەگەرانەوەیدا دوو دڵ بوو، ئەو دەیزانی کە بەم قاچە بریندارەوە گەڕانەوە زۆر زەحمەتە، زاتەن درێژبوونی ڕیش و چاوە بە قوڵاچۆکەی و ئازاری نەیاندەهێشت کە بڕیاری وابدات.

ناوچەی پۆشێ کەوتۆتە خوارووی چیاکانی ساریسالتکەوە، کەوتۆتە ناو سنوری هەرێمی سەرحەدەوە، لە شوێنێکی پێدەشتدایە. لەسەرووی گوندی کاهیری و دارێکی زۆری چناری هەیە و بۆ مۆڵگەی گەریلا شوێنێکی گونجاوە، لە باشوری پۆشێ گوندەکانی دەرە و مەحسونپارک هەیە و لە باکوریشێوەی زێی چەتە و ساغارتاشی لێیە، لە کۆندا بە پۆشێیان وتووە کاهبەری، باشترین و گونجاوترین شوێنی ئەم جوغرافیایە پۆشێیە.

باگەر بە درێژایی ڕۆژ ڕێی کردبوو، بەڵام هێشتا نەگەیشتبووە پۆشێ، لەپەنای بەردێکدا خەوی لێکەوت، لەگەڵ هەڵاتنی یەکەم تیشکی خۆردا کەوتەوە ڕێ، بۆئەوەی بگاتە پۆشێ دەبوایە بەناو دارستانەکە بڕۆشتایە کە هەمووی دار چنار بوو، دوای ماوەیەک کە چووە ناو دارستانەکە چاوی کەوت بە داری چنار، کاتێک گەیشتە ناوەڕاستی دارستانەکە گەیشتە کانی کوتساڵ، خەڵکی ناوایەکان بۆ نزا و قسمەت و خێر و بەرەکەت زیارەتی سەر ئەم کانییە دەکەن، ئەم کانییە لەبن گابەردێکدا هەڵدەقوڵێت، ناوێکی هەتا بڵێی سازگار و ساردی هەیە، لەسەر کانێکە دارێک هەیە کە پێی دەڵێن داری نیاز، بەم دارەوە سەدان پارچە قوماشی ڕەنگاو ڕەنگ بە لق و چڵەکانێوەی هەڵواسراوە، ساڵانێکی دوور و درێژە خەڵکی زیارەتی ئەم دارە دەکەن، دوعا دەکەن و نیەت دەگرن، پارچەیەک لە قوماش بە چڵەکەیەوە دەبەستن و بەم شێوەیە دەکەونە چاوەڕوانی قەبوڵکردنی ڕاز و نیازیان.

باگەر لە ئاوە سارد و سازگارەکەی خواردەوە، ددانەکانی ڕچین، هەستی کرد کە ساردی ئاوەکە هەموو بەدەنی گرتەوە و نەیتوانی زیاتر بخواتەوە، ماوەیەک لە دارە نیازەکەی ڕوانی، نەدەزانرا کە ئایا نیەتی گرتووە یان نا، بەڵام چاوەکانی ئەبریسکانەوە، دوایش بە وردی تەماشای دارە چنارەکەی کرد، دارەکە ئاسەواری زۆر شتی کۆنی پێوەمابوو، هەتا دارەکە بچوایەتە تەمەنەوە

و گەورە ببوایە ناوی زیاتری لەسەر دەنوسرا و نەخشدەکرا.

باگەر لە دارستانەکە هاتە دەرەوە و بەرەو پۆشێ بە هیوای ئەوەی دێتەوە بە هەڤاڵەکانی ڕێگەی کرد، هاتنەدی ئەم ئومێدەی وەک ئەوەوابوو کە تازە لە دایک بوبێتەوە، ئامادەی ئەوەش بوو کە هەر ساتێک بێت ڕوبەڕووی ڕووداوی کتوپڕیش ببێتەوە، بێگومان لەگەڵ هەواڵی دڵتەزێنیش، ئەو نەیدەزانی کەکام لە هەڤاڵەکانی شەهید بوونە، کاتێک گەیشتە نیوەی پۆشێ لەسەر بەردێک دانیشت، دەنگی جیاواز، جیاوازی دەکرد، سەرەتا گوێی بۆ دەنگی باڵندەکان گرت، دەیتوانی بەباشترین شێوە لاسایی دەنگی باڵندەکان بکاتەوە کە باشترینیان دەنگی کەو بوو، بە گریمانەی نەک هەڤاڵانی دووربن سەرەتا لاسایی دەنگی گورگی کردەوە، دوای ئەوەی چەند جارێک وەک گورگ لورانی ئیتر گوێی ڕادێرا کە بە هەمانشێوە وەڵامی بدەنەوە، پێویستی بەوە نەما کە زۆر چاوەڕێ بکات، لەهەمبەری لە شوێنێکەوە هەمان شێوەی دەنگی لوورەی گورگ بیسترا، باگەر جارێکی تر بەهەمان شێوە لورانی، لەناو بەردەڵانەکەی بەرامبەری چاوی کەوت بە شاهین و یەکسەر بە ڕاکردن چوو بۆلای، ئەوەی یەکەم کەس بوو کە پێشوازی لێکرد بێشک هەڤاڵ شاهین بوو، گەیشتن بەیەک و تەوقەیان کرد و دوایش باوەشیان کرد بەیەکدا، گەریلاکانی تر هەرکە گوێیان لە دەنگ و ناوی باگەر بوو هەموویان هەڵسانە سەرپێ، وەک ئەوەی چەندین ساڵ بێت یەکتریان نەبینیبێت باوەشیان کرد بەیەکدا، بەڵام ئەوەی مایەی مەراقی باگەر بوو ئەوەبوو کە بیزانیایە لەگەڵ کێدا تەوقەی نەکردووە.

باگەر لەگەڵ شاهین و پالۆ و بەرچەم و غالیب و بەگشتی لەگەڵ ٣٠ گەریلادا تەوقەی کرد، ٨ هەڤاڵیان دیارنەبوو، پێش ئەوەی گوێی لە هەواڵی دڵتەزێن بێت سەرەتا خۆی هەواڵی دڵتەزێنی داپێیان، باگەر وتی "هەڤاڵ دڵگەش شەهید بوو"، کەسیان قسەیان لەدەمدا نەهاتە دەرەوە، دانیشتن، شاهین وتی "لەوە دەچێت برسیت بێت؟! "باگەر وتی "نا برسیم نییە، کەمێک لەمەوبەر لە چێشتخانەیەک لام داو و قوبلێیەکی خۆش و چەورم خوارد"، شاهین کترییەک کە پڕی بوو لە دۆشاو داپێی، باگەر وتی "ئەمە چییە؟ "شاهین وتی "چوینە گوندێکەوە، هەندێک نانمان هێنا، هەندێکیش دۆشاو، لەبەرئەوەی

هیچی ترمان نەبوو ناچارماین بیکەینە ناو کترێکەمانەوە ". دوای ئەوەی باگەر نان و دۆشاوی خوارد و سکی خۆی تێرکرد ئیتر کەوتنە ناو قسەوباسەوە، باگەر یەک بەیەک هەواڵی هەموو گەریلاکانی پرسی، یەک، دوو هەڤاڵێکیان بە سووکی بریندار ببوون، باگەر وتی "کەواتە وەحشەت شەهید بوو؟ "پالۆ وتی "نەخێر هەڤاڵ حەیفت نەکرد ئەو قەت شەهید دەبێت! "باگەریش وتی "ئەی لەکوێیە؟ "پالۆ وتی "ون بووە! "باگەریش پرسی "چۆن ون بووە؟ "شاهین وتی "ئێمەش حاڵی نەبووین، دوای هاتنە ئاراوەی ڕووداوەکە کە بەسەر گوندی دەرە ڕۆیشتین گرووپەکەمان بڵاوبۆوە، دوایش سەرلەنوێ یەکمان گرتەوە، جارێکی تر وەحشەت واتا ئازادمان نەبینییەوە "، باگەر وتی "ئەبێ بۆکوێ چووبێت؟ "غالیب وتی "لەوانەیە ئەوکاتەی چوبێتە گوندەکەوە ڕووبەرووی کچێک بوبێتەوە ". پالۆ وتی "نا وەحشەت شتی واناکات، ئەو زۆر بەناموسە "، بەدرێژایی ڕۆژ هەموویان سەرقاڵی قسەوباس بوون.

باگەر خۆی سەرقاڵی بێتەلەکە کرد، دەیویست پەیوەندی بە هەموو گرووپەکانەوە بکات، بەڵام نەیتوانی پەیوەندی لەگەڵ هیچ گرووپێکدا ببەستێت، ئەمجارەیان کۆدەکەی ئیبراهیمی سوڕاند، ئیبراهیم وەڵامی دایەوە، هەموو گەریلاکان لە چواردەوری بێتەلەکە کۆبونەوە، هەموویان بەم پەیوەندییە بەختەوەر بوون، ماوەیەکی زۆر بوو هەواڵی هیچ هەڤاڵێکیان نەدەزانی، بەڵام ئێستا ئەوەندەی دەنگی ناو بێتەلەکەیان لێیان نزیک بوو، باگەر لێی پرسی "لەکوێن؟ "ئیبراهیمیش وتی "زۆر دوورم خەریکی سەربڕینی قوربانیم "، باگەر ئەمڕۆ لەو شوێنەوە تێپەڕی بوو کە ئیبراهیم باسی دەکرد، باگەر وتی "لە شوێنی خۆت چاوەڕێ بکە دێینە لات "، باگەر شاهین و چەند گەریلایەکی ئەرکدار کرد تاکو بچن ئیبراهیم بهێنن، دوای کاتژمێرێک لە ڕێکردن ئیبراهیم لە ڕێگە پێشوازی لە شاهین و هەڤاڵەکانی کرد، لەکاتی گەڕانەوەیان بۆلای باگەر شاهین باسی بەسەرهاتی خۆیانی بۆ ئیبراهیم کردبوو، دوایش ڕووداوەکانی خۆیشی بۆ ئەوان گێڕابۆوە، بەڵام ئەمجارەیان کە باسی شەهید بوونی ٣٦ هەڤاڵی کە دەکرد فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتنە خوارەوە، دوایش گەیشتنەوە لای باگەر، باگەر وتی "دەبێت هێزەکەمان کۆبکەینەوە "، ئیبراهیم پرسی

"بۆچی؟ "باگەر وتی "ئیتر دەبێت چالاکێکانی بەرنامەی ئەم ساڵ بخەینە بواری جێبەجێ کردنەوە، بەڵام سەرەتا دەبێت ئازوقە و نایلۆن و چا و شتومەکی تر دابین بکەین، دەتوانین بە هێستر ئەمانە بهێنین، شاهین دەزانێت هێسترەکان لەکوێن، ئازوقەیەکی زۆر بهێنن، ٣ هەڤاڵیش ئەرکدار بکەن کە گرووپەکەی هێلین بهێنن بۆ ئێرە "، ئیبراهیمیش وتی "زۆرباشە "، دوای ئەوەی ئەرکەکان بەناویاندا دابەشکرا، دەمەوئێوارە ڕێکردن دەستی پێدەکرد، بەرچەم و شاهین و حامیدۆ و ئۆزان و سولەیمان بۆ دابینکردنی ئازوقە ئەرکدارکران هەروەها پالۆش لەگەڵ دوو گەریلادا بۆ هێنانی گرووپەکەی هێلین کەوتنە ڕێ، ئەوەی کەدەمایەوە ئەوەبوو کە دانبەخۆیاندا بگرن و بکەونە چاوەڕوانییەوە.

# ١٨

حەیدەر لە بنکەی جەندرمەی شارۆچکەی ئۆڤاجک لە ژوورێکی خوێناوی ژەنگ گرتوودا چاوەڕوانی دەکرد، ئەفسەرێک بۆ ئەوەی حەیدەر بە کەسێکی تر بناسێنێت لەو ژوورەی حەیدەری لێبوو هاتبووە دەرەوە ئێستاش حەیدەر بە تەنیا مابۆوە، حەیدەر لەلایەکەوە مەراقی ئەوەی بوو کە ئیتر لەمەودوا چی بە چاوی خۆی دەبینێت هەروەها دڵی لای ئەفسەرەکەش بوو کە ئەبێ لەگەڵ کێدا یەکتریان پێبناسێنێت، حەیدەر ئاسودە نەبوو هەروەها دەترساش، خۆیشی نەیدەزانی کە ئایا بەچی بەختەوەر و غەمگین ببێت، بەلای کەمەوە ئەوەی دەزانی کە بەختەوەر نییە، حەیدەر بیری لەوە دەکردەوە کە ئایا ئەوەی کردویەتی خیانەتی پێدەوترێت یان ناچاری.

ئەو ڕۆژەی خۆی ڕادەستی بنکەی جەندرمە کردبوو لەو ڕۆژەوەی ببوو بە گەریلا تاکو ئەمڕۆی چی بیستبوو چی بینیبوو چی بەسەرهاتبوو هەموویانی بۆباسکردبوو، خواستە زۆرەکانی ناو دڵی هەڵهێنابۆوە و وایدەزانی کە بەم شێوەیە خۆی ئاسودە دەکات، بەڵام خۆیشی دەیزانی لەبەرئەوەی بە هیچیان نەزانی بوو بۆیە خزانبویانە ژوورێکی وەک ئێرەوە و بۆ هیچ کەسێک واتایەکی ئەوتۆ نابەخشێت، مردنی ٣٦ گەریلا گێڕانەوەی بەسەرهاتیان و شێوازی کوژراوەکانیانی بەشێوەیەک بۆ ئەفسەرە باڵا بەرزەکان باسدەکرد کە وشەکانی بەتایبەتی لە دڵی خۆی هەڵدەبژارد تاکو بەختەوەر و ئاسودەیان بکات، زۆر بە زمانێکی شیرین باسی مردنی هەڤاڵە کۆنەکانی بۆ دەکردن.

لە ژوورەکە بیری لەوە دەکردەوە کە لێرە بەدواوە چی دێتە ئاراوە، کاتێک لە مەمەرەکە گوێی لە دەنگی پێبوو هەستی بە ترس کرد، دەنگی پێیەکان نەدەمان و دەبیسترانەوە، بەڵام ئەمجارەیان دەنگی پێ لەدەرگای ژوورەکەی ئەم نزیک بۆوە، دەرگاکە کرایەوە، ئەفسەرەکە بانگی حەیدەری کرد بۆ دەرەوە، حەیدەریش هاتە دەرەوە و بەیەکەوە بە ڕێڕەوەکەدا ڕۆشتن، چوونە ژوورێکی پاک و خاوێنەوە و هەرلەسەر پێ کەوتنە چاوەڕوانییەوە، ئەفسەرەکە پێیووت کە دانیشێت، حەیدەریش دانیشت، ئەفسەرەکە پێیووت ئێستا لەگەڵ یەکێکدا یەکترتان پێدەناسێنم، جگەرەیەکی دابە حەیدەر، حەیدەریش هێشتا

جگەرەکەی دانەگیرساندبوو عەلی موسا هاتە ژوورەوە، حەیدەر یەکسەر هەڵسایە سەرپێ، حەیدەر عەلی موسای باش دەناسی، هەستی بەوە دەکرد کە ئیتر کاتی بەدەلدانی گوناحەکانێتی، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، تەماشای عەلی موسای دەکرد، عەلی موسا باوەشی بە حەیدەردا کرد، حەیدەر هێشتا لە شکۆدابوو، کاتێک ئەفسەرەکە باسی هەموو مەسەلەکانی بۆ کرد حەیدەر زۆر بە قسەکان بەختەوەر بوو چونکە هەستی دەکرد کە شەریکێکی بۆ پەیدابووە هەروەها ئەفسەرەکە باسی لە قارەمانێتی عەلی موساشی بۆکرد، ئەفسەرەکە باسی لە ڕۆڵی عەلی موسا کرد لەبارەی کوشتنی ئەو ٣٦ گەریلایەوە، حەیدەر لە عەلی موسای دەڕوانی، حەیدەر ترسی کەمێک لەمەوبەری نەمابوو ئێستا کەمێک ئاسودە ببوو، هەردووکیان پێیان وابوو کەلە شەرمەزارێکانیان خۆشبوونە، هەردووکیان زیاتر لە جاران هەستیان بە نزیکتری یەکتریان دەکرد، هەرچۆنێک بێت هەردووکیان لەیەک سەرچاوەی گوناحەوە هەناسەیان هەڵدەمژی، کە هەردووکیان لە یەکترییان دەڕوانی وەک ئەوەوابوو کە بەیەک بڵێن "ئێمە گوناحەکانی خۆمان دەزانین چییە، ئێمە خۆمان لەیەکتری خۆشدەبین"، ئەفسەرەکە پێیووتن "یەکینەیەک بە فەرماندارێتی ئێوە پێکدەهێنین"، بەگوێرەی ئەفسەرەکە بێت فەرماندەی ئەم یەکینەیە عەلی موسایە، ئەگەر حەیدەریش ئەرکی خۆی بەباشی بەجێبهێنێت و هاوکاری بکات بۆ لەناوادنی گەریلاکانی پەکەکە ئەویش دەبێتە یاریدەدەری فەرماندەی یەکینەیەکی تری تایبەت، ئەفسەرەکە زۆر بە دوور و درێژی باسی نیعمەت و دەستکەوتەکانی ئەم کارەشیانی بۆکردن، باسی لە بەدەست خستنی ژنان و کچان و ماشێن و پارە و دەسەڵاتەکانیانی بۆکردن، هەموو ئەمانە بە مەرحەمەتی دەوڵەت ناوزەند دەکرد، دوای قسەکان ئەفسەرەکە پێیووتن "وانییە؟" حەیدەریش وتی "بەڵێ هەموو ئەمانە مەرحەمەت و بەرەکەتی دەوڵەتی تورکە"، ئەفسەرەکە ڕووی خۆی کردە عەلی موسا و پێیووت "لە ئەشکەوتێک گەریلای برینداری هەیە ئەمانە بەرماوەکانی ئەو ٣٦ کەسەن کە کوژران، چاوەڕێی کۆپتەر دەکەین تۆش لەگەڵماندا وەرە"، عەلی موساش وتی "فەرمانی جەنابتە گەورەم".

دوای ماوەیەک کۆپتەرێک لە دەرەوەی بارەگاکە نیشتەوە، عەلی موسا و حەیدەریش لە دەرەوە چاوەڕێ بوون، عەلی موسا لە چاو حەیدەر بە ئەزموونتر بوو، بەلای کەمەوە لەم بارەیەوە خۆی سەلماندبوو. ئەو نیگەرانییە و ترسەی حەیدەر هەیبوو لەهەمبەر ئەفسەرەکە ئاسەواری نەمابوو، هەستی دەکرد کە دەلەرزی، یەکەم ڕۆژانی دەستپێکردنی نۆبەراسیۆنەکەی هاتەوە خەیاڵ، ئیتر کاتی ئەوەی هاتبوو کە باس لە ئەزموونەکانی خۆی بکات.

# ١٩

دوای چەندین ڕۆژ بوو یەکەمجار بوو کە ڕۆژین بە هاوکاری هێلین لە ئەشکەوتەکە بێتە دەرەوە، هەرچەندە نارەحەتیش بوو، بەڵام دەیتوانی پێی لە زەوی دابنێت، برینەکانی گوڵزاریش ڕزیوبوو، گەورەترین دڵخۆشی و بەختەوەری ڕۆژین ئەوەبوو کە ئیتر دەیتوانی بە تەنیا پێداویستێکانی خۆی ئەنجام بدات، بەکارنەهێنانی دەست و قاچ لە مردن خراپترە. هێلین ڕۆژینی برد بۆ خوارووی ئەشکەوتەکە و لەپەنای گابەردێکدا داینا و خۆیشی گەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە، هێلین و ڕۆدی مەراقی ئەوەیان بوو کە هەواڵێک لە ئیبراهیمەوە پێیان بگات، هیچیان لەبارەی ئیبراهیم و ئەنوەر و مەلسایان نەدەزانی کە حەیدەریان بردبوو، نەیاندەزانی کە چەنێکی تر لەم ئەشکەوتە دەمێننەوە، هێلین لەبارەی نیگەرانی و ئەندێشەکانی خۆیەوە تەنها قسەی لەگەڵ ڕۆدی دەکرد، هێلین کە چووە ناو ئەشکەوتەوە لە ڕۆدی نزیک بۆوە، هێلین بە ڕۆدی وت "دەزانم ئەمجارەیان نۆف و پۆف دەکەیت"، ڕۆدی لەمەبەستی حاڵی بوو، هەربۆیە پێیووت "بەڕای تۆ دەبێت چی ڕوویدابێت؟ "هێلینیش وتی "نەخێر ئەمجارەیان جیاواز ترە"، ڕۆدی بە پێکەنینێکەوە پێیووت "چۆن جیاواز ترە کەواتە پرسیارەکەت بکە"، هێلین وتی "ئەمویست بپرسم کە ئایا دەبێت چی بووبێت، دەبوایە تاکو ئێستا لە هەڤاڵ ئیبراهیمەوە هەواڵێکمان پێبگەیشتایە، نەدەبوایە ئەوەندە دوابکەوێت. مەسەلەی حەیدەریش نیگەرانی کردووم، مەلسا هەڤاڵێکی زۆر سادە و خۆشباوەڕە، لەبارەی ئەم مەسەلانەوە زۆر

نامۆیە، لەبارەی ئەنوەرەوە ئەندێشەم نییە، بەڵام نازانم "، ڕۆدی پێیووت "شتێکی باش نییە لە هەموو مەسەلەیەکدا بە خەیاڵی خۆت شتێک بخوڵقێنیت، مەسەلەکان زۆر گەورە دەکەیتەوە، ئەسپێیەک دەکەیت بە گا، ڕاستە منیش مەراقم لەبارەی مەسەلەکانەوە هەیە، بەڵام لەو باوەڕەدام کە هەڤاڵ ئیبراهیم هەردێتەوەلامان، ئەو دەزانێت چی دەکات، هەرکە پەیوەندی بەست لەگەڵ هەڤالانی تردا دێن بە شوێن ئێمەدا "، هێلینیش وتی "خوا دەکات هیچی لێنایەت مەسەلە نامێنێت "، ڕۆدیش پێیووت "مەراق مەکە هیچی لێنایەت "، هێلینیش پێیووت "منیش بەهەمان شێوە بیردەکەمەوە هەڤاڵێکی بەتەدبیرە "، ڕۆدی لە دڵی خۆیدا بە قسەکانی هێلین پێ دەکەنی، مرۆڤ هەرچەندە بە توانا و بە هێزیش بێت هەمیشە دەیەوێت دەروونە هەژاوەکەی خامۆش بکاتەوە، هەندێکجار ئەمە لەوانەیە وشەیەکیش بێت، هەندێکجاریش لەوانەیە خەندەیەک بەس بێت، هێلین لەدوای قسەکانی ڕۆدی کە وەک دەرمان بوون ئەگەر کەمیش بووبێت هێلینی لە شەپۆلی نیگەرانێکانی دوور خستەوە.

ڕۆدی تەماشای چاوەکانی هێلینی کرد، دەیویست بزانێت دوای ئەم قسەیەی نێوانیان کەمێک خامۆش بۆتۆتەوە یان نا، لەچاوە بریسکەدارەکانی دیار بوو کە هێشتا زۆر شتی شاردۆتەوە کە مایەی مەراق بوون، ئەمەش ئەوەی نیشان دەدا کە ناتوانێت بەتەواوەتی هەستەکانی ناو ناخی بشارێتەوە، زاتەن شاردنەوە و دەرنەخستنی دەرەوەی هەستی ناخ خۆیلەخۆیدا جەوهەرێکی هونەرییە، هونەرەکە لەوەدایە کەلەو حاڵەتانەی کە زۆرت بۆدێت بتوانیت بە بچوکترین شت خۆت بە بەختەوەر نیشان بدەیت ئەمە خەڵاتێکی گەورەیە کە بتوانیت ئەو هونەرە بەکار بهێنیت لەحاڵەتی ناڕەحەتی و ئەندێشە و نیگەرانێکاندا، زاتەن یەزدانەکان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە ئەی نەخوڵقاون؟

هێلین باوەڕی بەوە نەدەکرد کە ئێستا پەنای بۆ ئەو شتانە بردووە کە پێشوتر باوەڕی پێنەبوو، ئەگەرچی باوەڕی بە یەزدانیش نەبوو، بەڵام ئەوکاتانەی دەکەوتە ناو ناڕەحەتییەکی زۆرەوە یەزدانێکی بۆخۆی ئەدۆزییەوە کە پەنای بۆبەرێت، جارێکیان کەلە سەر گردێک ڕوبەڕووی دوژمن ببونەوە هێلین وتبووی ئەگەر خوا هەیە با ڕزگارمان بکات، ئەوکاتەشی ڕزگاریان ببوو

لەم قسەیەی خۆی بایدابۆوە. هێلین لەلایەکەوە پەنای بۆ یەزدانێک دەبرد و لەلایەکی تریشەوە نکۆڵی لێدەکرد تەنانەت بەم ڕەوشەی خۆیشی پێدەکەنی، دین و یەزدان تەنها بارگرانی نین بۆ مرۆڤ، لەبارەی دینەوە کارل مارکس دەڵێت "ویژدانی جیهانی بێ ویژدان، هەندێکجار لە ڕەوشی نالەباردا دڵنەوایی و ویژدان واتلێدەکات کە پەنا بۆ ئەوشتانە بەرین کە بە بارگرانی دەیبینیت".

دەبوایە هێلین بچوایە ڕۆژبینی لەو شوێنە بهێنایەتەوە کە جێهێشتبوو، کاتێک لەلای ڕۆدی هەڵسا و ویستی لە ئەشکەوتەکە بێتە دەرەوە لەناکاو دەنگێکیان گوێ لێبوو بە بەرزی دەیووت خۆتان ڕادەست بکەن، سەربازی دوژمن لەهەمبەر ئەشکەوتەکە سەنگەریان گرتبوو، لە دەستپێکدا هێلین چەند سەربازێکیانی بینی، هێلین بە ڕاکردن خۆی گەیاندەوە لای ڕۆدی، هەڤاڵەکانی ناو ئەشکەوتەکەش گوێیان لە دەنگی سەربازەکان ببوو کە دەیانووت خۆتان ڕادەست بکەن، بەم دەنگانە زۆر تاسا بوون، لە حاڵەتێکدا کە نەزانرێت چیبووە و چۆن بووە و زانینی ئەوەی کە چواردەورت لەلایەن دوژمنتەوە گیراوە ئەمە بۆ گەریلا بەمانای فەلاکەت و کۆتایی هەموو شتێک دێت، لەم حاڵەتانەدا مردن زۆر بە ڕوونی خۆیت نیشان دەدات، ئەمە گەورەترین دەرد و ئازارێکی ناخۆشە کە بزانیت دوای ماوەیەکی تر ئەمریت، هەموویان خۆیان خستە دوا سوچی هەرەدواوەی ئەشکەوتەکەوە، دەنگی ئەفسەری سەربازەکان دەگەیشتە ناو ئەشکەوتەکە، دەنگەکە پێیانی دەووت "خۆتان ڕادەست بکەن، دەوڵەتی تورک گەورەیە، ناتوانن شان بدەن لە شانی دەوڵەت، ماوەی ٥ خولەکتان دەدەمێ، یان خۆتان ڕادەست دەکەن یان دەمرن".

دوای تەواوبوونی ئەم قسانە هێلین تەماشای ڕۆدی کرد، دەیویست بزانێت کەچی بکەن، ژمارەیان ٩ گەریلا بوو، ڕۆژبینیشیان هێشتا لەدەرەوەی ئەشکەوتەکە بوو، نەیاندەزانی کە ئایا لەدەرەوە گرتویانە یان نا. ڕۆدی وتی "لەوەدەچێت ئەمجارەیان بەتەواوەتی چەمبەرمانیان گرتبێت"، هێلین لەبارەی ئەم قسەیەی ڕۆدییەوە هیچی نەووت، گوڵیزاریان پرسی "چیبکەین؟" ڕۆدی وتی "لەوانەیە هەموومان بمرین"، هێلینیش وتی "بەڵێ ئەمجارەیان ئەمرین".

هێشتا ٥ خولەک بەسەر نەچووبوو جارێکی تر دەنگێک بەرزبۆوە، ئەم دەنگە بەس بوو بۆئەوەی بیان تاسێنێت، ئەم دەنگە وەک خەنجەرێک جەرگیانی بڕی، بەڵێ ئەم دەنگە دەنگی حەیدەر بوو. حەیدەر پێیانیوت "بڕوانن من خۆم ڕادەست کرد، مامەڵەیەکی زۆرباشیان لەگەڵمدا کرد، ئەشکەنجەیان نەکردم، مەسەلەی ئەشکەنجە و شتی لەوبابەتە هەمووی درۆن، ئەگەر خۆتان ڕادەست بکەن دەوڵەت زۆربەباشی مامەڵەتان لەگەڵ دەکات"، هێلین کە گوێی لە دەنگی حەیدەر بوو خەریک بوو شێتوهار بێت، بیری لە قسەکانی گوڵیزار کردەوە کە پێیانیوتبوو بابیکوژین، هەربۆیە ئێستا هێلین بەخۆی دەووت خۆزگە ئەوەمان بکردایە، ڕۆدی لەخەفەتدا نەیدەزانی چیبکات، ڕۆدی وتی "هەناسە هەڵکێشان لەگەڵ ئەم جۆرە مرۆڤانە خۆیلەخۆیدا حەرامە". ئەم گەریلایانەی ئێرە یەکەمجاریان نەبوو کە ڕوبەڕووی خیانەت ببونەوە، بەڵام یەکەمجاریان بوو کە بەم شێوەیە تەوقکرابێتن، هێشتا لەیەخەی خەم و خەفەتی دەنگی حەیدەر ڕزگاریان نەبووبوو ئەمجارە دەنگێکی تر بەنجیانی کرد، دەنگێک وتی "من عەلی موسام، لەناوتاندا هێلین من باش دەناسێت، من خۆم ڕادەست کرد، ئێستا وەک پاشا نەژیم، ئەوە ناهێنێت کەلەم ئەشکەوتەدا بمرن، بڕوا بە ئەفسەرەکەم بکەن"، ڕۆدی بەم قسانە زۆر توڕەبوو، هەڵپەیەکی کرد و ویستی هەڵسێت، بەڵام هێلین قۆڵی گرت، هێلین پێیووت "هەڵمەسە سەرڕێ، ئەگەر بەم شێوەیە لەم سوچە بمێنینەوە فیشەک نامانگرێتەوە بێگومان جگەلە ئاربێجی و ڕوومانە"، ڕۆدی بە قسەی هێلینی کرد، بەڵام بێ ئۆقرەبوو، نەیدەزانی چیبکات، دڵی ترپەترپی بوو هەموو لەشی دەلەرزین، هەموویان لەوە دڵنیابوون کە دەمرن، بەڵام ڕۆدی ئەم پرسیارەی لەخۆی کرد باشە مردنێکی چۆن؟ دەبێت بە فیشەکی دوژمن بمرین یان بە فیشەکی خۆمان؟ ئەوەندە هیلاک و برسی و نیگەران ببوو کە ئیتر نەیدەتوانی وەڵامی ئەم پرسیارەی خۆیشی بداتەوە، گەنجترین گەریلای ناویان عیسمەت بوو خۆی خستبووە پشت هێلینەوە، تەماشای هەڤاڵەکانی دەکرد، ئەویش لەماوەیەکی زۆرکەمدا ڕوبەڕووی ئەو ئازار و ئەهامەتیانە ببۆوە کەلە خۆی گەورەتر بوون، ئەو ڕوبەڕووی دڕندەترین مەرگەسات ببۆوە، ئێستا بە چاوێکی

پڕ لە ترس و مەراقەوە لە ڕۆدی و هێلینی دەڕوانی، دەستی خۆی درێژ کردە سەر شانی هێلین، کە هێلین تەماشای کرد کە ئەو دەموچاوە زەرد هەڵگەڕاوەی عیسمەتی بینی لە تەماشاکردنەکەی پەشیمان بۆوە، عیسمەت لێی پرسی "هەمووومان ئەمرین؟ "هێلینیش بەبێ هیچ دوودڵییەک پێیووت "بەڵێ ئەمرین "، دەستبەجێ هەستی بە پەشیمانی کرد کە بەو شێوە ڕەقییە وەڵامی عیسمەتی داوەتەوە، هێلین ڕاهاتبوو لەوەی کەچی لەسەر زاری بێت بیدرکێنێت هەربۆیە بەوشێوە دەنگ بەرزییە وەڵامی عیسمەتی دایەوە، لەوەدەچوو عیسمەت قەناعەتی بە قسەکانی هێلین هێنابێت هەربۆیە قسەی تری نەکردەوە، هێلین بیری لەوەدەکردەوە کە نەدەبوایە لەم دوا ساتی مەرگەدا بەو شێوەیە قسەی بکردایە و لەجیاتی دڵدانەوە کەچی قسەیەکی هێنابووە زمان کە هەموو ئاوێنەی هیواکانی ورد و خاشکردبوو، هێلین دەیتوانی کەمێک میهرەبانەتر وەڵامی بدایەتەوە، جارێکی تر بە عیسمەتی وتەوە "ئایا ڕێگەیەکی ترمان هەیە، یان دەمرین یان خۆمان ڕادەست دەکەین "، کە عیسمەت هەستی کرد هێلین دەیەوێت دڵی بداتەوە هەستی بە شەرمەزاری کرد، عیسمەت وتی "کێ بیر لە ڕادەست بوون دەکاتەوە؟ لەجیاتی یەکجار ڕادەست بوون بە دوژمن ئامادەم هەزارجار بمرم "، ئەم هەڵوێستە چاونەترساوەی عیسمەت هێلینی بەختەوەر کرد، بەخەندەیەکەوە لێی ڕوانی، ئەفسەرەکە لەدەرەوە جارێکی تر هاواری کردەوە و وتی "هەتا ٣ دەژمێرم، ئەگەر خۆتان ڕادەست نەکەن تەقە دەکەین، ١ و ٢ و ٣ ".

لە چرکەیەکدا سەدان فیشەک نرا بە ئەشکەوتەکەوە، ئەو فیشەکانەی دەهاتنە ناو ئەشکەوتەکە و بەر ئەملاوئەولای دیوارەکان دەکەوتن تۆزێکی زۆریان درووست دەکرد، ئەو پارچانەی لە دیوارەکانەوە پەرش و بڵاو دەبونەوە لەگەڵ فیشەکدا هیچ جیاوازییەکیان نەبوو، گەریلاکان بۆپاراستنی خۆیان دەستیان بەسەریانەوە گرتبوو، زیاتر دەیانویست لە پارچە بەرد خۆیان بپارێزن، دوای ماوەیەک تەقەکردن ڕاوەستا و جارێکی تر گوێیان لە دەنگی ئەفسەرەکە بۆوە و وتی "بۆدواجار بانگەوازیتان بۆدەکەم، خۆتان ڕادەست کەن، ڕزگاربوونتان مەحاڵە "، ئەمجارەیان ڕۆدی نەیهێشت ئەفسەرەکە

درێژەی پێبدا کەوتە تەقە کردن، فیشەکەکان نەدەگەیشتنە هەدەفەکانی خۆیان، لەبەرئەوەی ڕۆدی بە درێژ بونەوە تەقەی دەکرد فیشەکەکانی دەنا بە ئاسمان و گردەکانی بەرامبەریان، بەڵام ئەو بەخەیاڵی خۆی گوایە تەقە لە دوژمن دەکات، ئەمە نیشانەی ئەوەبوو کە خۆیان ڕادەست ناکەن، سەربازەکان دەستیان کردەوە بە تەقە کردن، ماوەی کاتژمێرێک ڕەوشەکەیان بەم شێوەیە بەردەوام بوو، بێدەنگییەک هاتە ئاراوە.

هێلین وتی "لەوانەیە ئەمجارە شێوازی هێرش ئەنجام بدەن"، ڕۆدیش وتی "وەکو چۆن؟ "هێلینیش وتی "لەوانەیە ڕوومانە فڕێدەنە ژوورەوە، پێویستە یەک دوو هەڤاڵێک لەبەردەم دەمی ئەشکەوتەکە سەنگەر بگرێت بۆئەوەی ڕێگریان لێبکەن"، ڕۆدی بە سکەخشکێ خۆی گەیاندە نزیک دەمی ئەشکەوتەکە، لەدیواری نزیک دەمی ئەشکەوتەکە کونێکی بچووک هەبوو کە کەسێک دەیتوانی بە چوارمشقی لێی دانیشێت، ڕۆدی خۆی کرد بەوێدا، بەشێنەیی سەری هەڵبڕی و تەماشای خوارەوەی کرد، کەسی نەدی، ئایا دەبێت لەکوێوە تەقە بکەن؟ تەماشای هەورازەکەی بەرامبەریانی کرد بینی کەسانێک ئەجوڵێنەوە، ڕۆدی نەیدەتوانی زێیەکەی خوارووی ئەشکەوتەکە ببینێت، هێلین هاواری بۆکرد "هیچت لێوەدیارە؟ "ڕۆدیش وتی "لەهەمبەرمانن، لە هەورازەکەی بەرمانەوە تەقە دەکەن، بەڵام زێیەکەم لێوەدیار نییە"، هێلینیش وتی "بۆئەوەی ڕوومانە بخەنە ئەشکەوتەوە لە زێیەکەوە سەردەکەون، وریای ئەوێ بە"، ڕۆدیش وتی "باشە"، ڕۆدی جارێکی تر تەماشای هەورازەکەی ئەوبەری کردەوە، ٦ بۆ ٧ سەربازێک بەڕیز ئاربێجی و چەکی بازووکەیان پێبوو، نیشانیان لە ئەشکەوتەکە گرتبۆوە، ڕۆدی هاواری لە هەڤاڵەکانی کرد و پێیووتن "کەستان سەری خۆی بەرز نەکاتەوە سەرتان دانەوێنن"، یەکەم گوللە ئاربێجی دای لە ژێر کوونی ئەشکەوتەکە، دووەمیشیان دای لە بەردەکانی سەرووی کوونەکە ئەشکەوتەکە، تەنانەت ناو ئەشکەوتەکەش بەهۆی دەنگی ئاربێجێکانەوە کاس ببوو، سێیەمین گوللە ئاربێجی ڕێکخۆی کرد بەناو ئەشکەوتەکەدا و ئینفلاقی کرد، تەنانەت چەکی بازوکەشیان گرتە ناو ئەشکەوتەکەوە، پارچە بەردێکی زۆر پەرش و بڵاوبۆوە، چەند پارچە

بەردێک کەوتە سەر گوڵێزار، گوڵێزار شڵەژابوو، دوای ماوەیەکی کەمی تر گوللە ئاربێجییەکی تر لەناو ئەشکەوتەکە تەقییەوە، دیوارەکانی ئەشکەوتەکە بەردەکانی بە هەموو ناو ئەشکەوتەکە بڵاوبۆوە، دوایش گوللەیەکی تری بازووکەیان پێوەنان پاشان بە چەکی گران تەقەیان کرد لەناو ئەشکەوتەکە، ناو ئەشکەوتەکە بوو بە پارچەیەک ئاگر.

هەندێکیان لەبەرئەوەی جلوبەرگەکانیان ئاگریان گرتبوو هەستابوونە سەرپێ، چەندین گوللەی تری ئاربێجی و لاڤیان لەناو ئەشکەوتەکەدا یەک لەدوای یەک دەتەقینەوە، ناو ئەشکەوتەکە وەک دۆزەخی لێهات، هاوار و کۆکین لەناو ئەشکەوتەکە هاتە ئاراوە، چەند ڕوومانەیەکیان خستە ناو ئەشکەوتەکەوە، ڕۆدی بەچاوی خۆی دەبینی کە ڕوومانە دەخەنە ناو ئەشکەوتەکەوە، بەڵام نەیدەتوانی ڕێگری بکات، ڕوومانەکان یەک لەدوای یەک لەناو ئەشکەوتەکە دەتەقینەوە، ماوەیەک بێدەنگی هاتە ئاراوە، دووکەڵ پەیتا، پەیتا دەرەوینەوە، ڕۆدی لە شوێنەکەی خۆیەوە بەسکە خشکێ خۆی گەیاندە لای هەڤاڵەکانی، گوڵێزار سوتابوو دووکەڵی لێبەرز دەبۆوە، جلوبەرگەکانی ئاگریان گرتبوو، ڕۆدی بە چاکەتەکەی خەریکی کوژانەوەی ئاگری جلوبەرگی گوڵێزار بوو، ڕۆدی نەیتوانی لەوە زیاتر تەماشای جستە پارچەبۆکەی گوڵێزار بکات، سکی هێلین ببوو بە دوو بەشەوە، لەلای هێلینەوە عیسمەتیش دەسوتا، نەیتوانی تەماشای ئەوانی تر بکات، هەستایە سەرپێ، ڕوومانەکانی قەدی خۆی کردەوە، پیمەکانی ڕاکێشان و بەرەو ڕووی کوونی ئەشکەوتەکە کەوتە ڕێ، ڕوومانەکانی خستەسەر سنگی و پیمەکانی ناو دەستی شلکردەوە و چاوەکانی نوقاند.

هەڤاڵ ڕۆژینیان کەلە دەرەوەی ئەشکەوتەکە مابۆوە بە قاچە شەلەکەیەوە هێشتا بەردەوام ڕێیدەکرد، حەیدەر و عەلی موسای بە چاوەکانی خۆی بینی بوو، بەدەم ڕێکردنەوە فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتنە خوارێ.

٣٠

ئاریا و ساریا ماوەی ٣٥ ڕۆژ بوو بە برسێتی مابونەوە، هەموو ڕۆژێک لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا ئومێدەکانیان سەوز دەبۆوە، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت تیشکی ئومێدیان جارێکی تر نەدەما و دونیایان دەبووە تاریکستان، چەندین ڕۆژ بەسەر چووبوو، بەڵام هێشتا ئازار و مەینەتی یەخەیانی بەرنەدابوو، کاتی بەیانیان هەتا ئێوارەیان وەک پارچەیەک لە مردنیانی لێهاتبوو، لەهەر ساتێکیاندا ئومێدەکانیان وەکو هەڵمی سەر ئاو لەبەرچاویان نەدەما، ئازاری و مەینەتی ئەم ٣٥ ڕۆژەیان شوێنی ئازار و مەینەتی هەموو ژیانیانی گرتبۆوە، ئیتر مردن وەک ترس نەدەهاتە بەرچاو بەڵکو ببوو بە مایەی ڕزگاری و ئاسودەیی. بۆئەوان دەستپێکی ژیان و ڕۆژێکی نوێ لەئارادا نەبوو بەڵکو ئێستا ژیان بۆئەوان تەنها پێکهاتبوو لە ئازارێکی ڕووتەڵە و هیچی تر.

دڵتەنگی ئێوارەیان بۆ ساریا ببوو بە مایەی فرمێسک ڕشتن جگە لە بەزەیی بەخۆهاتنەوە هیچی تری بە خۆی نەدەبەخشی، هەتا لەناو ئازاردا خۆی گرمۆڵە بکرادایە و دانبەخۆنەگرتن لەئاستی برسێتی شەکەتی بکردایە هەموو ئەم بەزەیی بە خۆبونەوە دەبوو بە ڕق و قین، ساریا وایلێهاتبوو کە نەیدەتوانی خۆی درێژ بکات و دابنیشێت، لەهەموو شتێک زیاتر بەهۆی سەرئێشە زۆرەکەیەوە هیچ حەوسەڵەی نەمابوو، بەردەوام دەیووت "بەشی چەپی سەرم ڕچیوە". هەندێکجار کەبە پێوە دەبوو چاوی ڕێشکەوپێشکەی دەکرد و ناچاردەما کە دانیشێت، لەم دوا ڕۆژانەدا چەندینجار خوێنی هەڵهێنابۆوە.

کاتێک ئاریا ساریای دەبینی کەلە مردن نزیک بۆتۆتەوە خەریک بوو شێت و هار ببێت، ئەو لەچاو ساریا ڕەوشی باشتر بوو، ئەو هێشتا ئەو هێز و توانایەی تیامابوو کە بتوانێت بچێت بۆ زێیەکە ئاو بهێنێت، ساریا دەیووت کە برسێتی لە دەرگای مەرگی داوە ئاریاش هەمیشە پێی دەووت کە مردن لێیانەوە دوورە و چالاکی مانگرتن لەخواردنی هەتا مردنی بە نمونە دەهێنایەوە، هەرچییەکی بکردایە ئاریا نەیدەتوانی قەناعەت بە ساریا بکات.

ئەمڕۆ لە هەموو ڕۆژەکانی تریان خۆشتر بوو، تیشکی گەرمی خۆر ئەگەر بۆ ئەبزەیەکیش بێت بەدەنە برسێکەیانی کە سەرمای لێدەچۆڕی گەرم

دەکردەوە، ساریا ڕووی خۆی دەکردە بەرخۆرەکە و چەندین کاتژمێر بەو شێوەیە دەمایەوە، دەیویست لەسایەی تیشکی گەرمی ئەم خۆرەوە بەستەڵەکی سەرما و برسێتی ناو لەشی بتوێنێتەوە، تەنانەت تیشکی خۆریش دەیزانی کە ڕووخساریان ڕەنگی مردوییان گرتووە، ئاریا وەکو پیشەی هەموو بەیانییەکی سەری لە شوێنەکەی خۆیەوە دەرهێنا و کەوتە تەماشاکردنی کەمپەکەیان، هیچ جموجۆڵێکی لە کەمپەکەوە هەست پێنەکرد، چەندین ڕۆژ بوو هیچ جموجۆڵێک لە کەمپەکەیانەوە بەدی نەدەکرا، ئەمەش مانای ئەوەبوو کە دوژمن پاشەکشێیان کردووە، ئەمەش مایەی خۆشحاڵی ئەوان بوو، لە دەربەندی عەلی کەشوهەوایەکی زۆر خۆش لەئارادابوو کە مرۆڤ ئاسودە دەکرد، هەموولایەک دەدرەوشایەوە و هەموولایەک سەوز بوو، پێناسەی هەموو ئەمانەش ئەوەبوو کە ئیتر ڕزگاریان بووە.

ئاریا دەیزانی کەلە کەمپەکە ئازوقەی شاراوە هەیە، بەڵام لەبارەی شوێنی عەمبارەکەیانەوە هیچ زانیارییەکی نەبوو، سەرەڕای ئەمەش شانسی خۆی تاقی دەکردەوە، ئەگەر بیتوانایە بچێتە ئەوبەری ئاوەکەوە لەوانەبوو زۆر کێشەیان چارەسەر بوایە.

ئاریا بە سارپای وت:

"کەمپەکە زۆر کشوماتە".

"بەڵێ زۆر کشوماتە"

"بچینە ئاوبەری ئاوەکەوە؟"

ساریا وەڵامی نەدایەوە، بە جوڵانەوەی لچ و لێوەکانی نیشانیدا کە دەیەوێت بڵێت نازانم، ئاریا وتی:

"ئەگەر بچینە ئەوبەری ئاوەکەوە لەوانەیە عەمباری ئازوقە بدۆزینەوە".

ساریا پێکەنی، ددانە برینجێکەی بەدەرکەوتن، گۆشتی کەناری ددانەکانی مۆر ببونەوە، ئەوکاتەی پێدەکەنی خەت دەکەوتە دەموچاوێوەی، لەکەسێکی بەتەمەنی دەکرد، کە ساریا هەستی کرد ئاریا لە دەموچاوی ورد دەبێتەوە پاشان پێیووت:

"دەی بابڕۆین".

ساریا بۆئەوەی لە شوێنەکەی خۆی هەڵسێت دەستی بۆ ئاریا درێژ کرد، هێواش، هێواش قیتبۆوە، دەیزانی کە چاوی ڕەشکەوپێشکە دەکات و مەعیدەی بەیەکدا دێت و سەریشی دەخولایەوە، کاتێک بالانسی خۆیشی وەرگرت و هەستایە سەرپێ چاوەکانی داخستن و خۆی گرت بە ئاریاوە، ساریا چاوەکانی ڕێشکەوپێشکەی کردوو دەستی بە ئاریاوە گرتەوە، چاوەکانی نوقاند، دوای ماوەیەکی کورت هەستی کرد کە باشترە پاشان چاوەکانی کردەوە، ئاریا لێی پرسی:

"باشتریت؟"

"بەڵێ باشم".

"مەراق مەکە بەهۆی زەختەوەیە".

لە شوێنەکەی خۆیان دەرچوون کە چاڵێک بوو، چەند هەنگاوێکیان نا، بەڵام ساریا وەستایەوە، هێز و توانای نەبوو کە بە پێوە خۆی ڕاگرێت، بە شێنەیی و بە ترسەوە هەنگاوی نایەوە، لەوە دەترسا کەلە لێژایەکە بکەوێتە خوارەوە، قۆڵی ئاریای دەگرت، کە گەیشتنە چێشتخانە کۆنەکەیان ساریا دانیشت، هەناسە بڕکێی بوو، بەهۆی ئاربێجێکەی عەلی موساوە چێشتخانەکە وێران ببوو، چادرەکەیان سوتابوو، جاڵجاڵۆکە لە دەمێکەوەبوو ماڵی خۆیان درووست کردبوو، ئاریا چوو بۆ زێیەکە و دەموچاوی شۆری و ناودەمی تەڕ کرد، گەڕایەوە بۆلای ساریا، ساریا کەوتبووە سەر ئەژنۆ ئەملاوئەولای دەکرد، دەستی لەزەوی دەخشاند، دیاربوو بە شوێن شتێکدا دەگەڕا، چەند پارچەیەک نانە ڕەقی دۆزیەوە، خستییە ناو مشتێوەی، تەماشای ئاریای کرد، کاتێک بینی ئاریا تەماشای دەکات پێکەنی، ساریا نانە ڕەقەکەی نیشان ئاریاداو پێیووت "هەرئەوەندەیە"، دوایش دەستی لار کردەوە و پارچە نانە ڕەقەکەی فڕێدا.

ئەم ڕەوشانەی ساریا خەفەتی بە ئاریا دەدا، ئاریا بە خۆی وت خۆزگە نەیبینیایە کە لێی دەڕوانم، ئاریا پێیوابوو کە بووە بە مایەی شەرمکردنی، کاتێک ئاریا ماوەیەک ساریای بەو شێوە غەمگینە بینی خۆی پێڕانەگیراو چووە لایەوە، ساریا سەری شۆڕکردبۆوە، ئاریا بەدەستەکانی سەری ساریای بەلای

خۆیدا وەرگێڕا و سارپاش چاوەکانی داخست، چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک، ئاریا پێی نەووت کە بۆچی دەگریت، هەرکاتێک ساریای ببینیایە دەگری دڵی پێ دەسوتا.

ئاریا هیچی لەدەست نەدەهات، پێیووت:

"بڕوانە سەرباز لە کەمپەکە نەماون، مادام سەرباز نێرەیان چۆڵکرد هەڤاڵانیش دەگەڕێنەوە".

ساریا سەری هەڵبڕی و تەماشای ئاریای کرد، ساریا پێوەی دەیاربوو کە تورە بوو چونکە دەموچاوی بەیەک دابوو، بە تورەبونێکەوە وتی:

"ئاخر لەبەر ئەو هۆیەیە کە من دەگریم!"

ئاریا لە مەبەستی ساریا حاڵی نەبوو هەربۆیە پێیووت:

"من هیچم نەووتووە".

"من ناگریم لەبەرئەوەی کە برسیم من لەبەرئەوە دەگریم کە دەترسم بەسەر برسێتیدا زاڵ نەبم و غروورم بشکێت و لە تێڕوانینەکانی تۆش حەز ناکەم".

"من هیچ حاڵی نەبووم؟!"

"وازم لێبێنە چۆن بیردەکەیتەوە بیر بکەرەوە!"

"من بیر لە هیچ ناکەمەوە هیچ هەڵەم کردووە؟"

"دەزانی من لەچی زۆر تورە دەبم؟"

ئاریا وەڵامی نەدایەوە، هەردوو گوێی گرت بۆ ئەو قسانەی کە ساریا دەیویست بیکات، ساریا وتی:

"ئەوەی من تورە دەکات ئەو مرۆڤانەن کەبە چاوی خۆیان لە مرۆڤەکانی تر دەڕوانن، دەپرسن فلان کەست پێچۆنە ئەویش دەڵێت هەروەکو خۆمە، ئەمە ناعەدالەتیە کە مرۆڤ وەک خۆت ببینیت!"

"باشە ئێستا تۆپێتوایە کە من بە چاوکردن لە خۆمەوە تۆ هەڵدەسەنگێنم؟

"

"بەڵێ، ٣٥ ڕۆژە بەیەکەوەین بەردەوام لە چاوەکانت دەڕوانم، بەردەوام ویستت لاوازێکانم دەستنیشان بکەیت، هەمیشە خۆتت بەتواناتر نیشانداوە،

لەوانەیە شەرمت لە من کردبێت، تۆ ئەو هەستەت لەلا درووست بوو کە من ناتوانم بەرگری لە بەهاکانی خۆم بکەم، ئەوە بزانە من ئەوەندە لاواز نیم وەک تۆ بیری لێدەکەیتەوە!"

ئاریا تاسا بوو، بیری کردەوە تۆ بڵێی قسەکانی ساریا ڕاست بن؟ هیچی نەهاتەوە خەیاڵ کە کارێکی کردبێت کە ساریای پێ ڕوشاندبێت، ئەی ئایا ئەبێ چی کردبێت کە ساریا ئەوەندە لێی داخ لەدڵ بوو؟ هەرچییەکی کرد ئەمەی بۆ ئاشکرا نەکرا، دەبوایە هەر هیچ نەبوایە پێی بووتایە کە بە هەڵەدا چووە و بەو شێوەیە لەبارەیەوە بیرناکاتەوە، بەڵام چۆن؟ ئەگەر زیاد قسەی بکردایە لەوانەبوو زیاتر ساریای پێ توڕە بکات، هەربۆیە دەبێت بە دیقەتەوە قسەکانی بکات، ئاریا پێیووت:

"بڕوانە ئەم ئازارانەمان دڵی تۆیان ناسک کردووە، من هەرگیز لەبارەی تۆوە بەو شێوەیە بیرم نەکردۆتەوە، هەرگیز شتیوا بە خەیاڵمدا نەهاتووە".

ساریاش بە خەندەیەکی زۆرەملێ پێیووت:

"باشە، من ئەوەندەی تۆ بەهێز نیم، بەڵام لەدڵمدا چی هەبێت هێنامە زمان، پێم وتی کە بیر لە مردن دەکەمەوە، ئەوکاتانەی بێ حەوسەڵە دەمامەوە یان دەگریام دەردی دڵی خۆمم بۆتۆ دەڕشت، کەچی تۆ لەم هەموو شتانەدا تەنها ئەوەی منت لێوەدیار بوو خۆتت لەبیرچۆتۆتەوە کەتۆش وەکو من وایت، دەتەوێت لەئاستی مندا لاوازێکانی خۆت بشاریتەوە و خۆت وەک ئازا نیشان بدەیت".

ئاریا بە توڕەبونێکەوە وتی:

"ئەمە چییە، چۆن وابیر دەکەیتەوە، ئەمەت لەکوێ هێنا؟"

"چاوەکانت وادەڵێن!"

ئاریا بە توڕەبونێکەوە لە شوێنەکەی خۆی هەڵسا، گەڕایەوە بۆسەر زێیەکە، لەوەدەترسا کەبەسەر توڕەبونەکەیدا زاڵ نەبێت، دەموچاوی شۆری و ئاوی خواردەوە و جارێکی تر گەڕایەوە بۆلای ساریا، ئاریا پێیووت:

"بابچین بۆ ئەشکەوتی جنۆکەکان".

ساریا بە نارەحەتییەکەوە لە شوێنی خۆی قیت بۆوە، سەری سوڕی

دەخوارد، دەستی گرت بەسەر بەردێکدا، ئاریا وتی "دەتوانیت لە ئاوەکە بپەڕێتەوە؟ "سارباش وتی "بەڵێ "، ئاریا جانتاکانی کردە شان و چووە ئاوەکەوە. ئاوەکە هەتا ئەژنۆیان دەهات، ئەو پردەی بە داری شۆرەبی دروستکرابوو بۆ پەڕینەوە بۆ چێشتخانەکەیان لەلایەن سەربازەکانەوە تێکدرابوو. چەند هەنگاوێکیان نا، هەموو بەدەنیان هەستی بە ساردی ئاوەکە دەکرد، دوای چەند هەنگاوێک پێی لەسەر بەردێکی ژێر ئاوەکە خزا و بەلادا کەوت، هەردوو جانتاکەی لەدەست کەوت و ئاو بردیانی، ساریا بەو حاڵە خراپەی خۆیەوە بەرەو ئاریا ڕایکرد، پێش ئەوەی ساریا پێی بگات ئاریا هەستابۆوە سەرپێ، ساریا پێیووت "وریای خۆت بە "، ئاریاش وتی "باشە، کتێبە ڕۆمانەکەمان لەدەست چوو من خەفەتی ئەوە ئەخۆم "، ئەو کتێبەی کە هەتا بەشی چوارەمیان خوێندبۆوە لەدەستیان کەوت و ئاوەکە لەگەڵ خۆیدا بردی، دەستی یەکیان گرتوو چوونە ئەوبەرەوە، ئاوەکە تین و گریانی هێنابووە سەر خۆی، بەرەو ئەشکەوتی جنۆکەکان کەوتنە ڕێ، هەرکەچوونە ئەشکەوتەکەوە زۆر خەفەتیان خوارد لەبەرئەوەی ئەو هەموو شتە جوانانەی کە بۆ خوێندنگەکەیان کردوبویان سەربازەکان هەموویان تێکدابوو، سەکۆی دانیشتنەکانیان بەتەواوەتی شکێندرابوو، ساریا بە ئاریای وت کە دەتوانێت بەکارکردنی چەند ڕۆژێک کەمپەکە وەک خۆی لێبکرێتەوە، ئاریا بەم قسانەی ساریا دڵخۆش بوو ئەمەش ئەوەی نیشان دەدا کە ساریا هیوای بەژیان ماوە، ساریا لەسەر سەکۆیەکی شکاو خۆی درێژ کرد، ئاریاش بەناو ئەشکەوتەکەدا ئەگەڕا، هەتا دوا شوێنی ئەشکەوتەکە چوو کە بۆ خوارەوە شۆڕدەبۆوە، گەیشتە ئەو شوێنەی کە زۆر بە نهێنیانە جگەرەیان لێدەکێشا، کە نایلۆنە دڕاوەکەی هەڵدایەوە چاوی بە کۆمەڵێ زبڵ کەوت، کاغەزی بەرماوەی چوکولاتە و پارچە ڕۆژنامە و قوتوی بەتاڵی خواردن، دیاربوو کە سەربازەکان لێرەدا خواردنێکی زۆری قوتویان خواردبوو، هاتە دەرەوە، لەبەردەم خوێندنگەکەیاندا ئارد و برنج و نۆکی هەڵرێژراوی بینی، هەموویان بەسەریەکدا تێکەڵ و پێکەڵ کردبوو هەروەها ئاگریان تێبەردابوو، ئاریا بە چڵی دارێک کەوتە بژارکردنیان، لەژێرەوە برنجی بینی کە نەسوتابوو، مشتی

لێپڕ کرد و گەڕایەوە لایساریا.

ئاریا پێیووت "بەم برنجە ئیدارە دەکەین، بەیانیش بە کەمپەکەدا دەگەڕێین بۆ دۆزینەوەی عەمبارەکەمان"، بەدرێژایی ڕۆژ هیچ قسەیان نەکرد، ئێوارە کە تاریک داهات و ویستیان کە بخەون، بەڵام لەڕاستیدا خەویان نەدەهات، ساریا ڕووی کردە ئاریا کەلە پەنایەک پاڵ کەوتبوو، ساریا پێیووت:

"لەبەرئەوەی ناهەقیم کرد..".

"گوێی مەدەرێ".

ساریا خۆی قیتکردەوە پێیووت:

"نەخێر وامەڵێ، لەهەمبەرت ناهەقیم کرد".

"باشە حاڵی بووم، زۆر گوێی مەدەرێ".

"پێشوتر کتێبێکم خوێندبۆوە، لە بەشێکیدا دەیووت کەسانی مەزن بۆخۆیان ناڕەحەتی درووست دەکەن، کەسانی لاوازیش ناڕەحەتی بۆخەڵکی درووست دەکەن"، ئاریا بە توڕەبونێکەوە خۆی قیتکردەوە، کە ساریا ئاریای بەم شێوەیە بینی خۆی درێژ کردەوە و پشتی کردەوە ئاریا، ئاریا پێیووت:

"باش گوێم لێبگرە، جارێکی تر باسی ئەم مەسەلانە ناکەینەوە".

ساریا هیچ وەڵامی نەدایەوە، چاوەکانی داخست، بیری لە داخوازی و خواستەکانی بەیانی دەکردەوە و ئاریاش خەوی لێکەوت.

# ٢١

لەژێر باراندا تەڕ ببوو، لەدارە سەوزەکانەوە بۆن و بەرامی بەهار دەکات، دیمەنە جوانەکانی ئەم سرووشتە کێویانە دڵی مرۆڤی ئاسودە دەکرد، دارەکان تازە خونچەیان کردبوو، پۆلە باڵندەکان بەسەر گردەکان و دارەکان و چیاکاندا دەفڕین ئەم دیمەنە دڵرفێنانە لەوەدەچوو کە بە ئەنقەست بۆ نەهێشتنی ئاسەواری کۆن خوڵقێنرابێنەوە.

کاروبارەکانی شاهین بەباشی دەچوون بەڕێوە، هەستی بە ئاسودەیی دەکرد، سیانی لەو هێسترانە دۆزیبۆوە کەبە دوایاندا گەڕابوو، لەمێژەوەبوو

ئەشیاکانی لێبارکردبوون و کەوتبووە ڕێ، گرووپەکەی لە ٥ گەریلا پێکهاتبوو، هەر پێنجیشیان نانی باشیان خواردبوو، حامیدۆ لەدوای گرووپەکەوە بوو شاهینیش لەناوەڕاستدا، ئۆزان و سولەیمانیش پێشڕەویان دەکرد، ماوەیەکی زۆربوو هێسترەکانیان ئیسراحەتێکی باشیان کردبوو هەربۆیە ئێستا زۆربەباشی ڕێیان دەکرد، ئەمەش ئەرکەکانیانی ئاسان کردبۆوە، لەحاڵەتی ماندوبوونی هێسترەکانیاندا هەمیشە کێشە بۆگەریلاکان دەهاتە ئاراوە، ئەگەر هێستر عینادی کرد مەحاڵە بتوانیت هێوری بکەیتەوە، شاهین هەمیشە لە عینادی هێستر دەترسا، بەتایبەتی لە عینادی خۆکوشتنیاندا، ئەوکاتانەی کەباری گرنگ لە هێستر دەبەسترا و ئەگەر لە لێژایی یان لە بەرزایدا هێسترەکە بڕیاری خۆکوشتنی بدایە و خۆی فڕێدایەتە خوارەوە ئەمە کێشەیەکی گەورەبوو بۆ گەریلا، لەبەرئەوەی شاهین شارەزای ئەم خووانەی هێستر بوو بۆیە بەردەوام بە هەڤاڵەکانی دەووت وریا بن زۆر هیلاکیان مەکەن.

ڕێکردنەکەیان نزیک لە شارەوە لە نزیک پێدەشتێکەوە دەستی پێکردبوو، یەکەمین مەنزڵیان گوندی سین بوو، زریپۆشەکانی سەر ڕێگەوبانەکان کێشەی هەرە گەورەیان بوو، لەبەرئەوەی زیاتر بەناو ناوی زنیەکاندا ڕێیان کردبوو، هێشتا ڕوبەڕووی هیچ مەترسیەک نەبوبونەوە، بەڵام ئەگەر بەسەر گردی بەرزیدا هەڵبگژانایە و یان ڕێگەیان لێ هەڵەبوایە و خۆیان بۆ بنکە سەربازێکەی دەشت ئاشکرا بکردایە ئەوە ڕوبەڕووی گەورەترین مەترسی دەبونەوە، دەبوایە بە هیچ شێوەیەک خۆیان بۆ بنکە سەربازێکەی دەشت ئاشکرا نەکردایە، ئەم بنکەیە لەکاتی شۆڕشی سەید ڕەزا ئەرکی سەرکوتکردنی شۆڕشەکەی لەئەستۆ گرتبوو، سەرەڕای ئەوەی کاتێکی باشیان بەسەربردبوو، بەڵام هیچ گۆڕانکارییەک نەهاتبووە ئاراوە، سوپای تورک ئەو هێزانەیان لێرە جێگیرکردبوو کەبەشداری ئۆپەراسیۆنەکەیان کردبوو پاشەکشێیان پێکرابوو، ئەم ناوچەیە زنێ و گرد و گردۆڵکەیەکی زۆری لەیەک چووی هەبوو، بەردەوامکردنی ڕێگە بەبێ ئەوەی ڕێت لێتێکبچێت و ڕێت لێوون نەبێت ئەرکێکی لێزانەیە، شاهین ئەمە یەکەمجاری نەبوو کە بێت بۆ ئێرە، هەموو جارێک ئەوەی لەبیر نەکردبوو بەو هەڤاڵانە بڵێن کە لەگەڵی

هاتبوون، ئەوەی توولە ڕێیەکان ون بکات مانای وایە ڕێگەکان ون دەکات، ئەوەشی ڕێگەکان ون دەکات دەچێتە ناو بارەگای دەشت.

چەندین کاتژمێر بوو بەڕێگەوە بوون، هەتا دەهات ڕێگەشیان درێژ دەبۆوە، چاوساغەکەیان بەکوێدا بڕۆشتایە ئەوانەی دواوەیش بەدوایدا دەچوون، بەهۆی درێژبوونەوەی ڕێگەکەیان شاهین گومانی لەلا درووست بوو، نەیدەتوانی بڕیاربدات کەلەسەر ڕێی ڕاستن یان نا.

دەبوایە بەبێ تەدبیر وەرگرتن گوندی سینیان نەبڕیایە، هەر خیانەتێک یان ئیخبارێک بهاتایەتە ئاراوە هەموو شتێکیان سەروبن دەبوو، سەرەڕای ئەو هەموو نەهامەت و مەترسیانە شاهین نەیدەویست کە ئێستا ببن بە قوربانی خیانەتێک، دەبوایە ئێستا هیچ هەڵەیەک نەهاتایەتە ئاراوە، دەبوایە هەموو شتێک بەگوێرەی ئەوبوایە و بارەکانیان بەسەلامەتی بگەهێندایە بە هەڤاڵان، ئیتر شاهین هیچ هێزی نەمابوو کە تەحەمولی ئازارێکی نوێ بکات و نە سەبریشی مابوو.

گڵۆپەکانی گوندی سین لەوبەر بەقەد گردەکەوە دەدرەوشانەوە، شاهین گرووپەکەی ڕاگرت، دانیشتن، دەبوایە بۆ تێپەڕبوون لە گوندی سین چەندین چەم و گردیان ببڕیایە، شاهین بەبێ ئەوەی گرووپەکە بخاتە ناو دڵەراوکێوە لەبارەی چەند شتێکەوە هۆشداری کردنەوە، سەرەتا پشوویەکی باشیاندا، دوایش کەوتنە ڕێ، ماوەی کاتژمێرێک ڕێیان کرد، لەناکاو چاوساغەکەیان کە ئۆزان بوو ڕاوەستا، شاهین لەدواوە هات و خۆی گەیاندە لای ئۆزان، شاهین لێی پرسی "چی بووە؟ "ئەویش وتی "ئەم ڕێگەیە ئەو ڕێگەیە نییە کە دەبێت بەسەریدا بڕۆین"، شاهین وەک شارەزایەک کۆنترۆڵی ڕێگەکەی کرد، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە ڕێگەکەیان بزنە ڕێ نییە، شاهین وتی "بەڵێ ئەمە بزنە ڕێ نییە "، شاهین بەمە توڕەنەبوو، وەکو ئەوەی شتێکی سادە بێت هەڵسوکەتی کرد، ئۆزان لێی پرسی "چیبکەین؟ "ئۆزان غەمبار بوو چونکە هەرچۆنێک بێت ئەو ڕێگەی ون کردبوو، شاهین وتی "بابەردەوام بین"، جارێکی تر ئۆزان کەوتە پێشیان و گرووپەکەش بەدوایدا، ئۆزان لە ڕێگە وەک ئەوەی بەدوای دەرزی بگەڕێت ئەگەڕا بەدوای توولە ڕێدا، ماوەی کاتژمێرێکیان بەدوای دۆزینەوەی

تووله ڕێ بەسەربرد، سەرەڕای ئەوەی ئەگەڕان بەدوای تووله ڕێدا لەگەڵ ئەمەشدا نەیاندەزانی کە بەرەو کوێ دەچن، نەیاندەزانی کە کامە ڕێ لەکوێ تەواو دەبێت و دێتە کوێ، هەر زێیەک دەهاتە پێشیان تێکەڵی زێیەکی تر دەبوو، گردەکانیش یەک لەدوای یەک زیادیان دەکرد، سەرەڕای هەموو هەوڵیکیان بۆیان دەرکەوت کە سەرلەم مەسەلەیە دەرناکەن، نزیکەی ٤٠ ڕۆژ دوای ئەم ئۆپەراسیۆنە کە تەنها لەبەرخاتری ئازوقە گرووپەکەیان بخرێتە ناو مەترسییەوە، ئەمە بەس بوو کە شاهین شێت و هار بکات، زاتەن بەهۆی ئەو شەهادەتانەی هاتبوونە ئاراوە ئازارێکی زۆری هەبوو، نەیدەویست لەهەمبەر هاتنە ئاراوەی ڕووداوی ناخۆشدا خۆی بە بەرپرسیار ببینێت.

لەدوای بڕینی هەر گردێک گردێکی تر دەهات و جارێکی تر گردێکی تر، ئەمەش بەتەواوەتی گرووپەکەی ماندوکردبوو، ئێستاش گردێکی تر لەهەمبەریان قیتببۆوە، دیاربوو بەرچەم ئەم شوێنەی بەدڵ نەبوو مایەی گومانی بوو هەربۆیە داوای لە شاهین کرد کە گرووپەکە ڕابگرێت، شاهینیش گرووپەکەی ڕاگرت، هەموویان بەقەد پاڵەکەدا لێی دانیشتن، شاهین جگەرەیەکی داگیرساند، دوای ئەوەی جگەرەکەی کێشا و بەباشی کوژانێوەی و لەژێر پێیدا بەتەواوەتی پلیقاندێوەی لەناکاو گوێی لە دەنگێک بوو، پێیوابوو کە هەر بە تەنیا خۆی گوێی لە دەنگە کە بووە، هەربۆیە ڕووی کردە بەرچەم و پێیووت "گوێت لە دەنگێک بوو؟ "بەرچەمیش پێیووت "بەڵێ "، شاهین لە شوێنەکەی خۆی فڕکەیەکی کرد، پێیانیوت کە بچنە ئەو دیوی گردەکەوە، شاهین دەیویست بەخێرایی بەسەر گردەکەدا هەڵگژێت و بچێتە ئەو دیو و لەهەمانکاتیشدا ئاوڕی دواوەی دەدایەوە تاکو کۆنترۆڵی هەڤاڵانی بکات، هەندێکیان بەکاوخۆیان سەردەکەوتن، خەریک بوو بگەنە سەر گردەکە و بچنە ئەودیوەوە تۆپێک لەناوەڕاستیاندا تەقییەوە، موشەکەکە بەرکەسیان نەکەوت، بەڵام هێسترێکیان بە بارەکەیەوە بەرەو خوارەوە غلبۆوە، گەریلاکان دوو هێستریان ڕزگارکردبوو هەروەها توانیان خۆیان بگەهێننە ئەودیوی گردەکەوە، بەبێ ڕاوەستان بەرەو گوندی دەرە کەوتنە ڕێ، دوایش لە دەربەندێکدا پشویاندا، هەتا پشویاندا کەسیان لەگەڵ

یەکدا قسەیان نەکردبوو. هەموویان پابەندی ڕێنمایەکەی شاهین ببوون، هەرکەدانیشتن شاهین کۆنترۆڵی یەک بەیەکییانی کرد، کەسیان بریندار نەبوبوو، بەڵام حەمیدۆ چەکەکەی بەدەستەوە نەمابوو، چەکەکەی حەمیدۆ چەکێکی هاکەزایی نەبوو، حەمیدۆ چەکەکەی خۆی خۆشدەویست و ماناو تایبەتمەندییەکی خۆی هەبوو، بەهۆی فیداکاری و چاونەترسی و سەرکەوتنی لە شەڕ و پێکدادانەکاندا وەک خەڵات وەری گرتبوو، بۆ حەمیدۆ لەم دونیایەدا جگە لە چەکەکەی شتێکی بەنرخی تر نەبوو، شەرمی لەخۆی دەکرد کە چەکەکەی لەوێ بەجێهێشتبوو. هەردەبوایە و بەهەر شێوەیەک بێت ڕێگەیەک بدۆزێتەوە بۆهێنانەوەی چەکەکەی، حەمیدۆ نەیدەویست بچێتەوە ناو هەڤاڵانی بەبێ ئەو چەکەی کە خەڵاتیان کردبوو، حەمیدۆ پێیانیوت "ئەگەر ڕێگەم بدەن دەمەوێت بچم چەکەکەم بهێنمەوە"، لە دەنگیدا دیاربوو کە هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، شاهین لە حەمیدۆ حاڵی ببوو، دەبوایە ئەو چەکە لەوێدا نەمێنێتەوە، کاتێک بیریان لەوە دەکردەوە کە چۆن چەکەکە بهێننەوە لەناکاو گوێیان لە تەقینەوەی تۆپێکی تر بوو. زرپۆشەکەی دوژمن هێشتا لە تەقەکردن بەردەوام بوو، هەردوو هێسترەکەیان لە شوێنەکەی خۆیان بەستەوە و گەڕانەوە، ئەمجارەیان شاهین چاوساغیان بوو، حەمیدۆش بەدوایدا بوو. گەیشتنە پشت ئەو گردەی کەبەسەریدا پەڕیبونەوە و تەقینەوەکەی لێهاتبووە ئاراوە، شاهین چاوی بە سێبەرێک کەوت کە بەرەو ڕوویان دەهات، ئەمنیەتی چەکەکەی کردەوە، هەموویان بێدەنگ بوون و نوزەیان نەدەهات، هەتا دەهات سێبەرەکە لێیان نزیک دەبۆوە، کەبەباشی سەرنجی لێدا بینی ئەو هێسترەیە کەلە ئاکامی تۆپەکە لە گردەکەوە غلببۆوە، هەموویان بەمە زۆر بەختەوەر بوون، خەریک بوو لە خۆشیاندا باوەشی پێدابکەن، بارەکەی سەر پشتی هێسترەکە بەلادا هاتبوو. سەرەڕای ئەمەش هێسترەکە بارەکەی بە خشکەخش لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، بەرچەم وتی "من بەمە دەڵێم عیناد"، بارەکەیان بەباشی لەسەر پشتی هێسترەکە بارکردەوە و شاهین هێسترەکەی دایە دەستی ئۆزان، شاهین وتی "ئێوە بڕۆنەوە لای هێسترەکانی تر منیش ماوەیەکی تر دێم"، هەموویان کەوتنە جوڵەوە تەنها

بەرچەم نەبێت، بەرچەم بەکاوخۆی ڕاوەستابوو چاوەڕوانی دەکرد، شاهین پێیووت:

"تۆش بڕۆ".

"من ناڕۆم".

"بۆچی؟"

"ئەی تۆ بۆناڕۆیت؟"

"من دەچم چەکەکەی حەمیدۆ دەهێنمەوە و دەگەڕێمەوە".

"منیش لەگەڵت دێم".

شاهین توڕە بوو، نەیدەتوانی بەرچەم بخاتە ناو ئەو مەترسییەوە، لەهەمانکاتدا باشی دەزانی کە ناڕوات، بەڵام سەرەڕای ئەمەش نەیدەتوانی بەرچەم بخاتە ژێر تەقە و تۆپ و تەقەکانی زرێپۆشەکەوە.

شاهین لێی پرسی:

"بەڕای تۆ هەردووکمان بچین بۆ هەڵگرتنەوەی چەکێک ئەمە کارێکی ڕاستە؟"

«، بەڵام گەڕانی تۆش بەدوای چەکێک کارێکی ڕاست نییە".

"پێت دەڵێم بڕۆ".

"من ناڕۆم".

"ئەمە فەرمانە".

"پابەندی فەرمانەکەت نابم".

"دوامەکەوە و بەخێرایی بڕۆ".

کەمێکی مابوو بگاتە سەر گردەکە ئاوڕێکی دواوەی دایەوە، بینی کە بەرچەم بەدواوەیەتی، شاهین نەچووە ئەودیوی گردەکەوە لەشوێنی خۆی دانیشت، بەرچەمیش دانیشت، شاهین وتی:

"ئەرێ تۆ بەڵایت؟"

"من نا تۆ بەدوای بەڵا دەگەڕێیت، ئەرێ فەرمانده کوا لەپێناو چەکێک ژیانی خۆی ئەخاتە مەترسییەوە؟!"

"باشە ئەی گەریلا دەتوانێت گوێ بۆ فەرمان و ڕێنمایەکانی فەرماندەکەی

نەگرێت؟"

"ئەگەر فەرماندەکەی لەپێناو هیچدا ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە تەنانەت دەستیشی ئەبەسترێتەوە".

شاهین فڕکەیەکی کرد و ویستی پەلاماری بەرچەم بدات، ئەوەندە لێی نزیک بۆوە لەو تاریکییەدا توانی بەتەواوەتی هەموو دەموچاوی ببینێت، شاهین پێیووت:

"ئەگەر نەڕۆیت هەردوو دەستت گرێ دەدەم و بەو دارەوە ئەتبەستمەوە".

ئەمجارەیان بەرچەم وەڵامی نەدایەوە، سۆمای چاوەکانی ئەبریسکانەوە، شاهین نەیدەزانی ئەمانە فرمێسکن یان ئارەقە، هەموویان دەیانزانی کە بەرچەم زۆر دڵناسکە، ئەوکاتەی ڕق و قینەی پیشەخواتەوە دەگری یان بەتەنیا دادەنیشێت، شاهین ئەمجارەیان دەنگی نەرم کردەوە و پێیووت:

"پێویستە ئەم کارە بەبێ هیچ وروژانێک ئەنجام بدەین، ئەوەندە لەسەر داخوازێکانت سوور مەبە".

بەرچەم سەری داگرت و هیچ قسەی نەکرد، شاهین پێیووتەوە:

"ئەوە چییە عاجز بوویت؟"

کە وەڵامی وەرنەگرتەوە شاهین بەسەر لووتکەی گردەکەدا سەرکەوت، کە گەیشتە سەر لووتکەکە بەسکە خشکێ خۆی شۆڕ کردەوە، لەو شوێنەی تۆپەکە لێی تەقیبۆوە شاهین وەک ئەوەی بەدوای دەرزی بگەڕێت وابوو، لەوانەش بوو تەپوتۆز و خۆڵی چاڵی تۆپەکە چەکەکەی حەمیدۆی داپۆشی بێت، کەوتە دەست گێڕان، شاهین لەلایەکەوە بیری لە دۆزینەوەی چەکەکەی حەمیدۆی دەکردەوە و لەلایەکی تریشەوە بیری لە تەقینەوەیەکی ناکاوی تۆپێکی تریش دەکردەوە، لەدڵی خۆیدا دەیووت ئەها ئێستا تۆپێک ئەتەقێتەوە ئێستا یان کەمێکی تر، بەم شێوەیە شاهین بەدوای چەکەکە دەگەڕا.

ئەگەر چەکەکەی بدۆزیایەتەوە ئیتر خەمێکی ئەوتۆی تەقینەوەی تۆپکی نەدەما، بەڵام چاری ناچار بوو خۆی ئەم ڕێگەیەی هەڵبژاردبوو دەبوایە بەبێ چەکەکە نەگەڕێتەوە، هۆکارێکی زۆر هەبوو کە بگەڕێت بەدوای چەکەکەدا، لەوانەبوو خستنە ناو مەترسی ژیانەوە کاری مرۆڤی ژیر نەبێت، بەڵام هەستێک

شاهینی بەرەو ئەم بڕیارە بردبوو، لەوانەش بوو بیری لەوە کردبێتەوە کە مردن تاق بکاتەوە. لەوانەش بوو بێچارەیی یاخود ئاکامی بێچارەیی بوو، لەوانەش بوو ئازارەکانی زۆریان لێکردبێت کە شاهینیان بەرەو ئاقارێکیان بردبێت کە خۆی بڵێ مردن خۆم هاتم باوەشم بۆبکەنەوە.

پشتی لە زریپۆشەکان دەکرد و بەدوای چەکەکەدا ئەگەڕا و دەستی دەبرد بۆ بەردەم و ئەملاوئەولای خۆی. شاهین ژیانی خۆی ڕادەستی قەدەر کردبوو، ئەمە قەدەرێک بوو کەلە نێوان مەرگ و چەکەکەدا بوو، ئەوەی کە شاهینی هێنابوو بۆ ئێرە هەر ناوی قەدەر نەبوو؟ ئەگەر براکەی نەمردایە و بە زۆرە ملێ ناچارنەکرایە کە براژنی خۆی بهێنێت. ئەگەر ئەم هۆکارە نەبوایە لەوانەبوو نەبوایە بە گەریلا، ئایا شاهین پەشیمان بوو لەوەی ببوو بە گەریلا؟ بێگومان نەخێر، چیا و شاخ و داخ و دەشت و گەژ بۆ ئەو تاکە شوێن بوون کە ڕووبەڕووی ڕاستێکانی خۆی تیابێتەوە. شاهین پێیوابوو کە هەموو ئەم هۆکارانە لە ئەنجامی قەدەرەوە هاتونەتە ئاراوە، ئەگەرچی خۆیشی بڵێت باوەڕم بە قەدەریش نییە.

ئەمجارەیان لە دڵی خۆیدا وتی ئەگەر لەماوەی چەند چرکەیەکدا چەکەکە نەدۆزمەوە لەوانەیە تۆپێک ڕێک لەناو دەفەی پشتم بتەقێتەوە. دەنگێک لەناخیدا دەیووت یان چەکەکە بەخێرایی بدۆزەرەوە یان ڕاکە و ئیتر زەخت لە شانسی خۆت مەکە. ئەگەر بە قسەی ئەو دەنگانەی ناو ناخی بکردایە دەبوایە ئەوێی جێبهێشتایە، بەڵام لەهەمانکاتیشدا دەنگێکی تر پێی دەووت هەتا چەکەکە نەدۆزیتەوە ئێرە جێمەهێڵە. لەنێوان هەستی مانەوە و ڕاکردندا گیری خواردبوو.

هەستی کرد کەلە پشتەوە شتێک هەیە. ئایا زریپۆش بوو. ئەگەرچی دەنگێک لەناو تاریکی دەیووت ئاوڕ بدەرەوە ئەم بەقسەی نەکرد. بەڵام خورپەیەکی کرد و لەناکاو ئاوڕی دایەوە. لەبەرتاریکی هیچی نەدەبینی. لەدڵی خۆیدا وتی تۆ بڵێی ترس وایلێکردبێتم کە هەست بە هەموو شتێکی نامۆ بکەم، لەخۆی تووڕە بووبوو، دەستەکانی بۆ دۆزینەوەی چەکەکە خێراتر کرد.

لەناکاو بەرچەم پێیووت "دۆزیمەوە". شاهین تاسا. تەنانەت هەستی بە

هاتنی بەرچەمیش نەکردبوو، ئەویش هەر لە دوورەوە وەک شاهین بەدوای چەکەکە گەڕابوو، شاهین پێیووت "راکە"، بەخێرایی هەردووکیان ڕایان کرد و چوونە ئەودیوی گردەکەوە، لەکەناری زێیەکە پشویاندا، چەکەکە بەدەستی بەرچەمەوە بوو، شاهین بە توڕەبونێکەوە پێیووت:

"من بەتۆم نەووت مەیە".

"بەڵێ وت".

"ئێ؟"

"ئێ و مێی پێناوێت من پێم وتی کەهەر دێم".

شاهین هیچی نەووت، ئەمجارەیان خۆی وەڵامی بەدەستەوە نەمابوو، نەیدەتوانی لەکارەکەی بەرچەم توڕەبێت هەربۆیە لەوە زیاتر هیچی نەووت، بەرچەم ویژدانی ئاسوودە بوو، نەیدەتوانی تەحەمولی شەهید بوونی شاهین بکات، ئەگەر لەوێ شەهیدبوایە دوای ئەو هەموو ئازارە ژیانکردنی هیچ واتایەکی نەدەما، هەمان هەست شاهینیشی گرتبۆوە، لەهەمانکاتدا هەردووکیان نەیاندەویست کە هەستەکانیان بدرکێنن، لەبەرئەوەی دەیانزانی کە هەڤاڵەکانیان چاوەڕێیان دەکەن کەوتنەوە ڕێ، کاتێک حەمیدۆ چەکەکەی بەدەست کەوتەوە وەک ئەوە وابوو هەموو دونیا هی ئەوبێت، ئەگەر لەترسی شاهین نەبوایە حەمیدۆ لەوێدا دادەنیشت و چەکەکەی پاکدەکردەوە.

دەمەوبەیانی لە شوێنێکی بەردەڵاندا گیرسانەوە، شاهین بە دووربینەکەی چاوی بە چواردەوری خۆی گێڕا، تازە بە تازە بۆی دەرکەوت کە گەیشتونەتە کوێ، بەخۆی وت باشە هەر کە تاریک داهات بە دوو کاتژمێرێک دەگەینەوە شوێنی خۆمان، بەنۆبە کەوتنە ئێشکگری، هەر کاتژمێرێک ئێشکگریان دەگۆڕی، هەتا ئێوارە بەلای کەمەوە هەریەکەیان ٢ جارێک ئێشکگریان کرد، لەژێر گابەردێکدا کە ڕێگەوبانەکانی بەباشی لێوەدیار بوو ئێشکگریان دەگرت، لێرەوە شوێنێکی خۆشی نەبوو کە تەماشای دیمەنە جوانەکانی هاتنی بەهار بکەیت، بەرچەم هەتا کاتژمێر ٥ دووجار ئێشکی گرتبوو، هەموو سرووشت بەهاتنی بەهار سەرلەنوێ دەژیانەوە، باڵندەکان مەست ببوون، دارەکان چرۆیان گرتبوو، چیاکان سەوز هەڵگەڕابوون، گژ و گیا سەری

خۆیان دەرهێنابوو، ناوەکان شێتانە خوڕەیان دەهات، تەنها سرووشت نا بەڵکو مرۆڤایەتیش لەگەڵ هاتنی بەهاردا خۆیان نوێ دەکەنەوە، گڕ و تینێکی نیلاهی دەچێتە ناو جەستەیانەوە، بەفر ئەوەندە کەم ببۆوە کە سەر ئێشە و ڕێگری بۆ گەریلا کەم ببۆوە، بێگومان جگە لەو بەفرانەی کەبەقەد گاپێڵەکانەوە بوون، هیچ ئاسەوارێکی زستان لەئارادا نەمابوو.

بەرچەم چاوی دووربینەکەی خستە ناو زێیەکەوە، سەوزایەکەی لەهەناوی ئۆقیانوسێک دەچوو، بەدەم شەپۆلەکانەوە شێتوهار ببوون، لە دووریشەوە گەڵا تازە پێگەیشتۆکانی لق و چڵی دارەکان دەردەکەوتن، بەرچەم ماوەیەکی تر تەماشای دار چنارەکانی کرد کەبەدوای یەکدا ڕیزیان گرتبوو، هەروەکو ئەوەوابوو بە مەستەرە بەدوای یەکدا ڕیز کرابێتن.

لەناکاو جموجۆڵی لەناو دار چنارەکان بەدی کرد کە ببوو بەمایەی سەرنجی بەرچەم، بەباشی سەرنجیدا، بەبێ ئەوەی دووربینەکەی لە چاوەکانی لابدات ماوەیەک تەماشای ئەوێی کرد، بەم سەعاتە مەحاڵ بوو هێزی دوژمن بە قوڵایی زێیەکە بسوڕێنەوە، ئەمە بۆ گەریلاش هەروابوو، پێیوابوو خەڵکی گوندەکانن، بینی لە دوورەوە کە چوار کەسێک وەک تارمایی لەناکاو لە چاوانی ون بوون، بەرچەم بانگی شاهینی کرد، شاهین بە ئاگاهاتەوە و بەرچەم هەموو شتێکی بۆباسکرد، شاهین بە دووربین کەوتە تەماشاکردنی ئەو شوێنە، ئەوانەی ڕێگەیان دەکرد دوا داری چنارەکانیان دەبڕی، بەرەو گوندی دەرە کەوتبوونە ڕێ، مەحاڵ بوو لەم دوورەوە بزانرێت کە کێن، شاهین وتی "یەکێکیان کوڵی لە پشتە"، بەرچەم بە دووربینەکە کە جارێکی تر تەماشای کردەوە ئەویش دڵنیا بوو لەوەی کە یەکێکیان کوڵی لە پشتە، بەرچەم وتی "کەواتە خەڵکی گوندەکانن"، شاهینیش وتی "ئەوە چەندین ساڵە دوژمن ڕێگە نادات خەڵکی گوندەکان بێن بۆ ئێرە"، کە کەمێک لێیان نزیک بونەوە بینیان کە چەکیان بەشانەوەیە، بەرچەم وتی "سەد لە سەد ئەمانە هەڤاڵانی خۆمانن"، شاهینیش وتی "باشە، بەڵام کێن؟ "بەرچەمیش وتی "لە هەموو شوێنێک ئاپۆچی هەیە، هەر بەردێک هەڵبڕیت لەژێریدا ئاپۆچییەک دەبینیت"، ئەوان بەکەناری زێیەکەوە ڕێیان دەکرد، ئەگەر بەردەوام بەڕێکی بەردەوام بونایە لە ڕێکردن دەگەیشتنە

لای ئەمان، ئەو شوێنەی ڕێیان لێدەکرد ئەگەر بە گردەکەی نزیکیانەوە بهاتنایە هەر ٥٠ مەترێکی دەما بۆلای ئەمان، شاهین و بەرچەم زۆر بە جوانی چاویان بڕیبۆوە شێوازی ڕێکردنیان، بەتایبەتی مەراقی کۆڵەپشتەکەیان بوو، کاتێک کەمێک زیاتر لێیان نزیک بونەوە ئیتر بۆیان دەرکەوت کە وەک خۆیان گەریلان، بەجۆرێک دەموچاوی بەرچەم بەختەوەرییەکی پێوەدیار بوو کە شاهین سەری لێدەرنەدەکرد، شاهین لە بەرچەمی پرسی "بەچی پێدەکەنیت؟ "بەرچەمیش وتی "سوپرایزێکیان بۆبکەین؟ "شاهینیش وتی "سوپرایزی چی؟ "بەرچەمیش وتی "بابۆسەیان بۆدابنێین و پێیان بڵێین خۆتان ڕادەست کەن "، شاهین لەجیاتی وەڵامدانەوە تەنها خەندەیەکی بۆکرد، بەرچەم ڕەزامەندی وەرگرتبوو، نۆزان و حەمیدۆی لەگەڵ خۆیدا برد و چوونە خوارەوە، بەرچەم ئاگەداریانی کردەوە کە خۆیان ئاشکرا نەکەن، حەمیدۆ و نۆزان لە نییەتی بەرچەم بێ ئاگابوون، بەدوای بەرچەمدا دەڕۆیشتن و زۆر جدی بوون، بەرچەمیش هەتا بیری لە هاتنە ئاراوەی ڕووداوەکان بکردایەتەوە بەردەوام پێدەکەنی، بەقەد پاڵی ڕێگەی بەردەمی زێیەکە سەنگەریان گرت، ئەوانەی لە خوارەوە دەهاتن بۆ سەرەوە هەناسە بڕکێیان بوو، پشتیان لەبەرچەم بوو، بەرچەم خۆیانی لێنزیک کردەوە کە نێوانیان هەر ٥٠ مەترێک بوو، سەری لە گابەردێکەوە دەرکرد و هاواری کرد و وتی تیرۆریستەکان خۆتان بدەن بە دەستەوە، هەرکە گوێیان لەم دەنگە بوو هەموویان بە خێرایی بڵاوەیان لێکرد، بەرچەم هەر لە چاوەڕوانیدا بوو، لەوانی دەڕوانی، گەریلاکانیش هەریەکەیان خۆیان گەیاندە شوێنێک و سەنگەریان گرت، نەیاندەزانی کە ئەم دەنگە لەکوێوە هاتووە، ئەبێ چی بووبێت، کەسیان لێوەدیار نەبوو، بەرچەم حەزی نەکرد لەوە زیاتر لەناو مەراقدا بیانهێڵێتەوە هەربۆیە سەری خۆی دەرخست و وتی هەڤاڵ منم تەقە مەکەن، سەرەڕای ئەم بانگەوازییەی بەرچەم کەچی کەسیان خۆیان دەرنەخست، تەنها پالۆیان هەستی کرد کە ئەمە شۆخییە، بەرچەم حاڵی بوو کە ئەم هەڤاڵانانە ئەوانەن کە چوونە بۆ هێنانەوەی هەڤاڵە بریندارەکان، بەڵام تەنها ڕۆژبنیان لەگەڵدا بوو، ڕۆژبین لەبەرئەوەی بریندار بوو تەنانەت هەوڵی سەنگەر گرتنیشی نەدابوو، کاتێک بەرچەم لە چاوەڕوانی

ئەوەدابوو کە هەموویان بەم شۆخییە پێبکەنن، بەڵام چارەی خۆیان دابوو بەیەکدا، کەسیان پێنەکەنی بوو تەنانەت بەشێوەیەکی نەخوازیارانەوە تەوقەیان لەگەڵ بەرچەم کرد، بەرچەم هەرگیز دەموچاوی پالۆی بەو شێوەیە نەدیبوو کە بیدات بەیەکدا، لەدڵی خۆیدا وتی "بێشک شتێکی نەخوازیار ڕوویداوە! "بەرچەم پرسی "تەنها هەڤاڵ ڕۆژبین برینداره؟ "پالۆ وتی "دوایی قسە دەکەین هەڤاڵان لەکوێن؟ "شاهین هات پێشوازی لێکردن، کاتێک گەیشتنە ژێر گا بەردەکە بەرچەم پرسی "چی بووە؟ "پالۆ سەرەتا بە خیانەت کردنەکەی عەلی موسا دەستی بە قسەکردن کرد، دوایش باسی لە خیانەتەکەی حەیدەری بۆکردن، ڕۆژین خۆی بۆ ڕانەگیرا و گریا، هەتا دونیا تاریک داهات قسەیان کرد، کاتێک بەرەو پۆشێ بەڕێکەوتن هەربیریان لەوە دەکردەوە کە ئەم هەموو هەبەتاڵنە چۆن بە ئیبراهیم و باگەر بڵێن!.

# ٢٢

شاهین و هەڤاڵەکانی تریش بەیەکەوە گەیشتنەوە پۆشێ، ٤٠ ڕۆژی دوای ئەو هەموو ئەهامەتییە و بەدبەختیانە ئێستاش ئەو کارەساتەی ڕۆژین بۆیانی باسکردبوو برینێکی قوڵای لە دڵیاندا کردبۆوە، خیانەت جەرگی گەریلاکانی هەرێمی دەرسیمی بڕی بوو، لەم بەهارەدا کە دەبوایە زیندوبونەوەیەک بهاتایەتە ئاراوە، بەڵام ئێستا لە هەرێمی دەرسیم لە ناوچەی پۆشێ قەتیس ماوون، دەستەوئەژنۆ بوون، هەموویان ئەوانەی مابونەوە لە پۆشێ ڕۆحێکی پڕ لە قین و ئەفرەتییان هەبوو بەرامبەر گۆرانکاریەکان لەهەمانکاتدا ڕوبەروی خیانەت و فرمێسک و بێ هیوای ببونەوە، هەموو ئەمانەشیان بە چاوی خۆیان بینیبوو کە بەدەستێوەی ماندوببوون، ئەو بەدبەختییەی کە وەک هەورێکی ڕەش بەسەریانەوە بوو وازی لێنەدەهێنان.

ئیبراهیم بە گێرانەوەکانی ڕۆژین دونیای سەروبن ببوو، هەستی بە ئازاری ویژدانی دەکرد کە لەگەڵ گرووپەکەیدا نەبوبوو، ئەو هەستی بە بەرپرسیارێتی دەکرد لەهەمبەر ئەم کارەساتانەدا، باگەر هەر لە سەرەتاوە بەرپرسیارێتی هەموو بەدبەختێکانی لە ئەستۆ گرتبوو کەهەر زۆر زوو دەستیان پێکردبوو، هەڤاڵ بەدرانیشیان تووشی داڕوخانی دەروونی هاتبوو ئەویش خۆی لەهەمبەر کارەساتەکان بە بەرپرسیار دەزانی، ئایا هەر بەدران نەبوو کە شوێنی کەمپەکەیانی بۆ عەلی موسا کەشف کردبوو، یەکەم ڕۆژ کە هاتبوو بۆ دەربەندی عەلی ئەگەر لەگەڵ عەلی موسادا لەبارەی کەمپی ناکتاشەوە قسەی نەکردایە لەوانەبوو ئەم کارەساتانە ڕوویان نەدایە. شاهین بەهۆی ئەو شەهادەتانەی لەئاکامی زریپۆشەکانەوە هاتبوونە ئاراوە جەرگی سوتابوو، پالۆ خۆی بەبێچارە دەبینییەوە، بەرچەم کەبیری لە کارەساتەکان دەکردەوە دەگریا، دەبوایە ئەو پەڵە هەورە ئەگریسە و بەدبەختەی لەسەریان گرمۆڵە بۆتۆتەوە بەهەر شێوەیەک بوایە ئەیانهێشتایە، بەڵام چۆن ؟؟؟؟؟.

باگەر بە ئامانجی کۆبونەوە بانگی هەموو گەریلاکانی کرد، باگەر بە کورتی باسی ڕووداوەکانی ٤٠ ڕۆژی ڕابوردووی بۆکردن، پاشان پرسیاری ئەوەی لێکردن کە بۆ لەمەودوا چی بکەن، سەرەتا کەسیان نەیاندەویست قسەبکات،

کاتێک باگەر وتی پێویستە شتێک بڵێن بەرچەم دەستی بەرز کردەوە، بەرچەم وتی "ئەم هەموو بەسەرهات و تراژیدیایەی ڕوبەروی بوینەوە یەک ناوی هەیە ئەویش پێی دەوترێت دۆڕاندن، لە پێش هەموو شتێکەوە دەبێت ئەمەمان پێ قەبوڵ بێت، لەم حاڵەتانەدا دوو شت دێتە بەردەممان یان تەسلیم بوون یان بە گیانبازی بوون، لە ڕێگەی بە زیلان بونەوە دەتوانین ئەم پەڵە هەورە ئەگریسەی بان سەرمان لابدەین". وشەی ناوی زیلان لەناکاو کەشوهەوای کۆبونەوەکەی گۆڕی، چالاکییە گیانبازێکەی زیلان کە ساڵێک لەمەوبەر ئەنجامی دابوو هێشتا کاریگەری خۆی هەبوو، زیلان بۆ هەموو گەریلاکان مایەی سەربەرزی و سیمبوڵی ڕۆحی ئازادی و شێوازی تێکۆشانێکی نوێ بوو.

باگەر نەیدەزانی کەچی بڵێت، حەق دەدابە بەرچەم، بەڵام دەبوایە بەرچەم بیروبۆچونەکانی خۆی زیاتر ڕوون بکاتەوە، باگەر لە بەرچەمی پرسی "دەتەوێت بڵێی چالاکی گیانبازانە ئەنجام بدرێت؟ "بەرچەمیش وتی "بەڵێ، چالاکی گیانبازانە، بۆ ئەم کارەش من پێشنیاری خۆم دەکەم". پاشانیش شاهین و پالۆ و ئیبراهیم و گەریلاکانی تریش قسەی خۆیان کرد و هەمان پێشنیاری بەرچەمیان دووبارە کردەوە، هەریەکەیان کە قسەیان دەکرد گڕوتینی تۆڵەسەندنەوەیان گڕیگرتبو و ئامادەبوون کە باوەش بە مردندا بکەن، تۆڵەسەندنەوە خاڵی هاوبەشی هەموویان بوو، هەربۆیە ئامادەبوون کەلەم پێناوەدا ئەو بەدەلەی پێویستە بدرێت بیدەن.

باگەر بەم هەیەجان و جۆشوخرۆشییە و گڕوتینی داخوازی تۆڵە سەندنەوەیان بەختەوەر بوو، لەوەخۆشتر شتێکی تری لە دڵدانەبوو، لە جیاتی لە شکرێکی داڕوخا و ئێستا لە شکرێکی لەبەردەمدابوو کە سوێندی تۆڵەسەندنەوەیان خواردبوو، هەموویان وەک بورکانیش ئامادەی تەقینەوە بوون، دوای ئەوەی هەموویان قسەیان کرد پاشان باگەر وتی:

"ئێمە خۆمان ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی لەهەمبەر دوژمن ببین بە زریان، ئێمە ئەم ساڵ لە هەموو باکوردا دەستمان دەکرد بە دەستپێکی ئەنجامدانی چالاکێکان، بەڵام لەناکاو لەناو هەلومەرجی ساڵی پاردا خۆمان قەتیس کرد، ئەم ساڵ هێزی دوژمن بە شێوەیەکی زۆر جدیانە هێرشیان بۆهێنایین،

مەبەستیان ئەوەبوو کە بەتەواوەتی هەمووومان لەناو بەرن، ئێمەش کەمێک لەناوەختدا ڕاوکراین. بەڵام هێشتا ئەنجامدانی چالاکی سەرتاسەری لە باکوری نیشتیمانەکەمان کاتەکەی بەسەر نەچووە، بەشێکی باشی بەرچاوی هێزەکەمان هێشتا لە ژیاندایە، لەم بەهارەدا کەسانێکی زۆرهەن کە بەشداری ناو ڕیزەکانی گەریلا دەبن، هێزی دەربەندی عەلی بە گرووپەکەی ئەیهان و هەڤاڵ فوراتەوە ١٠٠ گەریلایەک زیاترن، دەتوانین بەم هێزەوە دەستێکی باش لە هێزی دوژمن بوەشێنین، لەپێش هەموو شتێکەوە هێزەکەمان ڕێکدەخەینەوە، ئامادەباشێکان تەواودەکەین و بە گوێرەی ئەوەش جموجۆڵ دەکەین، پێویستە بێ هیوا نەبین، پێویستە ئەوە لە بیر نەکەین کە ئێمە خوێندکاری سەرۆک ئاپۆین و هەڤاڵانی شەهید زیلانین ".

کۆبونەوەکەیان کۆتایی پێهات، ئەگەر کەمیش بوبێت ئەو کەشوهەوا دڵتەنگەی بەسەریانەوە بوو ڕەویبۆوە. باگەر و شاهین و ئیبراهیم بەیەکەوە کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا، دوای ماوەیەکی زۆر بوو هەڤاڵانی چێشتخانیان یەکەمجاریان بوو کە سەرقاڵی درووستکردنی خواردنێکی گەرم بن.

لە کۆبونەوەکەدا باگەر پێیووتن "با پیلانسازی بکەین "، ئیبراهیمیش وتی "سەرەتا دەبێت تەرمی هەڤاڵان بدۆزینەوە و تەرمی ٣٦ هەڤاڵمان لەوێ بەجێماون، خوا دەزانێت ئێستا تەرمەکانیان چۆن شێواون، هەتا تەرمەکانیان بەخاک نەسپێرین ناتوانین هیچ بکەین ". باگەریش وتی "بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە پیرۆزە ٥ هەڤاڵ باشە؟ "ئیبراهیمیش وتی "باشە ". باگەر وتی "پێویستە پەیوەندەی بە هەڤاڵ ئەیهان و فوراتەوە بکەین و دەبێت بیانهێنین بۆ دەربەندی عەلی ". شاهینیش وتی "پێش ئەوەی بچین بۆ دەربەندی عەلی پێویستە سەرەتا گرووپێک بنێرین لەوانەیە هێشتا مەترسی لەئارادابێت، بابەگشتی گرووپەکەمان نەخەینە ناو مەترسییەوە ". باگەر وتی "تۆخۆت چەند هەڤاڵێک لەگەڵ خۆتبەرە و برەو دەربەندی عەلی بەڕێکەوە ئێمەش دوای ٥ ڕۆژی تر دەگەینە ئەوێ، بەگوێرەی ئەوە هەموو کەسێک خۆی ئامادە بکات ". ئیبراهیم وتی "هەموو شتێک گونجاوە، دوای ٥ ڕۆژی تر هەموومان دەتوانین بگەینە دەربەندی عەلی ". شاهینیش وتی "ئێمەش لە دەربەندی عەلی

چاوەڕێتان دەکەین "، باگەر وتی "مەسەلەکان بەباشی بۆ نەیهان و فورات باس بکەن، من تەنها ٣ ڕۆژ لێرە دەمێنمەوە دوایی دەکەومە ڕێ ". دوای کۆتایی کۆبونەوەکەیان هەموویان چوون بۆ ئامادەکردنی پێداویستێکانیان، ئیبراهیم بۆ گرووپەکەی خۆی پالۆ و نەعمان و ئۆزان و حەمیدۆی هەڵبژارد، شاهینیش بەرچەم و غالیب، ئیبراهیم لەگەڵ ئەو هەڤالانەی هەڵیانی بژاردبوو بەرەو ئۆڤاجک کەوتنە ڕێ، هەر لە ئێستاوە تەخمینی ئەو دیمەنە دڵتەزێنانەی دەکرد کە ڕوبەڕووی دەبنەوە، بۆ تەخمینکردنی ئەم دیمەنە دڵتەزێنە پێویست بە کاهینبوون ناکات، ئیبراهیم و هەموو هێزی گەریلا سەربازەکانی سوپای تورکیان باش دەناسی، چەندێجار ڕوبەڕوی ئەم دیمەنە ترسناک و دڕندایەتییە ببونەوە.

ئیبراهیم لە دڵی خۆیدا وتی باشترین شت بیرنەکردنەوەیە لەو دیمەنانە، بەڵام بەدەستی خۆی نەبوو، هەرچەندە هەوڵی دەدا خۆی لەدەستی ئەو تابلۆ دڵتەزێنانە ڕزگار نەدەکرد، ئەمەش بەهۆی ڕابوردویەوەی بوو کە پێشوتر ڕوبەڕوی ئەو تابلۆیانە ببۆوە و لەناو ناخ و هزریدا مابونەوە، چەندینجار تەرمی هەڤالانی بینی بوو کەلەلایەن دوژمنەوە چۆن شێواندرابوون، پارچە، پارچەکرابوون، لەوە دەترسا کە ئەمجارەشیان ڕوبەڕوی ئەو تابلۆیانە ببێتەوە، ئیبراهیم لە پالۆ نزیک بۆوە و پێیووت "لە شوێنێکی گونجاو ئەیاننێژین "، پالۆش ڕەزامەندی بۆقسەکەی ئیبراهیم دەربڕی، ئیبراهیم خۆی پێ ڕانەگیرا و بە پالۆی وت "بەڕای تۆ دەبێت چییان لە تەرمەکان کردبێت؟ "پالۆ لەهەمبەر ئەم پرسیارە بێ وەڵامە هیچی نەووت، دەیتوانی چی بڵێت؟ پالۆ لەوە دڵنیا بوو کە هەموویان شێواندراون و پارچە، پارچەکراون، لەراستیدا ئەم پرسیارەی ئیبراهیم بۆ دڵدانەوەی خودی خۆی بوو، دەیویست بۆئەم قەدەرەی شەریکێک بدۆزێتەوە، دەیویست لە ڕێگەی چەند گوتەیەکەوە ئازار و ترسەکانی خامۆش بکاتەوە.

چەندین کاتژمێر ڕێیان کرد، دەمەوبەیانی گەیشتنە شوێنی شەڕ و پێکدادانەکە، کاتێک ئیبراهیم تەرمەکانی بینی زانی کە هیچ شتێک ناتوانێت ئاوبخاتە سەر دڵی سووتاوی ئاگرەکەی ناخی خامۆش بکاتەوە، ڕوبەڕوی

شێوازێکی تری مردن ببۆوە، هەموو شتێک بۆ ئەو وەک دێوزمە وابوو، تەرمەکانیان بەتەک یەکەوە بەیەک ڕیز دانابوو، هەموویان ڕووت کرابونەوە و پارچە، پارچە ببوون، مەحاڵ بوو کە بزانن لەناو ئەو تەرمانەدا هەڤاڵەکانی خۆیان بدۆزنەوە کە کامە کامەیانە، بۆنمونە نەدەزانرا کە هەڤاڵ گورسێ کامەیانەو دەگەڕان بەدوای عەگیدو دیاریشدا، بەڵام نەیاندۆزینەوە، زۆربەیان چاوەکانیان دەرکرابوو، تەنانەت دەیانزانی کە جەندرمەکان چاوی گەریلا کوژراوەکانیان دەردەهێنا و ئەیانخستە ناو شوشەوە و بۆ ترساندنی ئەوانەی نەشکەنجەیان دەدان بەکاریان دەهێنا، بەگشتی گوێی هەموویانیان بڕی بوون، جەندرمەکان گوێیەکانیان بە پەڕۆوە گرێدەدا و وەک دیاری سەربازی خۆیان بۆ ماڵەوە دەیانناردەوە، تەنها گوێیان نەدەبڕی تەنانەت قۆڵ و دەست و پەنجە و ناو سک و سەریشیان لێدەکردەوە، لەناکاو پالۆ وتی "ئەرێ ئەمە هەڤاڵ گورسێ نییە؟ "ئیبراهیم بەڕاکردن خۆی گەیاندە لای پالۆ، ئیبراهیم تەنها کەلەسەرێکی بینی، کەلە جەستەی جیاکرابۆوە، پێستی دەموچاوی کەلەسەرەکەیان هەڵدڕی بوو، لەوەدەچوو ئەم جەرندرمانە تەماشای فلیمی هیندۆکانیان کردبێت و خۆیان فێری ئەم شێوازی کەوڵکردنە کردبێت، پالۆ کەمێک لەلاوە هەندێک شتی بینی کە وەک تەناف بە لق و چڵی دارەکانەوە هەڵواسرابوو، بەرەو ئەوێ ڕۆیشت و بانگی ئیبراهیمی کرد، جەندرمەکان ڕیخۆڵەی گەریلا کوژراوەکانیان دەرهێنابوو بە لق و چڵەکانەوە هەڵیانواسی بوو، لە هەر چڵێکدا پارچەیەکی جەستەی مرۆڤیان هەڵواسی بوو، ئیبراهیم هەوڵی دەدا کە تەرمی شەهید دیار بدۆزێتەوە، کۆنترۆڵی هەموو تەرمەکانی کرد، ئەگەر چاوەکانی دیاری ببینیایە دەیناسییەوە، بەڵام پێی پەیدا نەدەکرا، پارچەکانی تەرمەکان بەشێوەیەک پەرشوبڵاو کرابونەوە تەنانەت بۆئەوەی پێیان پیانەنێن زۆر بە وریایانە دەجوڵانەوە، ئیبراهیم وتی "ئەمە شەهید عەگیدە "، چاوەکانی عەگید بە دەموچاوێوەی نەمابوو، هۆکارەکەی چییە و بۆچی دەبێت چاوی کەسێکی مردوو هێشتا جەندرمەکان لێی برستن؟ قاچێک لەو ناوە کەوتبوو نەیاندەزانی کەهی کێیە، سنگی یەکێکیان لەناوەڕاستدا شەق کرابوو، ڕیخۆڵە و گورچیلەی زۆربەیان دەرهێنرابوو، دەماغی چەند

تەرمێکیان بەوناوە پەرشوبڵاو ببۆوە، ئەمە ئەو تابلۆ دڵتەزێن و نامرۆڤایەتییە بوو کە ئیبراهیم لە بینینی دەترسا.

لەزۆرینەی پارچەی جەستەکان بە قامە لێیان نووسی بوو کۆماندۆ، ئیبراهیم نەیتوانی لەمە زیاتر دانبەخۆیدا بگرێت و لێیان بڕوانێت، چووە کەناری ئەو چەمەی کە کەمێک لەو لایانەوە بوو لەوێ دانیشت، ئیبراهیم شێنی بوو، هەڵبەت هەموو تەمەنی ژیان بە ئازارەوە بەسەر ناچێت لەگەڵ ئەم ئازارانەدا زۆر شتی تر دێتە ئاراوە، ئەوەی کە مرۆڤ بەرەو سووربوون بۆتۆڵە سەندنەوە دەبات بێ یەک و دوو ئەو ئازارەیە کە هەراسانی کردووە ئێستاش ئیبراهیم هەستی بە هەمان شت دەکرد، بۆ ئەوەی ببێت بە شایەنی هەڤاڵەکانی دەبوایە سوێندی تۆڵەی نوێ بکردایەتەوە، پالۆ چووە لای ئیبراهیم، بەبێ ئەوەی تەماشای دەموچاوی بکات لەپەنایەوە دانیشت، بەبێ ئەوەی بهێڵێت هەستی پێبکات تەماشایەکی کرد، پالۆ دەموچاوی ئیبراهیمی بە ماندو و پڕ لە ئازارەوە بینی.

# ٢٣

شاهین دوای ٤٠ ڕۆژ یەکەمجاری بوو کە بەرەو دەربەندی عەلی بەڕێبکەوێت، بەرچەم و غالیبیشی لەگەڵدا بوو، چەند ڕۆژێک بوو نە باران دەباری و نە تەمومژیش هەبوو، کەشوهەوایەکی خۆش لەئارادابوو کە مژدەهێنەری دەستپێکی بەهار بوو، بەدەم هیوایەکی پڕ ئاسودە و هیوایەکی نوێوە ڕێیان دەکرد، بیری دەربەندی عەلییان دەکرد، هەرچۆنێک بێت ئەوێ بە بارەگای سەرەکی و مەڵبەندی بردنەڕێوەی شەڕ هەژمار دەکرا.

هێزی دوژمن بەتەواوەتی پاشەکشێیان کردبوو، زۆربەی کاتی ڕێکردنیان بە ڕۆژ ئەنجام دەدا، کەلە پۆشێ بەڕێکەوتن هەور بوو، بەڵام دوای نیوەڕۆ تیشکی خۆر ئەوناوەی گرتەوە و یەکەمجاریان بوو کە بە تیشکی خۆر دوای ماوەیەکی زۆر ئێسکیان گەرمی ببێتەوە، ئەو شوێنەی یەکەمجار پێی گەیشتن زێی بیلەکلی بوو، ڕێگەیەکی چەتوونی هەبوو، نەیاندەتوانی بە ئاسانی خۆیان لێی دەرباز بکەن، بەهۆی سەختێکەیەوە نەدەتوانرا بەشەو ڕێگەی پێدابکەن، لەبەرئەوەی مەترسی هێزی دوژمنیش لەئارادا نەبوو شانس یاوەریان بوو کە بە ڕۆژ ئێرە ببڕن، لەکەناری بیلەکلی پشویاندا و هەریەکە و جگەرەیەکیشیان کێشا، پاشان توانیان خۆیان بگەهێننە تەختایەکانی کاخپەری، سەرەتا دەبوایە دەربەندەکەی ئێرەیان ببڕیایە و دوایش گوندی کاخپەری، بەم شێوەیە هەموو هەورازەکانیان دەبڕی، کە گەیشتنە لووتکەی دەربەندەکە لە خوارووی خۆیانەوە چاویان بە هەموو سەوزایەکەی تەختایەکە کەوت کە وەک ئۆقیانوسێک لەژێر پێیاندا بوو.

چوونە ناو ئەو مەکتەبە کۆنەی کە کەوتبووە دەرەوەی شانی گوندەکە، ئێرە بۆ گوندەکان وەک خان وابوو، دوای پشودانێک جارێکی تر بە هەورازەکاندا هەڵگژانەوە، دووەمین مونزڵیان دەربەندی ساخی ئۆغڵان بوو، دوای ٣ کاتژمێر لە هەڵگژان توانیان بگەنە سەر لووتکەی دەربەندەکە، سەر لووتکەی دەربەندەکە تەختایی بوو، شوێنێکی نەبوو کە بتوانن خۆیان تێدا بپارێزن، بەدەم شەڕکردنەوە لەگەڵ ڕەشەبەدا توانیان ڕێ بکەن، بۆن و بەرامی بەهاریان دەکرد، کە گەیشتنە گوندی دەلیلەڕوا تاشێتەکان کەمییان دەما بگەنە

دەربەندی عەلی، هەرکاتێک گەریلا بەم ناوچەیە تێدەپەڕین بە ناوی گوندەکە پێدەکەنین چونکە گوندەکە ناوی گوندی شێتەکان بوو، دارستانەکەیان بڕی و گەیشتنە دەشتاییەک کە تاک و تەرا داری هەبوو، ئەمجارەیان دەبوایە بەرەو لێژایی خوار ببنەوە، بەلای کەمەوە دەبوایە کاتژمێرێک خۆیان شۆڕبکردایەتەوە، شۆڕبونەوە ئەوەندەی هەڵگژان ناڕەحەت و زەحمەتە، لەکاتی شۆڕبونەوەدا دەبوایە بەردەوام خۆیان بەشتێکەوە بگرتایە و وریای پێیەکانیان ببونایە و نەیانهێشتایە کە بەدەمدا بکەون و غلببنەوە هەربۆیە زۆر ماندوو ببوون.

گوندە چۆڵکراوەکانیان تێپەڕاند، کە چوونە ئەو ناوچەیەی کە بارەگا و گوندی لێ بوو ئیتر کاتی هاتنە ئاراوەی مەترسی دەستی پێکرد، دەبوایە بەبێ هیچ ڕاوەستانێک بەلای کەمەوە ٥ کاتژمێر ڕێیان بکردایە، ئەگەر بیانتوانیایە ئەم ٥ کاتژمێرە ڕێکردنە بەسەر کەوتوانە تەواو بکەن ئەوا لە کۆتاییدا لە شوێنێکی تر ٢ کاتژمێرێک بە شوێنێکدا هەڵدەگژان و دەگەیشتنە دەربەندی عەلی.

شاهین و بەرچەم و غالیب توانیان هەموو مەترسێکان لەدوای خۆیان جێبهێڵن و بگەنە نزیک دەربەندی عەلی، ئەمەش زۆر دڵیانی خۆشکردبوو، هەموو ماندوبونەکانیان لەبیرچۆبۆوە، ئیتر پێویستیان بە دۆزینەوەی شوێنێک بوو کە ئاگری تیابکەنەوە و بە ئارەزووی خۆیانیش جگەرە بکێشن، شاهین پێی باش نەبوو کە بە تاریکی بچن بۆ کەمپەکە کۆنەکەیان، لەوانەبوو کەمپەکەیان لوغم ڕێژکرابێت، لەوانەش بوو هێشتا هێزی دوژمنی لێبێت، شاهین پێیانیوت "بابچینە ناو ( سیتە ) کەوە"، کاتێک بەرچەم گوێی لەناوی سیتە بوو بەمە بەختەوەر بوو، لەوکاتەوەی هاتبوو بۆ دەربەندی عەلی چەندینجار پێشنیاری کردبوو کە بچێت بۆ بینینی ئەو سیتەیە، بەڵام هیچ جارێکیان هەلی بۆ نەڕەخسا بوو، بەرچەم وتی "بابڕۆین"، ئەم سیتەیە ئەشکەوت بوو کە خاوەن مێژوویەکی زۆر کۆن بوو، دەتوانرێت بووترێت کە شوێنەواری مرۆڤی نیادەرتاڵە، چوون لە دەربەندی عەلییەوە بۆ سیتە ماوەی دوو کاتژمێری پێدەچوو، مەحاڵ بوو کە بەشەو بتوانرێت بەتەواوەتی سیتە ببینرێت و شارەزای دەوروبەری ببیت، کە گەیشتن ئاگریان کردەوە، دوایش کەمێک نانیان لە جانتاکانیان دەرکرد

و خواردیان پاشان له چواردەوری ئاگرەکە دانیشتن، شاهین وتی "دواجار ٣ ساڵ لەمەوبەر هاتبووم بۆ ئێرە"، بەرچەم پێیووت "ئێرە چەند نهۆمە؟"

"٧ نهۆمە".

"هیچ چویتوته ناوەوە؟"

"هەتا نهۆمی ٣ چوومەتە خوارەوە!"

"بۆچی هەتا نهۆمی کۆتایی نەچویتە؟"

"لە نێوان نهۆمەکاندا شوێنی وەک تونێلی هەیە، هەتا بچیتە خوارەوە ساردتر دەبێت".

"لەبەر سەرماکەی نەچویتە خوارەوە؟"

"نەخێر لەبەرئەوەی هەڤاڵانی تیا شەهید بوو، هەمیشە ئێرە دڵم نەخورپێنێت".

"کێ لێرە شەهید بووە؟"

"قفرجک سەلیم و گرووپەکەی".

"هەموویان شەهید بوون؟"

"گرووپەکەیان ١٠ گەریلا بوو، بۆنەوەی لە نۆپەراسیۆنی دوژمن خۆیان ڕزگار بکەن دێنە ئێرەوە، بۆ ڕۆژی دوایی هێزی دوژمن دەمی ئێرە دەگرێت، غازی کیمیاوی ئەخەنە ژوورەوە، دوایی تێخستنی ئەم غازە ژەهراویە ماوەی ٢ ڕۆژ چاوەڕێ دەکەن، بەڵام ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە تیایاندا هەبوو خۆی ڕزگار کردبوو، بۆنی غازەکە ناچێتە قوڵایی دواهەمین نهۆمەوە، نیوە شەو ٣ هەڤاڵیان هەوڵی هەڵاتن دەدەن، سەرەڕای ئەوەی لە دەرەوە بارانیش هەبوو، بەڵام بەسکە خشکێ دێن و خۆیان دەگەهێننە ئەم شوێنەی کە ئێستا ئێمە لێی دانیشتووین، کاتێک دوای ڕزگاری دەبێت و هەڤاڵی ٣ یەمیشیان بەدوایاندا دێت سەربازەکان هەستی پێدەکەن و شەهیدی دەکەن، بەڵام ئەوانی تر هێشتا لە ژوورەوە دەمێننەوە و دەرنەچوون".

"ئێ باشە قفرجک سەلیم ڕزگاری بوو؟"

"نەخێر شەهید بوو".

"ئەی تەرمەکانیان چییان لێهات؟"

"دوایی لە خەڵکی ئاوایەکانەوە زانیمان کە تەرمی هەموویان دەردەکەن و تەرمی قفرجک سەلیم لە ڕێگەی خەڵکی ئاوایەکەوە دەناسرێتەوە. بە کورتێکەی ئەم سیتەیە کەلە ٧ نهۆم پێکهاتووە بووە هۆکاری شەهیدبوونی ٨ هەڤاڵمان".

بەرچەمیش دوای ئەو هەموو قسانەی شاهین بۆیکرد وتی:

"ئەتوانم بچمە ناو سیتەکەوە؟"

"من ناچم، بەڵام تۆ دەتوانیت، بەڵام ئەگەر بە ڕۆژ بچیتە ناوی باشترە!"

ئەو شەوە بە دیار کڵپە و خۆڵەمێشی ئاگرەکەوە خەویان لێکەوت.

دەمەوبەیانی بەئاگاهاتنەوە، لەبەرئەوەی هەرسێکیان زوو، زوو ئێشکگریان کردبوو تێرخەو نەبووبوون، دوای نانخواردنی بەیانیان بەرچەم چووە ناو سیتەکەوە، کوونی سیتەکە زۆر تەنگ بوو، هەرکە لە کوونەکە چووە ژوورەوە ڕووبەڕووی ڕێڕەوێک بۆوە، بۆئەوەی بەهۆی شێداری زەوێکەیەوە ناخزێت و نەکەوێت دەبوایە ئاگاداری هەنگاوەکانی بوایە. دەستی بە دیوارەکان دەگرت، دەچووە پێشەوە، تونێلەکە دەیبرت بۆ ژوورێکی گەورەی سەرەوە، چەرخەکەی داگیرساند و بەهێواشی دەچووە پێشەوە. ژوورەکە لە چاو بەرچەم زۆر گەورەبوو، چووە قاتێکی تری خوارەوە، هەتا بچوایەتە خوارەوە سارتر دەبوو، تونێلەکە زۆر ترسناک بوو، بچوکترین دەنگی خشپە سەدای دەدایەوە، بەرچەم هەموو شتێکی لەچاو گرتبوو هەربە عینادی خۆی، خۆی گەیاندە ٥ مین نهۆم، بۆئەوەی بچێتە نهۆمی شەشەمەوە چووە ناو تونێلێکی ترەوە، زۆر تاریک بوو ئەگەر چەرخەکەی بەکار نەهێنایە نەیدەتوانی هیچ ببینێت، لەناوەڕاستی تونێلەکە بەرچەم قاچی لە شتێک گیربوو، بە چەرخەکەی کۆنترۆڵی کرد، لەناکاو قیژەیەکی کرد، نەیوێرا جارێکی تر چەرخەکەی داگیرسێنێت و تەماشای ئەوە بکاتەوە کە بینی بووی، بەڵام بەرچەم ئەوەندە ترسنۆکیش نەبوو، بێ دەنگی و دڵەڕاوکێی و تاریکی و ئەو شتەشی بینیبووی وایلێکردبوون کە ئەو قیژەیە بکات.

بەرچەم بەڕاکردن بەرەو سەرەوە هەڵگژا، چەند جارێک چەرخەکەی داگیرساند، ئەویش نەیدەزانی کەلەکاتی گەڕانەوەیدا چەندجار پێی لە شت

گیرا و چەندجار کەوتووە، ئەوەی کە دەیزانی ئەوەبوو کە بە زووترین کات خۆی بگەهێنێتە لای شاهین، کە گەیشتە لای شاهین هەناسە سوار ببوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو زمانی لاڵ ببوو، شاهین کاتێک بەرچەمی بەو شێوەیە بینی شڵەژا، یەکەمجار بوو کە بەو شێوەیە بەرچەم ببینێت، شاهین لێی پرسی:

"چی بووە؟"

"یەکێک لەوێدایە!"

"لەکوێ؟"

"لە خوارەوە لە نهۆمی ٦م یەکێکی مردوو".

"مردووە؟"

"کەسەکە ڕەش بووە دەموچاوی نەماوە!"

سەرەتا شاهین سەری لە مەسەلەکە دەرنەدەچوو، لەدوای کارەساتەکەی قفرجک سەلیمەوە شەڕ و پێکدادان لێرە نەهاتبووە ئاراوە، شاهین چەرخەکەی بەرچەمی هەڵگرت و لەگەڵ غالیب چوونە خوارەوە، نەیاندەزانی کە ڕوبەروی چی دەبنەوە، خۆیان ئامادەکردبوو بۆ هەموو ڕوبەرو بونەوەیەک، کە چوونە نهۆمی ٦ مەوە ڕوبەڕووی تەرمێک بونەوە، شاهین بە چەرخەکەی دەستی لە تەرمەکە ورد بۆوە، بەدەنی تەرمەکە ڕزیو بوو، بەڵام بەهۆی ساردی شوێنەکەوە بەتەواوەتی نەڕزابوو، لێوەکانی لێببونەوە، گۆشتی دەرەوە و چواردەوری چاوی نەما بوون، قژی درێژ بوو، ماوەیەک تەماشای دەموچاویان کرد، بە بەرگەکەی بۆیان دەرکەوت کە گەریلایە، باشە دەبێت کێ بێت؟ بە تیشکی چەرخەکە تەماشای هەموو جەستەیان کرد، دوایش بینیان کە قۆڵێکی بە شانێوەی لەژێر بەردێکدایە، لەوانەبوو لێرە بەدواوە نەیتوانی بێت خۆی ڕزگار بکات و شەهید بووە، غالیب لە شاهینی پرسی "ئەی ناسیتەوە؟" شاهینیش وتی "نەخێر".

هەردووکیان بۆ سەرەوە گەڕانەوە، لەبارەی ئەوەی کە ئایا چی لە تەرمەکە بکەن هیچ بڕیارێکیان نەدا، لەهەمانکاتدا نەیاندەتوانی کە جەستەکە لەوێ بەجێبهێڵن، دەبوایە بیانناشتایە، گەورەترین کێشەیان ئەوەبوو کە تەرمەکە چۆن بهێننە سەرەوە، شاهین پێیانیوت ئەگەر قۆڵ و شانی لێبکەینەوە پاشان

دەتوانین بیهێنینە سەرەوە، بەرچەمیش بەمە شێت و هاربوو، بەرچەم وتی "ئەگەر بەردەکە هەڵبڕین دەتوانین ڕایبکێشین؟" گەنگەشەی نێوانیان لەبارەی ئەوەی ئایا دەتوانین بەردەکە لابدەین یان نا ماوەیەکی خایاند و شاهینیش بەم قسانەی کۆتایی بە مەسەلەکە هێنا و شاهین وتی "گوێم لێبگرن، پێویست بە درێژکردنەوە ناکات، تەرمەکە دەنێژین، پێویستە قۆڵی لە ژێر بەردەکە دەربهێنین ئەمەش بە دوو شێوە دەبێت، یەکەمین بڕینی قۆڵەکەیە دووەمیش بەرزکردنەوەی بەردەکەیە، کەسمان ناتوانین ئەو بەردە بجوڵێنین، نازانم بەرچەم ئەتوانێت ئەم بەردە بەرز بکاتەوە یان نا، ئیتر پێویست بە قسەی تر ناکات". بەرچەمیش وتی "من بیروبۆچونی خۆمم هێنایە زمان، ئێمە لێرە هەوڵدەدەین کە کارئاسانی هەڵبژێرین، ئەگەر قۆڵی هەڤاڵێکمان لێ بکەینەوە لەگەڵ دوژمن چی جیاوازییەکمان دەبێت؟ بڕینی قۆڵ ئەوە نیشان دەدا کە هیچ هەستێکمان نییە و وەک مردوو واین، من بەمە ڕازی نیم". قسەکانی بەرچەم سەرودڵی شاهینی گرت، قسەی ئەوەی کە چی جیاوازییەکمان دەبێت لەگەڵ دوژمندا ئەمە قسەیەک نییە کە بە ئاسانی بازی بەسەردا بدرێت، شاهین بۆئەوەی هاواری بەسەردا نەکات دانی بەخۆیدا گرتبوو، شاهین وتی "تۆ زۆر کەلەرەقیت، مێشکی تۆ لە ئاکامی تێکەڵەی زازا و تۆری و گۆیی درووست کراوە، بەو شێوازە عینادیەت هیچ کێشەیەکت پێچارەسەر ناکرێت، ناشتوانیت ئەوەی هات بەدەمتا بیهێنیتە زمان". بەرچەم هەستی کردبوو کە شاهین زۆر توڕە بووە، جارێکی تر شاهین وتی "با پرسیار لە هەڤاڵ غالیب بکەین، لەنێوان بۆچونەکانی من و تۆدا کامەی پێباش بوو ئەوە دەکەین". غالیب پێیانیوت کە لایەنگری بیروبۆچونەکەی شاهینە، بەرچەمیش چارەخۆیدا بەیەکدا و چوو لە پەنایەکدا دانیشت.

غالیب و شاهین قامەکانیان دەرهێنا و چوونە خوارەوە، غالیب چەرخەکەی داگیرساندبوو شاهینیش هەوڵیدەدا کە قۆڵ و شانی تەرمەکە لە ژێر بەردەکە دەربهێنێت، شاهین قۆڵی تەرمەکەی ڕاکێشا، بەڵام تەنها گۆشتی ڕزیو هات بەدەستێوەی، پارچە گۆشتە ڕزیوەکانی قۆڵەکە دەکەوتە سەر زەوی، هەرچەندە وادەبینرا کە نەڕزیوە، بەڵام بە بچوکترین جوڵانەوە

ئەوەرین، هەرچۆنێک بێت لەژێر بەردەکە دەریانهێنا، ئەمە ئاسان نەبوو، شاهین ئارەقەی شین و مۆری دەردابوو، پاشان کێشەی دەرکردنی جەستەکە هاتبووە ئاراوە، ئەگەر رایانکێشایە جەستەکە ورد، ورد دەبوو، ئەمە کارێکی زۆر زەحمەت و ناخۆش بوو کە دەستت بەریت بۆ جەستەی هەڤاڵێکت و لەناو لەپدا گۆشتە رزیوەکانی ورد، ورد بین، شاهین و غالیب چوونە سەرەوە، دەبوایە شتێکیان بدۆزیایەتەوە کە تەرمەکەی تێبکەن، بەرچەم خۆی لە ئاستیان لە گێلیدەدا، وانیشانیدەدا کە هەر لەوێش نییە، بە تەنیا لە سوچێکدا دانیشتبوو، هەرچەندە شاهین چەندجارێک بانگی بەرچەمیکرد، بەڵام بەرچەم خۆی لەکەری دابوو، لەناو جانتاکانیان و دەوروبەریشیان شتێکیان نەدۆزییەوە کەلە گوونی بچێت، دانیشتن و کەوتنە بیرکردنەوە، لەناکاو غالیب بە دەنگێکی بەرز وتی "دۆزیمەوە"، بەگوێرەی غالیب پشتوێنەکانیان بکەن بەیەک و گوونی لێدرووست بکەن.

هەرسێکیان پشتوێنەکەیان دڕی و کردیان بە گوونی، دوایش چوونە خوارەوە، دوای ئەوەی پارچە پشتوێنەکەیان خستە ژێر تەرمەکە و بەرزیان کردەوە، شاهین لە پێشەوە و غالیب دواوەی گوونێکەی گرتبوو، سەرکەوتنە سەرەوە، ئەمە ماوەی کاتژمێرێکی پێچوو، کە گەیشتنە دەرەوە باشتر لە تەرمەکە ورد بوونەوە، بەرچەم هەڵسا و خۆی لە تەرمەکە نزیک کردەوە، هەتا گەیاندبوویانە سەرەوە پارچە، پارچە ببوو، کاتێک بەرچەم بینی قۆڵێکی نەماوە قیژەیەکی کرد، شاهین لەهەمبەر تەرمی هەڤاڵەکەی تاسابوو ئێستاش ئەم قیژەیەی بەرچەم زیاتر سەرودڵی گرتبوو، شاهین بە بەرچەمی وت "تۆ شێتم دەکەیت، بێدەنگ بەو جارێکی تر قسە مەکە"، شاهین بە توڕەبوون و بە دەنگێکی بەرزەوە ئەم قسانەی بە بەرچەم وت، بەرچەم لە بێچارەییدا لەوێ دوورکەوتەوە.

شاهین و غالیب تەرمەکەیان لەشوێنێک ناشت، کەمێک هۆشیان هاتەوە سەرخۆ، دوای نیوەڕۆ بەرەو ئەشکەوتی جنۆکەکان بەرێ کەوتن، ئیتر کەسیان مەراقی ئەوەیان نەبوو کە ئایا لە ئەشکەوتەکە دوژمنی لێیە یان نا، بە توولە ڕێگەکەدا زۆر بێ خەمانە ڕێیان دەکرد، کە گەیشتنە نزیک

ئەشکەوتەکە لە نزیک زێیەکە هەستیان بە دەنگە دەنگ کرد، شاهین وتی "خۆتان درێژ کەن"، جگە لە شاهین کەسیان هەستیان بەمە نەکردبوو، غالیب وتی "شتێکم دی"، شاهین کەمێک چووە پێشەوە، دوو کەسی لەکەناری زێیەکە بینی، شڵەژا، هەردووکیان جلوبەرگی گەریلایان لەبەردابوو، خۆیان درێژ کردبوو، باشە ئەمانە کێن؟ شاهین ئیشارەتی بۆ غالیب و بەرچەم کرد کە بێنە لای، ئیتر هەرسێکیان دوو کەسەکەیان بینی، شاهین پرسی "دەبێت کێ بن؟" کەسیان وەڵامیان نەدایەوە، کەمێک زیاتر لێیان نزیک بونەوە، لەناکاو بەرچەم هاواریکرد "ئاریا و ساریا"، هێشتا قسەکانی تەواونەکردبوو بەرەو لایان کەوتە ڕاکردن، کەبەرچەم چووە بان سەریان بینی کە هەردووکیان لەژیاندان، غالیب و شاهینیش گەیشتنە لایان، بەرچەم بانگی لە ئاریا دەکرد، ساریاش چاوەکانی پڕبوو لە نیگەرانی و تەمومژ، ئاریا خەندەیەکی کرد، چاوەکانی نەبریسکانەوە، شاهین لێیانی پرسی "بۆچی واتان لێهاتووە؟" ئاریا وتی "لەوانەیە کەمێک برسیمان بێت!" ئاریا ئەم قسەیەی زۆر بە زەحمەت لەدەمی هاتەدەرەوە و هەردووکیانیان لەباوەش کرد و بردیانیان بۆناو ئەشکەوتەکە، بەرچەم وتی "کەمێکی تر دێمەوە"، لە ئەشکەوتەکە چووە دەرەوە، شاهین سەری ساریای خستبووە سەر ڕانی خۆی، کە بەرچەم گەڕایەوە ئازوقەی لەگەڵ خۆیدا هێنابۆوە، هەرسێکیان بۆچاک بوونەوەی ئاریا و ساریا ئەوەی لە دەستیان هات کردیان.

# ٢٤

٣ ڕۆژ بوو بەسەر دۆزینەوەی ئاریا و ساریا تێپەڕی بوو، دوای ٢ ڕۆژی تر دەبوایە هەموو گەریلاکان لە ئەشکەوتی جنۆکەکان کۆببنەوە، بۆئەوەی کەمپەکەیان بهێننەوە سەردۆخی جارانی شاهین و غالیب و بەرچەم هەوڵێکی زۆریان دەدا، ناو ئەشکەوتەکە پاککرایەوە و شوێنە ڕووخاوەکانی چێشتخانەکەیان کەمێک چاککردەوە و ئازوقەکانیان لە عەمبارەکە دەرهێناو لە چێشتخانەکە دایاننابوو، دوای ٤٠ ڕۆژ یەکەمجاریان بوو کەلە ئەم چێشتخانە خواردن لێبنێن.

گەنگەشەی نێوان شاهین و بەرچەم ببووە هۆی ئەوەی کەلە یەکتری زوویر بن، هەرچەندە هەردووکیان هەوڵیان دەدا کە بەرووی یەکدا نەتەقێنەوە، بەڵام زۆرجار ئەمەیان پێنەدەکرا، کاتێک قسەیان لەگەڵ یەکدا دەکرد هەوڵیان دەدا کە وادەربخەن کە هیچ کێشەیەک لە نێوانیاندا نییە، بەڵام زوویر بونیان و دڵ شکاندنیان لەیەکتری بە هەموو شێوەیەک پێیانەوە دیاربوو، ئێوارەی ٣ یەمین ڕۆژ ئەیهان و فورات بەخۆیان و گرووپەکەیانەوە گەیشتنە دەربەندی عەلی، لەبەرئەوەی بەدرێژایی زستان هیچ شەهیدبونێکیان لێنەهاتبووە ناراوە هەموو گرووپەکەیان ورە و مۆراڵیان لە شوێنی خۆیان بوو، کاتێک گرووپەکەی ئەیهان گەیشتنە دەربەندی عەلی ئەوەی مایەی سەرسوڕمانی شاهین بوو ئەوەبوو کە عیرفان و جودی و فەلات لەناویاندا بوو، هەرسێکیان بۆهێنانی ئازوقە چوبوون بۆ گوندەکە و ئیتر نەگەڕابونەوە، هەربۆیە بیریان لەوە کردبۆوە کەلەوانەیە هەڵهاتبێتن، شاهین شەرمی دەکرد کە کەلەبارەی ئەوانەوە وابیری کردۆتەوە و هەروەها لێیان زوویر بوو کە ئازوقەیان نەهێنابۆوە.

لە دەربەندی عەلی چادریان هەڵدا و شوێنی سەنگەرەکانیان دامەزراند و پاشان بۆقسەکردن لەگەڵ عیرفان شاهین بانگی کرد بۆ ئەشکەوتەکە، عیرفان دەیزانی کەبۆچی شاهین بانگی کردووە، عیرفان خۆیشی لەهەمبەر ئەم نابەرپرسیارێتیەی خۆی بە تاوەنبار دەزانی و شەو و ڕۆژ بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە، ئەو هەمیشە لەو ماوەیەدا بیری لەم لێپرسینەوەیە

کردبۆوە و لە مێشکی خۆیدا پرسیار و وەڵامەکانی نەخشاندبوو کە خۆی باوەڕی بە وەڵامەکانی خۆی هێنابوو، بەڵام کاتێک لە ئەشکەوتەکە چاوی بە شاهین کەوت هەموو قسەکانی ناو مێشکی لەبیرچۆوە، نەیدەتوانی تەماشای شاهین بکات هەربۆیە سەری داخستبوو، ئەوەی پێوەدیاربوو کەوەک تاوەنبار دیارە، شاهین لێی پرسی "بۆچی نەگەڕانەوە؟ "ئەویش وتی "ئێمە چوینە گوندەکەوە، ئازوقەمان ئامادەکرد، کاتێک لە مێد یف یەوە گوێمان لەهەواڵی شەڕ و پێکدادانەکان بوو لەگەڕانەوە پاشگەز بوینەوە"، شاهینیش پێیووت "تۆ باوەڕت بەم قسانەی خۆت هەیە؟ "ئەویش وتی "نەخێر! "شاهین پێیووت "کەوایە ڕاستێکان بڵێ"، عیرفانیش وتی "ئێمە بیرمان لە ئێوە دەکردەوە، بەڵام ڕاستێکەی ئەوەیە کە نەگەڕاینەوە"، شاهین نەیویست زیاتر چنگی پێهەڵچنێت، زاتەن عیرفانیش شتێکی ئەوتۆی نەبوو کە باسی بکات، شاهین لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە عیرفان تەنیا مایەوە، لەوە دەچوو تازە هەستی بە تاوانەکەی خۆی کردبێت.

بەرچەم بەردەوام بە ساریا و ئاریاوە سەرقاڵ ببوو، ڕۆژانە ٥ یان ٦ جارێک شۆربای دەدانێ و هەنگوینی عەمبارەکەشیانی بۆ ئەوان تەرخان کردبوو، لە ٣ یەمین ڕۆژدا قاورمەی بۆهێنان، ساریا زوو خۆی کۆکردەوە و کەمێک گرجوگۆڵ بۆوە، دەموچاوی ئیتر خوێنی تیا دەبینرا و گۆناکانی سوور هەڵگەڕابوون، ئێستاش هەردووکیان لەوە بێزار ببوون کە زوو، زوو شتێکیان دەخوارد، هەرکەکەوتنە قسەکردن ساریا دەیویست بزانێت بەینی لەگەڵ ئاریا چۆنە، هێشتا ئەو ناحەقییەی لەبیر نەکردبوو کە بەرامبەر بە ئاریا کردبووی، ئەو قسانەی کردبووی ئاریا شایەنی نەبوون، هەستی بە ئازاری ویژدانی دەکرد، هەرچەندە دەیویست بۆی بسەلمێنێت کە مەبەستی خراپ نەبووە، بەڵام ئاریا لە ئاستی قسەکانیدا خۆی لە گێلی دەدا، ساریا دەیویست ئاریا شتێک بڵێت و ئەم بابەتەیان دابخرێت، هەردووکیان کە قسەیان دەکرد لەگەڵ بەرچەم داوای ئەوەیان کردبوو کە دەیانەوێت کۆتایی کتێبە ڕۆمانەکە بزانن، ساریا لە بەرچەمی پرسی "ساڵی ١٩٩٦ تۆ لەناو ئەو ڕووداوانە بوویت؟ "بەرچەمیش وتی "بەڵێ"، ساریا وتی "ئەو بەرچەمەی لەناو کتێبەکەدا باسی

لێوەدەکرێت تۆیت؟ "بەرچەمیش بە پێکەنینێکەوە وتی "بۆ بەرچەمی تر هەیە، بێگومان منم"، سارپاش وتی "کتێبەکەمان تەواو نەکرد مەراق کۆتاییەکەین، دەتوانی بۆمانی باسکەیت؟ "سەرەتا بەرچەم نەیدەزانی بۆیان باس بکات یان نا، دوایش بۆئەوەی مەراق ئاریا و ساریا نەهێڵێت وتی "ئێوە پرسیار بکەن و منیش وەڵام دەدەمەوە"، پرسیاری هەردووکیان وەک باران بەسەر بەرچەمدا دایکرد، "ئەی بزنە کێویە کوێرەکەت چی بەسەرهات؟ "ئەم پرسیارە بەس بوو کە بەرچەم بەرێتەوە بۆ زستانی ساڵی ١٩٩٦، خەندەیەکی پڕ بە ئازاری لەسەر لێوەکانی بەدەرکەوت و پاشان وتی:

"دوای ئۆپەراسیۆنەکە ون بوو، دوای ماوەیەک کە هاتینەوە بۆ کەمپی کافکەسۆر بزنە کێوێکەمان لەوێ دۆزیەوە، دوایش ڕۆژێکیان سەریم بینی، یەکێک سەری بزنە کێوێکەی بڕی بوو، ئێستاش نازانم کێ سەری بڕی".

"ئەی باشە دەرەنجامی ئەو ٣ کەسە چی بەسەرهات کە هەڵاتن؟"

"کامە سیان؟"

"ئەو ٣ کەسەی کە چوون بۆهێنانەوەی شامیل؟"

"مەبەستان شەڤگەرە؟"

"بەڵێ".

"هەواڵیانمان نەزانی، بەڵام دەزانین کە خۆیان ڕادەست نەکردۆتەوە".

"بەرخودان و چیا کەبەهۆی ئەسپێوە شەهید بوون ئەمە زۆر کاریگەری لێکردین، مرۆڤ چۆن بەهۆی ئەسپێوە شەهید دەبێت؟"

"کەس بەمە بڕواناکات، بەڵام مەخابن ڕاستە، تەنها بەرخودان و چیا شەهید نەبوون، ئاگریش شەهید بوو، بێگومان هۆکاری شەهیدبونیان تەنها ئەسپێ نییە، برسێتیش زۆر کاریگەری لێکردبوون، بێهێز ببوون، کە هەموو ئەم شتانە لەیەک شوێن کۆبونەوە ئیتر بەدەن تەحەمولی نامێنێت".

"ئەی باشە شێخ مووس چی بەسەرهات؟"

"ئەومان بۆ باشوور ڕەوانە کرد، خرایە ژێر تەداویەوە، ئێستا لەبارەیەوە زانیاریم نییە".

"ئەی قارەمان هێشتا لە ژیاندایە؟"

"دەمزانی کە ئەم پرسیارە دەکەن، هەتا ئێستا لەناو ئەو هەڤاڵانەی بینیومن هیچیان ئەوەندەی قارەمان ڕۆح سووک و شیرین و بەتوانا نەبوونە، ڕاستە لە نێوان هەڤاڵانماندا جیاوازی ناکرێت، بەڵام ئەو زۆر جیاواز بوو، ئەو زستانە زۆر خۆڕاگرانە جموجۆڵی دەکرد، دوژمن هەتا بەهار خۆیان پێمانەوە سەرقاڵ کرد، کە گەیشتینە وەرزی بەهار حەوسەڵەمان نەمابوو، ئەو نیشانیدا کە دەبێت فەرماندەی ڕاستەقینە چۆن هەوڵبدات تاکو گرووپەکەی ڕزگار بکات، لە هاویندا لە شەڕێکدا شەهید بوو، تەنانەت بەیەک فیشەک شەهید بوو".

ئیتر ئاریا و ساریا پرسیاریان نەکرد، کە بەرچەم باسی قارەمانی کرد دڵی پڕبوو، ئەوکاتەی ساریا و ئاریا پرسیاریان نەما ئەمجارەیان بەرچەم کەوتە پرسیار کردن، بەرچەم وتی "لەڕاستیدا لە کۆتایی کتێبەکەدا زیلان هەبوو، دەبێت باسی ئەویش بکرێت، لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٦ چالاکی گیانبازی ئەنجامدا، ئەویش لەناو ئەو دۆخە سەختەی ئەو زستانەدا ژیا، هەرکە بەفر لە ئارادا نەما چووە خوارەوە بۆ دەرسیم و ئەو چالاکییەی ئەنجامدا، ئەو لەگەڵ ئەو سەرمایە و چیایانەدا ڕانەهاتبوو، شارەزای شاری دەرسیمیش نەبوو، نارەحەتییەکی زۆری بۆ درووست بوو، ئازارێکی زۆری چێژا، دیاربوو کە ئازارەکانی زیاتر هۆشیان هێنابووە سەرخۆی، هەرگیز سکاڵای نەکرد، ئەو بە شتی بچووک ڕازی نەدەبوو، بەگوێرەی ئەو دەبێت مرۆڤ لە ناو ژیانی شۆڕشگێڕێتیدا لەناو چالاکی زۆر مەزن و لەناو ژیانێکی گەورەی پڕ واتاداردا سەنگەر بگرێت، ئەو بەو شێوەیە ژیا کە بیری لێدەکردەوە و چالاکییەکی بەو شێوەیەی ئەنجامدا". بەرچەم قسەکانی خۆی بڕی و هەستایە سەرپێ، ئەوکاتەی ویستی لە ئەشکەوتەکە دەرچێت ئاریا هاواری لێکرد و پێیووت "ئەرێ عەلی موسا هەڵات؟ "بەرچەم بەم پرسیارە شڵەژا و ئاوڕی دایەوە و تەماشای ئاریای کرد، بەرچەم وتی "بەڵێ هەڵات تۆ لەکوێ ئەمە دەزانیت؟ "ئاریاش وتی "ئەوم لێرە لەم کەمپە لەگەڵ سەربازەکاندا بینی، ئەو ئاربێجی نابە چێشتخانەکەوە". بەرچەمیش وتی "تۆڵەی لێدەکەینەوە".

بەرچەم دوای ئەم قسەیەی لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە، ماوەیەک لەبەردەم چێشتخانەکە ڕاوەستا، دەیویست ماوەیەک بە تەنیا بمێنێتەوە،

کاتێک بیری لە دۆزینەوەی پەنایەک دەکردەوە کە سەری خۆی پێدابکات لەناکاو چاوی کەوت بە شاهین کە لەگەڵ چەند هەڤاڵێکیدا لە گردەکە دەهاتنە خوارەوە، دیاربوو دوو گەریلا شتێکیان هەڵگرتبوو، دوای ماوەیەکی کورت زانرا کە ئەو دوو گەریلایە چییان هەڵگرتووە، کە گەیشتنە کەمپەکە بینیان کە تەرمی ئوزگور و ساڵحیان پێیە، هەردووکیان تەرمەکانیان پارچە، پارچە کرابوو، کاتێک بەرچەم تەرمەکانی بینی ئەو تەرمەی کەوتەوەیاد کەلە سیتەکە دەریان کردبوو، سەری لە خۆیان سوڕمابوو کەچۆن دەتوانن سەرەڕای ئەو هەموو تابلۆ دڵتەزێنانە هێشتا تەحەمولیان ماوە.

بەرچەم وتی "هەردووکیان لەگەڵ عەلی موسا چاودێر بوون"، دوو گۆڕیان بۆکردن، هەموو گەریلاکان مەراسیمی فەرمی بە خاک سپاردنیان بۆکردن، ڕۆژی دوایی باگەر لەگەڵ گرووپێک و دوایش ئیبراهیم لەگەڵ گرووپەکەی گەیشتنە کەمپەکە، دوای ٤٠ ڕۆژ گەیشتنەوە بەیەک، هەموویان لەناو خۆیاندا باسی بەسەرهاتی ئەو ٤٠ ڕۆژەیان بۆیەک دەکرد و هەندێکجار غەمبار دەبون و بیریان لە هەڤاڵە شەهیدەکانیان دەکردەوە، ئێستا بەرچاوترین کەسی ناویان لە کەمپەکەدا بێشک ئاریا و ساریا بوون، مانەوەیان لە ژیاندا هەموویانی سەرسام کردبوو، ٤٠ ڕۆژ بەتەواوەتی بە برسێتی مابونەوە.

تەنها لەپێناو فەرمانێک ماوەی ٤٠ ڕۆژ لە شوێنی خۆیان مابونەوە، هەرچەندە لەلایەکەوە ئەمەیان بوو بە مایەی حەنەک و پێکەنینی هەموو گەریلاکان و لەلایەکی تریشەوە گەریلای نوێ بوون و تەمەنیان بچوکیشە ببوونە مایەی سەرنجی هەموویان، هەموویان بەردەوام پرسیاریان لێدەکردن کە چۆن ئەو ٤٠ ڕۆژە بە برسێتی ماونەتەوە و بیریان لە مردن کردۆتەوە یان نا و چۆن کاتیان بەسەر بردووە و قسەی چییان لە نێوان خۆیان کردووە و ئەوکاتەی دوژمن هات چییان کردووە، لەئاکامدا بەگشتی هەردووکیان بۆ هەموو گەریلاکان مایەی شانازی بوون لە دەربەندی عەلی.

دوای چەند ڕۆژێک باگەر لە کەمپەکە بەتایبەتی کۆبونەوەیەکی لەگەڵ ئاریا و ساریا سازدا، بەبێ ئەوەی درێژە بە قسەکانی بدات پێیووتن "بەشێوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا لێتان دەپرسم، بەهەمان شێوەش وەڵامم لێتان دەوێت،

بەبێ شەرم و نارەحەتی دەمەوێت قسەبکەین "، هەردووکیان دەیانویست لەمەبەستی باگەر حاڵی ببن چونکە هیچ حاڵی نەبوو بوون، باگەر پێیانیوت "مەبەستم ئەوەیە ئێوە تەمەنتان هێشتا نەبووە بە ١٨ ، هەرکە بوون بە گەریلا ڕوبەرووی نارەحەتییەکی زۆر بونەوە کە هەموو کەسێک بەرگەی ناگرێت، ئەگەر دەتانەوێت بۆماڵەوە ڕەوانەتان دەکەین، دوایی دەتوانین جارێکی تر پەیوەندی بەیەکەوە بگرین، ئەگەر ویستان دەتوانن دوای ماوەیەکی تر ببنەوە بە گەریلا "، هێشتا باگەر قسەکانی تەواو نەکردبوو ساریا وتی "ئێمە منداڵ نین "، ئەم قسەیەی ساریا ئاریاش پێی سەیر بوو، بەڵام لەبەرئەوەی هەمان هەستی ئەویشی هێنابووە زمان، پشتگیری قسەکانی کرد.

ساریا وتی "ئێمە بەشداری ناو پەکەکە نەبوین بۆئەوەی بماننێرنەوە بۆ ماڵەوە، ئێمە هاتووین بۆشەڕکردن "، ئاریاش وتی "ڕاستە ئێمە ٤٠ ڕۆژ بە برسێتی ماینەوە، بەڵام ئێوەش لە هەمان ڕەوشدا بوون، شەهیدێکی زۆرتاندا، لەهەمانکاتدا ئێمە هەموو ئەمانەمان دەزانی کەدێنە ئاراوە سەرەڕای ئەمەش بڕیاری خۆماندا کە ببین بە گریلا "، باگەر وتی "باشە، توڕەمەبن، من تەنها ویستم بۆچونی خۆم بهێنمە زمان و بیروبۆچونی ئێوەش بزانم ".

چەندین ڕۆژ بەسەرچوو، کۆتایی مانگی حوزەیران بوو، کەمپەکە گەڕابۆوە دۆخی جارانی، ئەشکەوتی جنۆکەکان وەکو جارانی جمەی دەهات، دوای شەڕ و پێکدادانەکان بەدەنی هەموویان خامۆش ببۆوە، بەهار بە هەموو شێوازێکی خۆیەوە خۆی دەرخستبوو، هەتا دەهات کەشوهەوا گەرم دەبوو.

باگەر چەند ڕۆژێک بوو لە چاوەڕوانی ئەو هەواڵە بوو کە چاوەڕێی بوو، هەرچەندە هەوڵی دەدا کە شڵەژاوی خۆی بشارێتەوە، بەڵام بێ ئۆقرەیی پێوەدیار بوو، دەتوانرا بەمە بوترێت بێدەنگێکەی پێش تەقینەوەکە، هەموویان لەوە دڵنیابوون کەشتێک دێتە ئاراوە، هەمووشیان لە چاوەڕوانیدا بوون، لە چادری فەرماندارێتیان باگەر و شاهین بەگەرمی لەنێوان خۆیاندا قسەوباسیان بوو، دوای ئەوەی دەردەسەری و ئازاری ٤٠ ڕۆژەیان تێپەراند و بەختەوەر ببوون ئێستاش هێواش، هێواش خەریک بوو ئاسەواری ئەو دەردەسەریانەیان کاڵ ببێتەوە، کاتێک بانگەوازیەک لە بێتەلەکەی قەد باگەر

بەرزبۆوە، بەخێرایی وەڵامی دایەوە، ئایا ئەو هەواڵە بوو کە لە چاوەروانیدا بوو؟ دیاربوو دەنگەکەی بێتەلەکە ئەوی بەختەوەر کردبوو، تەمومژی رووخساری رەوییەوە و ئاسودەیی لە سیمایدا دەرکەوتبوو، شاهین نەیدەزانی کەباسی چییان کردووە، مادام باگەر بەختەوەر ببوو کەواتە شتی باش هاتونەتە ئاراوە، شاهین مەراق دایگرتبوو، بەڵام هەتا باگەر قسەی بۆنەکردایە نەیدەویست پرسیاری لێبکات، باگەر بێتەلەکەی خستەوە گیرفانی چەپی، تەماشایەکی شاهینی کرد و پاشان پێیووت "بانگی ئیبراهیم و ئایهان و فورات و پالۆ و بێستا بکە "، شاهین چووە دەرەوە، هێشتا دوورنەکەوتبۆوە باگەر هاواری لێکرد و پێیووت "بەرچەمیشت لەبیر نەچێت "، دوای چەند خولەکێک هەموویان کۆبونەوە، هەموویان مەراقیان بوو، باگەر وتی "دەچین بۆ رۆژهەڵاتی دەرسیم "، کەسیان هۆکارەکەیان نەدەزانی، مەراقیان زیادی کرد، ئەگەر قسەی تری بۆیانبکردایە باشتر حاڵی دەبوون، لەئاکامدا باگەر پێیانیوت "ئێمە دەزانین کە دوژمن چاوی لەبەشی رۆژئاوای دەرسیم و دەربەندی عەلی بڕیوە و خۆیان بەم دوو شوێنەوە سەرقاڵ کردووە، ئێمەش لە رۆژهەڵاتی دەرسیمەوە هێرش و چالاکی ئەنجام دەدەین "، بەگوێرەی باگەر بێت هەموو شتێک لەباشیدایە و هەموو شتێک بەگوێرەی تەخمینەکانی خۆی رۆشتووە بەڕێوە و هەرکە گەیشتنە ئەوێ چواردەوری دەرسیم دەگرن، شاهین وتی "لەوێ هێزێکی زیاد لە ١٠٠ کەسیمانی لێیە "، لەراستیدا کە باگەر ئەمەی هێنابووە زمان مەبەستی ئەوەنەبوو کە خۆی لەراستێکان بشارێتەوە، بەڵام لادان لە ئەگەرەکان و راستێکان کێشەیەکی گەورەبوو، باگەر وتی "راستە، هێزێکی ١٠٠ گەریلایی لەوێدا هەیە، بەڵام ئەم چالاکییە کە ئەنجام دەدرێت بە ١٠٠ کەس ناکرێت "، پەیتا، پەیتا پرسیارەکانی ناو مێشکی شاهین وەڵامی بۆ نەئەدۆزرانەوە هەربۆیە لە دڵی خۆیدا وتی وادیارە بە نیازە شاری دەرسیم بگرێت، باگەر بە دوور و درێژی باسی پیلانی ئەو چالاکییەی بۆکردن کە بە نیازی بوو، لە کۆتایەکەشیدا هۆشیاری کردنەوە، پێیووتن "باسی ئەم چالاکییە بۆکەس ناکرێت، تەنها دەتوانن بڵێن دەچین بۆ ملەی رۆژهەڵات "، بۆگەیشتن بە ملەی رۆژهەڵاتی دەرسیم پێویستیان بە رێکردنێکی زۆر هەبوو، دواهەمین مەنزڵیان مونزوور

بوو، هەموو گەریلاکان خوازیاری تۆڵەسەندنەوەی کارەساتەکانی ئەو ٤٠ ڕۆژە بوون، هیچ شتێک لە دونیادا ئەوەندە سرووشتی نییە کە مرۆڤ لەناخی خۆیدا هەستی تۆڵەسەندنەوە هەڵبگرێت، باگەر هەستی بەوە دەکرد کە ئەم هەستی تۆڵەکردنەوەیان هەموویان بەرەو چالاکییەکی مەزن دەبات، زاتەن هەرلەبەر ئەمەش بوو کە دەیویست ئامادەباشێکان بە نهێنیانە ئەنجام بدرێت.

هەتا دەهات کەشوهەوا خۆشتر دەبوو، ئاسمان ساماڵ و تیشکێکی گەرمی خۆر لەبان سەریان بوو، سرووشت ڕەنگاورەنگ بوو ئەمەش بەس بوو بۆئەوەی کە ڕۆژانی پڕ لە سەرما و زەحەمتیان لەبیر بەرێتەوە، چەندین ڕۆژ بەسەرچوبوو کە هەموویان گەیشتبوونە ناوچەی ( دەمەنانی ) نزیکی ملەی ڕۆژهەڵاتی دەرسیم، ئەم ناوچەیە بە ناوی عەشیرەتی دەمەنانینیەوە کەلە شۆڕشی دەرسیمدا لەهەمبەر کۆمەڵکوژی دەوڵەتی تورک بەرخودانیان کردبوو، لەسەرووی گوندی دەمەنانەوە زنجیرە چیاکان دەیان ڕێ و گرد و هەوراز و نشێوی لەخۆگرتبوو کە بۆ گەریلا جوغرافییەکی زۆر گونجاو بوو، لەناوچەی دەمەنان گژ و گیا و دار و درەخت و گەڵاکان سەوز ببونەوە و دونیا ڕەنگاورەنگ ببوو، هیچ ئاسەوارێکی سەختی زستان لەئارادا نەمابوو.

ڕۆژی دوایی لە ملەی ڕۆژهەڵاتی دەرسیم هێزەکەیان لەو شوێنە گەیشتنەوە باگەر کە لەناوخۆیاندا دیاریان کردبوو، ژمارەیان لە ٢٥٠ گەریلایەک تێپەڕی بوو، کۆبونەوەی هێزێکی وای گەورە لەناو گەریلاکاندا جۆشوخرۆشی هێنابووە ئاراوە، ئێستا کاتی هێز و جوامێری و مۆڕاڵ بوو لە هەمووشیان گرنگتر کڵپەی تۆڵە سەندنەوەی ناخیان گڕی گرتبوو، ئەو ڕۆژەی هەموو گەریلاکان بەیەک گەیشتن دیلانیان کرد، ئاگریان کردەوە و سکێچیان نمایشکرد و سروودیان وتەوە و شیعریشیان خوێندەوە، دوای ئەوەی چەند ڕۆژێک پشویاندا نیتر کاتی ئەنجامدانی چالاکێکە هاتبوو، چالاکێکە لەناوچەیەکی بەرفراوان ئەنجام دەدرا، دەبوایە بەتەواوەتی ئامادەباشیەکان ئەنجام بدەن، باگەر دەیویست بەتایبەتی خۆی سەرقاڵی دوا ئامادەباشیەکان بکات، باگەر لەگەڵ خۆیدا شاهین و ئیبراهیم و فەرماندەی گرووپی ڕۆژهەڵات کە مەزڵوم بوو برد و لە دەمەنان جیابۆوە و بەم شێوەیە هەموو گەریلاکان بۆیاندەرکەوت کە شتێکی

گەورە لەئارادایە، هەتا بەیانی ڕێیان کرد، هەر چواریان گەیشتنە قەد پاڵی گردێک، ئەمان بەم جوغرافییە نامۆ نەبوون، بەبێ هیچ کەمتەرخەمییەک نزیکەی مانگێک بوو چاودێری سەنگەرەکانی دوژمنیان کردبوو، بەڵێ گردی ( دۆلۆبابا ) لەهەمبەریان بوو، مەزلوم پێیووتن "بەڵێ ئەمە شوێنەکەیە". باگەر هەرکە ڕۆژبۆوە بە دووربین کەوتە چاودێری کردنی گردی دۆلۆبابا. دۆلۆبابا هەروەکو ناوەکەشی ناوچەیەکی سەرنج ڕاکێشەبوو.

ئەوکاتەی لە چواردەوری دەرسیم باران دەبارێت، بەڵام لەسەر ئەم گردەی دۆلۆبابا تەرزە دەبارێت، ناوەکەشی لەمەوە وەرگرتووە، دەستپێکی ئەم گردە بەردەڵانە و لێژایەکەشی بە گوندی ( ئێکسۆر ) کۆتایی پێدێت، هەروا بە ئاسانی ناتوانرێت دەست بۆ ئەم گردە درێژ بکرێت، سوڕانەوە بە چواردەوری گردەکە ماوەی کاتژمێرێکی دەوێت، سەرگردەکە و چواردەورەکەشی هەمووی سەنگەری سەربازییە، بەسەر گردەکەوە لووتکەیەکی بچووک هەن، خەڵکی بە ئێرە دەڵێن سەر لووتکەی گردی دۆلۆبابا، سەر ئەم لووتکەیە قیتە و بەردەڵانیشە، هەڵگژان بە ئێرەدا غیرەتی دەوێت، لووتکەکەی ئەوەندەی گۆڕەپانێکی دووگۆڵی پانە، لێرە دەتوانرێت ئاڤگەسۆر و ئێکسۆر و ئاڤپانۆس و چیاکانی دەمەنان ببینرێت، هەرچەندە زێیەکان لە زۆر شوێنی ئێرەشدا دیاریش نەبن، بەڵام بەگشتی بۆ بینینی زێیەکان و زنجیرە چیاکان و گردەکان و قەدپاڵەکان باشترین شوێنی گونجاو دۆلۆبابایە، سەربازەکان بۆئەوەی هەموو ناوچەکان بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە چاودێری هاتوچۆکانی گەریلا بکەن ماوەی مانگێکە لێرە جێگیر کرابوون.

لەسەر ئەم گردە قۆڵێکی تری زۆر هەیە، بەهۆی ئەم قۆڵانەوە گردەکە بە زۆر شوێنی ناوچەکە بڵاوبۆتەوە، قۆڵە گرنگەکەی گردەکە دەچێتە سەر زێی کورتی و حەیدەرلەنلەر و دەمەنان کە ئەمانەش بەخۆیانەوە کۆمەڵە گرد و گردۆڵە پێکدەهێنن و هەروەها زنجیرە چیایەکیش بەیەکەوە گرێ دەدەن، قۆڵێکی تریان درێژ دەبێتەوە بۆ مونزوور، بەم شێوەیە لەزۆر قۆڵەوە دەتوانرێت دەست بۆ گردی دۆلۆبابا ببرێت، بەڵام لەبەرئەوەی هەموو قۆڵەکانیش لەلایەن سەربازی سوپای تورکەوە گیراون گەیشتن بەم

شوێنە خۆیلەخۆیدا کێشەیەکی گەورەیە هەربۆیە لەناو خۆیاندا هەرچوار فەرماندەکە گەنگەشەیەکی جدیان برد بەڕێوە، سەرەتا مەزڵوم ئیشاراتی کرد بۆ ڕێگەیەک و وتی "یەکێک لەو ڕێگەیانە بەکار دەهێنین"، باگەر ئەمەی بە دڵ نەبوو، هەربۆیە وتی "هێزەکەی ئەوێ دەتوانن زۆر بە ئاسانی بە دووربینی شەو بمانبینن"، مەزڵوم وتی "چارەی ترمان نییە"، باگەر جارێکی تر بە دووربین کەوتەوە تەماشاکردنی شوێنەکە، بە وردی لە هەموولایەکی وردبۆوە، لە خوارەوە لە لێژایەکە گوندی ئێکسۆری لێیە، ئەوێ زۆر لێژاییە، گەیشتن بە گوندی ئێکسۆر کە گوندێکی وێران بوو مەحاڵ بوو، جارێکی تر مەزڵوم وتی:

"لە گوندەکەوە زێیەک نییە بچێت بۆ گردەکە هەربۆیە ناچارین ئەسوڕێینەوە و خۆمان ئەگەهێنینە نزیک گردەکە".

باگەریش وتی:

"لەلێژاییەکە ڕێگەی تر نییە؟"

"زێیەکی بچووک هەیە بەردەلانە، بەڵام مەحاڵە بکرێت لەوێوە هەڵگژێین، زاتەن کەلەوێوە هەڵگژێین ئەوەی ڕاستەوخۆ ڕوبەڕوی دەبینەوە بێشک سەنگەری سەربازەکانە، ئەگەر بەوێدا هەڵگژێین ئەگەر یەک بەرد لەژێر قاچمان بترازێت یەکسەر ئاشکرا دەبین!"

"ئەی ئەگەر هەستمان پێ نەکەن؟"

"بەڕای من ئەمە زۆر مەحاڵە".

"بەگوێرەی ئەوەی کە سەربازەکان تەخمینی ئەوە ناکەن کە کەس لێرەوە نایەت کەواتە خاڵی لاوازی ئەوان ئەوێیە".

"نەخێر ئەمە زۆز مەحاڵە".

"زاتەن منیش باسی ئەمە دەکەم ئەو مەحاڵەی تۆ باسی دەکەیت، کاتێک سەربازەکان چاویان لەسەر شوێنێکی ترە ئێمەش دەچینە سەنگەرەکانیانەوە".

"باشە".

مەزڵوم بە دووربینەکەی کەوتەوە تەماشاکردن، پاشان وتی:

"لەبەرئەوەی سەربازەکان دڵنیان لەوەی کە کەس ئەم شێتییە ناکات بۆیە

پشتی خۆیان کردۆتە ئەوێ".

باگەریش وتی "باشترین شت ئەوەیە کە ئەم شێتییە بکرێت".

ئەمجارەیان شاهین بە دووربینەکە کەوتە تەماشاکردن، شاهین وتی "بڕوانن، لەو حاڵەتەی کە هەڵبگژێین و درکمانیش پێنەکەن دەبێت یەکەم کارمان هێرشکردنە سەر ئەو سەنگەرانە بێت، ئەوانی تر ئاسان دەبن، لەوانەیە لە چەند خولەکێکدا چەند سەنگەرێک بگرین، سەربازەکان یان لە سەنگەرەکانیان دەمرن یان خۆیان فڕێ دەدەنە خوارەوە بە هەردوو شێوەکە هەر دەمرن"، مەزڵوم وتی "وادیارە چیرۆکی ئەم لێژاییەتان نەبیستووە! "باگەر وتی "دەزانم". شاهین ئەم چیرۆکەی نەبیستبوو هەربۆیە بە مەراقێکەوە ویستی پرسیار بکات، بەڵام مەزڵوم وتی "هیچ نەتبیستووە کە خەڵکی ئێرە بۆ ئەوەی لەدەستی کۆمەڵکوژی دەوڵەتی تورک ڕزگاریان ببێت لەم لێژاییە خۆیان فڕێداوەتە خوارەوە". شاهین وتی "بیستومە ئەم لێژاییە ئەوێیە". شاهین حەپەسابوو، هەموو کەس لەبارەی بەرخودانەکانی دەرسیمەوە زۆر چیرۆکیان گوێ لێبووە، بەڵام یەکەمجار بوو کە بزانن کچ و ژنی ئەم ناوچەیە بۆئەوەی خۆیان ڕادەست نەکەن و ناموس و حەیایان لەکەدار نەبێت لێرەوە خۆیان فڕێداوەتە خوارەوە.

هەتا ئێوارە چاودێری جموجۆڵی سەربازەکانیان کرد، چەندینجار نێوانی سەنگەرەکانیان بە تەخمینی خۆیان نوسیبەوە و هەروەها ئەوەشیان لەلای خۆیان نووسی کەبەقەد پاڵەکەوە چەند سەنگەر هەیە پاشان لەوێ جیابونەوە، ئەمجارەیان بۆئەوەی بچنە شوێنی هەدەفێکی تریان کەوتنە ڕێ، هەدەفی ئەمجارەیان ڕێگەی نێوان دەرسیم و ئۆڤاجک بوو، ئاوی مونزوور بە زیکزاک هەروەکو هەموو جارێکی بە بریق و باق بەرەو دەرسیم خوڕەی دەهات، بەدرێژایی ڕێگەیان بۆ بینینی شوێنی مەبەستیان چاویان لە ئاوی مونزوور و خاکە بە بەرەکەتەکەی کرد.

دوای ٥ کاتژمێرێک توانیان بگەنە کەناری ئاوی مونزوور، دەسەڵاتداری موتڵەق ئەم شەو هەروەکو هەمووجارێک هەرئاوی مونزوور بوو، چاودێری ئاوی مونزوور و ڕێگەکەیان دەکرد کە قەدپاڵێکی ڕووتەڵە بوو، باگەر ئەم

شوێنه ڕووتەڵەیەی بۆ شوێنی بۆسە بەکاردەهێنا، باگەر بە باشی تەماشای قەد پاڵەکەی کرد، بە ئاسانی هەموو لایەکی دەبینرا، تەنانەت یەک دانە بەردیش نەبوو لێرە، بچوکترین شت لێرە ڕوویبدایە بە دووری چەندین کم دەبینرا، لەناو ئەو تاریکییەدا باگەر بەسەر ئەو گردە ڕووتەڵەیەدا بوو کە لەگەڵ هەڤاڵەکانی بۆ شوێنی بۆسە بەکاریان دەهێنا کە هێشتا بیریان لە پیلانەکەی نەکردبۆوە، باگەر دەیویست پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە وردەکاری شوێنەکانی بزانیایە و کەشفەکەی تەواو بکردایە، باگەر شاهین و مەزلومیشی لەگەڵ خۆیدا بردوو بە قەدپاڵەکە سوڕانەوە، باگەر دەیویست شوێنێکی گونجاو بۆ بۆسەدانان بدۆزێتەوە کە بتوانێت بەباشی ڕێگەکان ببینێت، باگەر بەوە بەختەوەر بوو کە شوێنێکی دۆزیبۆوە کە بەسەر ڕێگەی نێوان دەرسیم و ئۆڤاجکدا زاڵ بوو.

باگەر لە شاهینی پرسی "ئێرەت لاچۆنە؟ "شاهینیش وتی "بۆ بۆسە؟"

"بەڵێ بۆ بۆسە"

"لێرە بۆسەدانانرێت، لەدووری چەند کم وە دەتوانن ئێرە ببینن".

"ئەم شوێنە ٢ کم درێژە، ڕاستە شوێنەکە ڕووتەڵەیە، بەڵام لەولایەوە دارستان هەیە، دوژمن لەوێوە بە تەدبیرەوە دێت، بەڵام لەبەرئەوەی لێرە بیر لە مەترسی ناکاتەوە بێ تەدبیرانە ڕێدەکەن، ئەگەر بە درێژایی ئەم ٢ کم بۆسە دابنێین بەدەیان ماشێنی سەربازی دەسوتێنین".

"ڕاستە دەتوانین لێیان بدەین، بەڵام ئەگەر لە دووری چەند کم وە ئەمان ببینن".

"نا.. نا، نامانبینن".

لە شوێنەکەی خۆیانەوە باگەر بەرەو دارستانەکەی خوارەوە ملی نا، ئەوانی تریش بەدوای کەوتن، ئەو ڕۆژە لە ناو دارستانەکە بە درێژایی ڕۆژ لە نێوان خۆیاندا گەنگەشەیان کرد، بەدرێژایی گردەکە بۆسەیان دادەنا، خاک و خۆڵ نەرم بوو، لەبەرئەوەی بەهار خاکوخۆڵی نەرم کردبۆوە بە ئاسانی سەنگەر درووست دەکرا، بە درێژایی ٢ کم ٢ بۆ ٣ سەنگەرێکیان درووست دەکرد کە هەریەکەیان ٢ کەسێکی بگرتایە.

شاهین وتی "ئەی ئەگەر هێزی دوژمن نەهات؟ "باگەریش وتی "هەردێن،

ئەوکاتەی هەڤاڵان هێرش بۆسەر گردی دۆلۆبابا دەبەن لێرە هێزی فریاکەوتنیان ڕەوانە دەکەن ". بەگوێرەی ئەو پیلانسازییەی کردیان ئەگەر سەرکەوتوبونایە ئەوا لە مێژووی هەرێمی دەرسیمدا گەورەترین چالاکییان ئەنجام دەدا، بەڵام لەحاڵەتی کەشەفبوونی ئەم پیلانەیان ئەوا ژیانی ۲۵۰ گەریلا دەکەوتە مەترسییەوە کە بیرکردنەوەش لەم مەسەلەیە خۆیلەخۆیدا کارەسات بوو، مەترسێکان زۆر گەورەبوون یان سەرکەوتنێکی گەورە یان دۆراندنێکی گەورە.

ڕۆژی دوایی گەیشتنەوە ئەو شوێنەی گەریلاکانی لێبوو، ۱۵۰ گەریلا بە فەرماندارێتی مەزلوم و ئیبراهیم بۆسەیان دادەنا، گەریلاکانی تریش بە فەرماندارێتی باگەر و شاهین هێرشیان دەبردە سەر گردی دۆلۆبابا، سەرەتا ئەوەیان دیاریکرد کە هێزەکانیان چۆن دەجوڵێتەوە و چالاکێکە کەی و کام ڕۆژ ئەنجام دەدرێت و سەرەتا کامیان و چۆن و لەکوێ دەست دەوەشێنن، دوای دوو ڕۆژ هەموو گەریلاکان گەیشتبوونە شوێنی خۆیان، بۆ دەست وەشاندن لە گردی دۆلۆبابا دەبوایە دوو شەو چاوەڕوانیان بکردایە، لەبەرئەوەی ئیبراهیم و مەزلوم دوو ڕۆژیان داواکردبوو هەتا سەنگەرەکان تەواو دەکرێن، ئەم دوو ڕۆژە بۆ باگەر ئەوەندەی شەوانی شەوچرا درێژبوون تەواوبوونی نەدەزانی، باگەر دەیویست بە زووترین کات هێرش بکەن و تۆڵەی ئەو ۷۰ شەهیدیان بکەنەوە کەلە کاتی زستاندا بە گشتی لە هەرێمەکە دابویان و گڕی قین و نەفرەتی خۆیان بەم هێرشە خامۆش بکەنەوە، ئیتر بێزار ببوون لەو دەموچاوەی خۆیان کە ئازار و مەینەتی پێوە نیشابۆوە، دەیانویست لە سیمایاندا سەرکەوتن و بەختەوەری ببینن و گوێیان لە قسەی خۆشی و شادی یەکتر بێت.

باشترین کات بۆ هێرشکردن کاتژمێر ۳ ی شەو بوو، ئەم کاتە ئەو کاتەبوو کە دوژمن چاوەڕێی ئەمانی نەدەکرد، ڕاستە دەستپێکردنی چالاکێکە لەم کاتەدا زۆر گونجاو بوو، بەڵام ئەگەر کشانەوەیان لە دوای چالاکێکە لەکات و ساتی خۆیدا ئەنجام نەدرێت و نەگەیشتنەوە شوێنی مەبەستی خۆیان ئەوا ڕووبەرووی مەترسی گەورە دەبونەوە.

شاهین لەبەرئەوەی سەربازی کردبوو دەیزانی کاتژمێر لە ٣ بەدواوە ئیتر سەربازەکان کارەکانیان بەجدی نەدەگرت، لەناو خۆیاندا باسی ئەوەشیان کردبوو کە لە کوێ گونجاوی و نەگونجاوی شوێنی چالاکیکەیان هەیە، ئەو هەڤالانەی سەرقاڵی سەنگەربوون دوای ئەوەی خۆڵیان هەڵدەکەن لەبەرئەوەی بارانێکی زۆر باری بوو چاڵەکەیان پڕ بوو لە قوڕ، بارانێکی زۆریان بەسەردا باری دیار بوو بەخت یاوەریان نەبوو، گەریلاکان لەژێر ئەو بارانە و ناو قوڕی چاڵەکاندا حەوسەڵەیان نەمابوو، زۆر ناڕەحەت بوو کەلەو چاڵە قوڕاوی و پڕ ئاوەدا بەبێ ئەوەی هیچ بکەیت لەژێر ئەو بارانەدا چاوەڕوانی بکەیت، بەڵام ئیتر چارەی تریان نەبوو چونکە کەمی مابوو کە چالاکیکە دەستی پێبکات.

گرووپەکەی باگەر بە فەرماندارێتی شاهین لە گوندی ئێسکۆر بەڕێ کەوتن و بە بەرزایەکەدا هەڵگژابوون، هەرچەندە باگەر ویستبووی کەلەناو گرووپی هێرشبەردا جێبگرێت، بەڵام شاهین ئەمەی قەبوڵ نەکردبوو، باگەر لەگەڵ ٦ هەڤاڵیدا لەدەرەوەی گوندەکە وەک گرووپی بەرگری لە چاوەڕوانیدا دەبوون، شاهین و پالۆ و بەرچەم لەپێشی پێشەوە ڕێیان دەکرد، ئەو شوێنەی پێیدا هەڵگژان زۆر سەخت و ناخۆش بوو تەنانەت ئەنجامدانی ئەم کارە بە ڕۆژیش ناڕەحەت بوو، باران هەموو شوێنێکی تەڕ کردبوو ئەمەش وایکردبوو کە بخلیسکێن، لەکاتی هەڵگژاندا کە بەردێک لەژێر پێیان بخزایە لەوانەبوو بەم هۆیەوە هەستیان پێبکرێت، ئەگەر لەم حاڵەتەدا کەشف ببونایە کەسیان لە مردن ڕزگاریان نەدەبوو، بەڵام لەوەدەچوو بۆ یەکەمجاریان بێت کە باران سوودی پێیان بەخشیبێت، هەرچەندە چەندین جار بەردی گەورەش لەژێر پێیان ترازا و غلببۆوە، بەڵام بەهۆی دەنگی بارانەوە نەدەبیسترا، کە شاهین گەیشتە سەر گردەکە زۆر بە هەیەجان بوو، سەنگەرەکەی بینی، سەربازەکان لەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد، جلە بارانێکانی سەربازەکان ئەبریسکانەوە، شاهین خۆی نزیک کردەوە و نێوان ئەو و سەنگەری سەربازەکان هەرچەند مەترێک بوو، سەربازەکان پشتیان لە شاهین بوو تەماشای بەرزایەکانی ئەوبەری خۆیان دەکرد.

شاهین دەمی نایە گوێی پالۆ و پێیووت "تۆ ٢ ڕوومانەیان تێگرە و من و بەرچەمیش دوای تەقینەوەی ڕوومانەکان هێرشیان بۆ دەبەین، دوای ئەوەی سەنگەرەکان دەگرین ئێوەش هێرش بەرنەسەر سەنگەرەکانی تر"، پالۆ سەری بۆ ڕاوەشان و ڕەزامەندی خۆی نیشاندا، پێشوتر دیاریان کردبوو کەکێ پەلاماری سەنگەرەکان دەدات، لەبەرئەوەی سەنگەرەکان زۆر لەیەکەوە نزیک بوون گەریلاکان بۆئەوەی زەرەر بەیەک نەگەهێنن دەبوایە زۆر وریا بونایە، پالۆ ڕوومانەکانی دەرهێنا و پیمەکانی ڕاکێشا، لەم کات و ساتەدا جەستەی پارچە، پارچە بووی گۆرسێ هاتەوە بەرچاو لەگەڵ هەڤاڵە شەهیدەکانی تری.

یەک و دوو و سێ، شاهین وتی تێیان گرە، دوای ئەوەی پالۆ گوێی لە سێ بوو ڕوومانەکانی تێگرتن، هەمووی تەقییەوە، ئەگەر چرکەیەک زیاتر چاوەڕێی بکردایە لەوانەبوو لەناو دەستیا ڕوومانەکان بتەقینایەتەوە، شاهین و بەرچەم هێرشیان بردەسەر سەنگەرەکان، دەستیان بە چەکەکانیانەوە بوو چوونە ناو سەنگەرەکەوە، لەماوەی چەند چرکەیەکدا گردی دۆلۆبابا بوو بە دۆزەخ، لە چوارلاوە تەقە دەکرا، فیشەک بە ئاسماندا گیفەی دەکرد، شڵەژاوی و هاواری سەربازەکان پالۆی بەختەوەر کردبوو، کاتێک پالۆ شاهینی بینی کە سەنگەرەکەی گرتووە چووە پێشەوە، گەریلاکانی دواوەش هاتن و کەوتنە تەقەکردن، ژمارەی ئەو سەربازانە زۆربوون کەلە بەرزایەکەوە خۆیان فڕێدەدایە خوارەوە، ئەو سەربازانەی لە ترسی مردن خۆیان لە بەرزایەکە فڕێ دەدایە خوارەوە لەڕاستیدا بەهۆی خۆفڕێدانەکە ڕوبەروی مردنێکی ناخۆشتر دەبونەوە، دووەمین سەنگەر پێش پالۆ شاهین و بەرچەم گرتیان، ئەو سەربازانەی خۆیان مەڵاسدابوو کەوتنە تەقەکردن، بەڵام تەقەکردن لەوان لەلایەن گەریلاکانەوە زەحمەت نەبوو، لەیەکەم سەنگەردا ٥ سەرباز کوژرابوو، لەسەنگەری دووەمیشدا ٧ سەرباز کوژرا، سەنگەرەکانی گردی دۆلۆبابا درێژ دەبۆوە، شاهین هاواری دەکرد بەرەو پێشەوە، بەرەو پێشەوە، شاهین جارناجارێک دەچەمایەوە و قیت دەبۆوە، بەرەو پێشەوە دەچوو ڕادەوەستا و چەکی سەربازە کوژراوەکانی هەڵدەگرتەوە و دەچووە پێشەوە، کاتێک شاهین بەرەو سەنگەری سێیەم چوو چاوی کەوت بە پالۆ،

پالۆ به قامەکەیەوە بەسەر سەربازێکەوە ڕاوەستا بوو، شاهین دەیزانی پالۆ نیەتی چییە، ئەمە مایەی نیگەرانی و قەبوڵنەکردنی شاهین بوو، شاهین به توڕەبونێکەوە هاواری لێکرد، پالۆ بەم توڕەبونەی شاهین سەرسام ببوو، شاهین پێیووت "ئەوە چی دەکەیت؟ "پالۆش وتی "ئەوانیش وایان له هەڤاڵ گۆرسێ کرد "، شاهینیش پێیووت "ئەوان فاشیست و دڕنەدەن "، پالۆش وتی "ئێمەش شۆڕشگێڕین، ئەگەر تۆڵە نەکەینەوە ئەوا بەردەوام وامان لێدەکەن "، شاهینیش بەدەم هاوارەوە پێیووت "قامەکەت فڕێدە خێرا بڕۆ دەی "، ئەوەندە گەریلا ڕژابۆوە ئەم شوێنە لەناو خۆیاندا مەجالی ڕێکردنیان نەمابوو، شڵەژاوی و نەگونجاوی شوێنەکانی سەربازەکان سوودێکی باشی به گەریلاکان بەخشی بوو، سەربازەکان بۆئەوەی کەشف نەبن له ترساندا تەنانەت تەقەشیان نەدەکرد، جگه له هاوار و گریانی سەربازەکان و جگه له دەنگی تەقەی گەریلاکان تەقەی تر نەدەکرا، تەقە و دەنگی تەقینەوەی ڕوومانە ترسی خستبووە ناو دڵی سەربازەکانەوە، بەرچەم به تاقی تەنیا سەنگەرێکی گرتبوو، چووە ناو سەنگەرێکەوە، تەماشای سەربازەکانی دەکرد، بەسەریەکدا ڕژابوون، چەکەکانی کۆکردەوە، نیتاق و مەخزەنەکانی خستە ناو جانتایەکی سەربازیەوە، پالۆ کۆنتڕۆڵی سەربازە کوژراوەکانی ناو سەنگەرەکەی کرد، تەماشای سەربازەکەی هەرە ژێرەوەی کرد، بەسەردەمدا درێژ ببوو، سەربازەکانی تریش کەوتبوون به بانیدا، پالۆ پشتملی سەربازە کوژراوەکەی سەرەوەی گرت و وەریگێڕا، سەربازەکە هێشتا له ژیاندا بوو، به پالۆی وت "تکات لێدەکەم مەمکوژە "، بەرچەم و پالۆ تاسابوون، قسەی سەربازەکە کەبەدەم هەڵلەرزین و تەتەڵییەوە دەیکرد و داوای بەزەیی دەکرد دڵی بەرچەمی نەرم کردبوو، بێگومان ئەمە پالۆی نەدەگرتەوە، پالۆ به توڕەبونێکەوە وتی "نەیکوژین؟ ئەوکاتەی ڕیخۆڵەی هەڤاڵەکانمانی ئێمەتان به چڵەکاندا هەڵواسی لەکوێ بویت؟ "پالۆ چەکەکەی خستە سەر نێوچەوانی سەربازەکە، بەرچەم وتی "ڕاوەستە "، پالۆ له توڕەبونیدا دەلەرزی، بەڵام سەربازەکە له ترساندا، سەربازەکە وتی "من ئاگام له هیچ نییە "، بەرچەمیش وتی "ناتکوژین "، پالۆ به سەرنجەوە له بەرچەمی دەڕوانی، پالۆ وتی "چۆن نایکوژین "، بەرچەمیش

پێیووت "ئەم سەربازە ناکوژین، دەستی لەدواوە ببەستەوە". بەرچەم چوو بۆ سەنگەرێکی تر، هێشتا تەقەکردن بەردەوام بوو. پالۆ چاوی بە شاهین کەوت کە بە سەنگەرەکاندا دەگەڕا، شاهین دەچووە هەر سەنگەرێکەوە ڕێنمایی دەدا بە گەریلاکان. شاهین هاواری کرد و وتی "پاشەکشێ دەکەین، هەتا دەتوانن چەکەکان کۆکەنەوە، کوژراوەکان بژمێرن، ئەوکاتەی فیشەکێکی گڕدار تەقێنرا دەکشێینەوە". شاهین کەبە شێوەی چەماوە لە نزیک سەنگەرەکەی پالۆ تێپەڕی چاوی کەوت بە پالۆ کە ڕاوەستا بوو. شاهین لێی پرسی "چاوەڕێی چی دەکەیت؟ "پالۆش وتی "سەربازێکمان گرتووە کەرواڵە بەرچەم خانم وتی مەیکوژن، خۆبەمەوە خۆمان خەریک ناکەین". لەراستیدا وەکو پلەی گەریلایەتی پالۆ لە بەرچەم گەورەتر بوو. پێویستی بەوە نەدەکرد کە فەرمان لە بەرچەم وەربگرێت. بەڵام لەبەرئەوەی بەرچەم وتی مەیکوژە دەستی تێنەدەچوو. ئێستاش دوو قسەی شاهین بۆ پالۆ بەس بوو. شاهین وتی "مەیکوژە". پالۆ بەم قسەیەی شاهین تاسابوو. پالۆ وتی "ئەوە چیتان لێهاتووە ئەمڕۆ هەمووتان بوونە بە پارێزەری مافی مرۆڤ". کاتێک شاهین بە تێڕوانینێکی تورەبونەوە تەماشای کرد ئیتر پالۆ هیچی نەووت، هەرچۆنێک بێت شاهین فەرماندەی بوو، پالۆ زۆر ڕێزی شاهینی دەگرت، کاتێک شاهین دوورکەوتەوە پالۆ تەماشایەکی سەربازەکەی کرد. چەمایەوە و لەپەنای گوێی سەربازەکە وتی "خەڵکی کوێیت؟ ""ئۆردوو". پالۆ وازی لێهێنا. فیشەکێکی گڕداریان تەقاند. پالۆ جارێکی تر تەماشای سەربازەکەی کردەوە، دوایش پێیووت لەسەردەم درێژ بەو لەوێ دوور کەوتەوە.

ئەم چالاکییە ماوەی کاتژمێرێکی خایاند و چەندین سەرباز کوژرا، ژمارەی ئەو سەربازانە نەدەزانرا کەلە بەرزایەکاندا خۆیان هەڵدابۆوە خوارەوە، دەستیان گرت بەسەر ٣٧ چەک و چەندین مەلزەمەی تری سەربازی. کاتێک فیشەکە گڕدارەکە تەقێنرا دەمەو بەیانی بوو، گەریلاکان تەماشای یەکتریان دەکرد و پێدەکنین، بەبێ ئەوەی هیچ شەهیدێکیان هەبێت پاشەکشێیان دەکرد.

لەدوای هەموویانەوە پالۆ و بەرچەم چاوەڕێی کشانەوەی هەموو گەریلاکان بوون. بەرچەم لە سەنگەرێکی نزیک لەخۆی چاویکەوت بە ساریا و

ئاریا، ئیشارەتی بۆکردن کە پاشەکشێ بکەن، ئاریا وتی "سەرەتا تۆ پاشەکشێ بکە ". ئاریا لەسەر حەق بوو، دەبوایە سەرەتا پالۆ و بەرچەم بکشانایەتەوە پاشان ئەمان، شێوازی پاشەکشێیان بەو شێوەیە دیاریکردبوو، ئەو یەکەم سەنگەرەی شاهین گرتی شوێنەکەی کار ئاسانی بۆ گەریلاکان دەکرد کە لەوێوە بەرەو زنێیەکە شۆڕببنەوە، کە هەموو گەریلاکان کشانەوە شاهین بەرەو ئەو سەنگەرە چوو کە بەرچەمی لێبوو، شاهین بە خەندەیەکەوە پێیووت "دەی ئەکشێینەوە "، بەرچەم و پالۆ لە سەنگەرەکە دەرچوون و ئاریا و سارباشیان لەگەڵ خۆیاندا برد، شاهین لەدواوە مابۆوە، کاتێک ویستیان شۆڕببنەوە بەرەو زنێیەکە گوێیان لە دەنگی تەقە بوو، هەر چواریان ئاوڕیان بۆدواوە دایەوە، شاهینیان بینی لە زەوی درێژ بووە، بەرچەم بە ڕاکردن خۆی گەیاندە لای شاهین، فیشەک بەر ملی شاهین کەوتبوو، بەرچەم وتی سەنگەر بگرن، پالۆ بەڕاکردن خۆی خستە ناو سەنگەرێکەوە، ئاریا و سارباش لە نزیک پالۆ سەنگەریان گرت، بەرچەم شاهینی بۆلای یەکەم سەنگەر ڕاکێشا، شاهین هێشتا لە ژیاندا بوو، بەرچەم دەیویست بە جامانەکەی ملی شاهین ببەستێت، شاهین دەمی دەجولایەوە وەک ئەوەی بیەوێت شتێک بڵێت، برینەکەی زۆر مەترسیدار بوو، شوێنێکی زۆر حەساسی بریندار ببوو، کاتێک بەرچەم ویستی ملی شاهین ببەستێت بە جامانەکەی کە ملی شاهینی بینی لە جدیەتی مەسەلەکە تێگەیشت، ئەگەر هەناسەشی بدایە ماوەیەکی تر بەهۆی خوێن چونەکەیەوە دەمرد، بەرچەم وتی "قسە بکە، هاوار بکە، توڕە بە شتێک بڵێ "، بەڵام هەر ئەوکاتە بەرچەم لە قسەکانی خۆی پەشیمان بۆوە، دەم جوڵانەوەی شاهین و غڕە، غڕی قوڕگی و هەوڵی قسەکردنی شاهین بەرچەمی شێت و هار کردبوو، لەوەدەچوو ئەوکاتەی ڕۆحی لە جەستەی جیادەبۆوە ئازاری دەچێژا، ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کە ڕۆح لە بەدەنی شاهین جیاببێتەوە، بەرچەم لە ورتە ورتەکانی شاهین حاڵی نەدەبوو، ئەمە لەوانەبوو درێژترین کات و ساتی بەرچەم بوبێت کە بەدیار شاهینەوە مابۆوە، شاهین خۆشەویسترین هەڤاڵی بوو، سەرەڕای هەموو ئەو شەڕەی نێوانیان شاهین هەموو شتێکی دەکرد کە تەنها بەرچەم هیچی لێنەیەت ئێستاش لەبەرچاویدا شاهین گیانی دەدا، ئەمە ئازارێکی

گەورەبوو بۆ بەرچەم، بەرچەم هەستی بەوە نەدەکرد کە شاهین لە ژیاندایە یان مردووە، بەرچەم وتی "هیچت نییە خەمت نەبێت ئەمەش بەسەر دەچێت"، شاهین چاوەکانی داخست هیچ قسەی نەکرد، ئەو خوێنەی لە دەمی دەهاتە دەرەوە کەوتبووە سەر جلوبەرگی بەرچەم، دەست و سەر ڕانی بەرچەم لەخوێندا بوو، خوێن ڕژانەکەی جەستەی شاهین هەروەکو ڕۆح دەرچونەکەی کپ و خامۆش بوو، شاهین چاوەکانی داخستبوو، دەنگێکی تر لە دەمی هاتە دەرەوە، دیاربوو ئازاری دەچێژا، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، لەناکاو شاهین هەموو بەدەنی و دەموچاوی ساردبۆوە، لەوەدەچوو کە کەوتبێتە ناو دەریای خەوەوە، بەرچەم چەند جارێک وتی "شاهین، شاهین"، بەڵام وەڵامی نەدایەوە، بەرچەم دەیویست باوەڕ بە وەسوەسەکانی ناخی نەدات و زۆر سادانە ڕەفتاری لەگەڵ دەکرد، بەرچەم پێیوابوو کەلەوانەیە شاهین چاو هەڵبێنێت و پێیان بڵێت چاوەڕێی چی دەکەن و دەی بڕۆن چەکەکانیش کۆکەنەوە، کێ باوەڕی دەکرد شاهین لێبدرێت و بمرێت، ئەمە کارێکی چاوەڕوان نەکرابوو، کێ باوەڕ بەمە دەکات؟ بەرچەم گوێی نا بە دەمی شاهینەوە هیچی نەدەبیست.

پەنجە خوێناوێکەی خستە سەر ملی و لەناکاو بەرچەم قیژەیەکی کرد و وتی "شاهین شەهید بوو"، پالۆ و ئاریا و سارباش گوێیان لە دەنگی بەرچەم بوو، ئەم دەنگە پڕ لە ئازارە دەتوانرا بە درێژایی چەند کم یێکیش ببیسترێت، پالۆ لە خەفەتدا لە سەنگەرەکە هەڵدەلەرزی، بەرچەم بەڕاکردن خۆی گەیاندە لای پالۆ، بە پالۆی وت "دەی بابڕۆین"، پالۆ پێیووت "ئێوە بڕۆن من تەرمەکەی شاهین دەهێنمەوە"، بەرچەم کە چاوی کەوت بە فرمیسکەکانی چاوی پالۆ ئیتر گریانەکەی خۆی نەشاردەوە، وەک منداڵ دەگریا، ئەم گریانە پالۆی زۆر غەمبار کرد، لەناکاو گوێیان لە دەنگی دوو کۆپتەری کۆبرا بوو، هەدەفی یەکەمیان گردی دۆلۆبابا بوو، کۆبراکان موشەکیان گردە سەر گردەکە کە سەربازی خۆیشیانی تیابوو، پارچەی جەستەی سەربازە کوژراوەکان دەچوو بە ئاسماندا، پالۆ وتی "ئێوە ڕاکەن"، بەرچەم بە ڕاکردن گەڕایەوە بۆلای تەرمەکەی شاهین، ئاریا و ساریا نیشانیان لە کۆپتەرەکان گرتبوو، پالۆ بە لاشەی سەربازە کوژراوەکان سەنگەرەکی خۆی قایم کرد، پالۆ لەلایەکەوە

تەقەی لە کۆپتەرەکان دەکرد لەلایەکی تریشەوە ئەو سەربازانەی دەبینی کەلە سەر لووتکەی گردەکەوە بەرەو ڕووی دەهاتن.

# ٣٥

گەریلاکانی ناو سەنگەرەکانی ڕێگەی دەرسیم و نۆڤاجک لە چاوەڕوانیدا بوون، بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی ئیبراهیم لە بێتەلەکەوە زانیبووی کاروانێکی هێزی دوژمن بەرەو ڕوویان دەهات. ئیبراهیم و مەزڵوم بۆ کۆنترۆڵکردنی گەریلاکان بە سەنگەرەکاندا دەگەڕان، دوای ماوەیەک کاروانی هێزی سەربازی دوژمن لێیان نزیک بۆوە، دەموبەیانی باران ڕاوەستا بوو، تیشکی خۆر هێواش، هێواش ئەو ناوچەیەی ڕووناک دەکردەوە. دوای چاوەڕوانی دوو ڕۆژ لەناو ئەم قوڕ و چڵپاوی سەنگەرانەدا لەژێر باراندا ئێستاش دەرکەوتنی ئەم خۆرە هەموو سەرمای لەشیانی دەڕەواندەوە. بەڵام ئێستا کاتی خۆگەرم کردنەوە نەبوو. دەبوایە بەبێ ئەوەی هیچ جموجۆڵێک بکەن چاوەڕێی کاروانی سەربازی دوژمنیان بکردایە. لەناکاو گوێیان لە دەنگی ماشێن بوو، ئاوی مونزووریش خوڕەی دەهات، دونیا کش و مات بوو، هەموویان لەناو هەیەجاندا بوون، گەریلاکان سەرنجی خۆیان لەسەر نزیک بوونەوەی دەنگی ماشێنەکان کۆکردبوو. دەنگی ئەو ماشێنانەی دەبیسترا لەوانەش بوو کاروانی سەربازی دوژمن نەبوایە. بەڵام کە دەنگەکان تا دەهات نزیک دەبونەوە لە گەورەیی دەنگەکان حاڵی بوون کە کاروانی سەربازییە.

لە سەنگەرەکە تەماشایان کرد کە کاروانی سەربازی دوژمن لێیان نزیک دەبێتەوە، هەموویان ئامادەی دەستکردنەوە بوون، زرێپۆشێک لە پێشەوە بوو، لەدواشەوە بە شێوەی ناوبڕ ماشێنی سەربازی دەهاتن. دەیان ماشێنی سەربازی بوون، لەوانەبوو هێشتا کلکی ماشێنەکان لە دەرسیمدا بێت، کەمێکی تر ئەو ڕێگەیەی دەگەیشتە ئاوی مونزوور وەک ڕۆژی حەشری لێدەهات، ئیتر کاروانی سەربازی دوژمن کەوتبووە داوی گەریلاکانەوە کە بە درێژایی ٢ کم بۆیان دانیشتبوون.

زرێپۆشەکەی یەکەم لە گەریلاکان تێپەڕی. زیلەکانی تری دواوە مارکەی لاندلۆفەر بوون، لە نێوان هەر ٤ یان ٥ زیلێک زرێپۆشێک هەبوو، سەری زیلەکان دانەپۆشرابوون، ئەمەش بۆ گەریلاکان کارێکی باش بوو، گەریلاکان چاوەڕێی فەرمانی دەستکردنەوەیان دەکرد. یەکەم تەقە دوای تێپەڕبوونی

یەکەم زریپۆش دەکرا، دوایش گەریلاکانی ناو سەنگەرەکانی یەکەم ( کم ) دەستیان دەکردەوە، سەربازەکانی ناو زیلەکان زیاتر لە شێوەی ڕامبۆ خۆیان قەشەنگ کردبوو، دەموچاویان بە ڕەنگی ڕەش و کەسک بۆیە کردبوو، پەڕۆی سەربازیان لە نێوچەوانی خۆیان بەستبوو، بەتەواوەتی خۆیان وەک ڕامبۆ لێکردبوو.

دوای ئەوەی ماشێنەکان کەوتنە ناو داوی گەریلاکانەوە فەرمانی دەستکردنەوەیان بۆدەرچوو، لەیەک کاتدا هەموو چەکەکانی گەریلاکان کەوتنە تەقە کردن، هەموو گەریلاکان لە سەنگەرەکانی خۆیانەوە چەکەکانیان هێنابووە دەرەوە و تەقەیان لە زیلەکان دەکرد، لەیەک کاتدا هەزارەها فیشەک دەتەقێنرا و ئاربێجییان دەتەقاند و ڕوومانەیان تێدەگرت، ئەو ناوە وەک دۆزەخی لێهات، هەندێکجار دەنگی هاواری سەربازەکان لە دەنگی تەقەکان بەرزتر دەبونەوە، سەربازەکان بەتەواوەتی شڵەژاو ببوون، دائەبەزین و بە چەپ و ڕاستدا ڕایاندەکرد، ئەوانەی یەکەمجار پێکران لە ناو زیلەکان و سەر جادەکان هەموویان کوژران، ڕێگەکان خەڵتانی خوێن ببوو، ئەگەر سەربازەکان لە زیلەکان داببەزینایە لەسەر جادەکە لێدەدران، ئەگەر لەناو زیلەکەش بمانایەتەوە بە تەقینەوەی ڕوومانەکانی گەریلاکان هەر دەکوژران، ڕوومانە و ئاربێجێکان گوێی سەربازەکانیان کەڕ کردبوو، سەربازەکان نەیاندەتوانی دەست بکەنەوە، تەنانەت سەربازیان تێدا هەبوو کە تەنها فریای ئەوە دەکەوت کە خۆی بخاتە ناو ئاوی مونزوورەوە، بەگوێرەی گریمانەی گەریلاکان بێت بەلای کەمەوە ٢٠ زیل و زریپۆش کەوتۆتە ناو بۆسەکەیانەوە، بەڵام ژمارەی ماشێن و زیلەکان لەمە زیاتر بوون کە تەخمینیان کردبوو.

لەبەرئەوەی فیشەک کاریگەری لە زریپۆشەکان نەدەکرد جگە لە زریپۆش هەموو ماشێنەکانی تر بە فیشەک وەک هێڵەکیان لێهاتبوو، بەدرێژایی ٢ کم دووکەڵ بە ئاسماندا بەرز ببۆوە، ئەم دەستکردنەوە و شەڕکردنە ماوەی کاتژمێرێکی خایاند و چواردەوری ماشێنەکان هەمووی خوێن بوو، تەنانەت نەدەتوانرا سەربازە کوژراوەکانیش بژمێرن، بە ئەقڵی کێدا دەهات بەم کازێوەی بەیانییە لەم شوێنە ڕووتەڵەدا گەریلا بۆسە دابنێت، ئەم

کاروانی سەربازییە بەڕێکەوتبوون بۆ بەهاناچوونی هێزەکانی دۆلۆبابا، بەڵام نەیانزانی کە خۆیان دەکەونە ناو داوەوە، ئیتر لەوە نەدەچوو کە هێزی فریاکەوتنی تر بگات، چەکی سەربازە کوژراو و هەڵاتۆکان بەسەر جادەکەدا بڵاوبۆوە، مەزڵوم وتی "چەکەکان کۆکەنەوە"، ئیبراهیم زۆر لایەنگری ئەم مەسەلەیە نەبوو، پێیوابوو واباشترە کە کەمێکی تر چاوەڕێ بکەن، ئیبراهیم هێشتا وەڵامی مەزڵومی نەدابۆوە مەزڵوم لەسەنگەرەکەی خۆی دەرپەڕی، دوایش گەریلایەکی تر، مەزڵوم کەوتە چەک کۆکردنەوە و هەرچەکێکی هەڵبگرتایەتەوە ئەیخستە سەر شانی، دوای ماوەیەک ئەوەندە چەکی کۆکردەوە کە ئیتر پێی هەڵنەدەگیرا مەخابن بیری لە گەڕانەوە نەدەکردەوە، مەزڵوم لەژێر زیلێک کە دووکەڵی ڕەشی لێ بەرز دەبۆوە چەکی حەفارۆفی بینی، چەکەکانی سەرشانی داناو خۆی خستە ژێر زیلەکەوە، ئەوکاتە سەربازێکی بینی کەلەوبەرەوە نیشانی لێگرتۆتەوە و ڕووبەرووی یەک بونەتەوە، ئەوکاتەی ویستی دەست بۆ چەکەکەی بەرێت فیشەکێک نرا بە ئەژنۆیەوە، مەزڵوم ئۆفێکی کرد و بەلادا خۆی درێژ کرد و کەوتە تەقە کردن، بەڵام نەیدەتوانی نیشان بگرێتەوە، دوایش سەربازی تر تەقەیەکی زۆریان لە ژێر ماشێنەکە کرد، دوای ماوەیەکی کورت مەزڵوم بە تەقەیەکی تری هەمان سەرباز بەلاداهات.

گەریلاکانی تریش وەک ئیبراهیم لەسەرەوە تەماشای ڕووداوەکانیان دەکرد، بەڵام نەیاندەتوانی کە بزانن کێ و لەکوێوە تەقە دەکات، ئەو سەربازەی کەلە پشتی ماشێنەکەوە خۆی مەڵاسدابوو دەیتوانی بە ئاسانی تەقە لەو گەریلایانە بکات کە دەهاتنە خوارەوە، گەریلاکان بەو نیازە نەبوون کە تەرمەکەی مەزڵوم بەجێبهێڵن، دوو گەریلا زۆر بە خێرایی لەسەنگەرەکەی خۆیان هاتنە دەرەوە و خۆیان گەیاندە لای مەزڵوم. سەربازەکە لە هەردوو گەریلاکەیدا، ئەوەی بڕۆشتایە فیشەکی بەردەکەوت، ئیبراهیم تاسابوو، بەگریلاکانی وت "کەس نەچێتە سەرجادەکە"، هەتا ئەم فەرمانەی ئیبراهیم گەیشتە سەنگەرەکانی تر دوو گەریلای تر چوونە خوارەوە، ئەم دوو گەریلایانە زۆر بە وریایانە دەجوڵانەوە، دەیانویست بزانن لە کوێوە تەقە دەکرێت، ئەو سەربازانەی کەلە مەزڵوم نزیک بونەوە سەرەتا فیشەک بەرقاچیان کەوت،

دوایی کە کەوتن هەموو جەستەیان درایە بەر فیشەک، بەبێ هیچ هۆکارێک و بەبێ ئەوەی پێویستیش بکات ٦ گەریلا شەهید بوون، ئەوکاتەی دەویستترا تەرمەکان ڕزگار بکەن شەهید بوونی تر دەهاتە ئاراوە، ئیبراهیم وتی "کەس نەچێتە خوارەوە بۆ جادەکە، پاشەکشێ دەکەین". ئەوکاتەی خەریک بوو بکشێنەوە لەناکاو ئیبراهیم ٨ گەریلای بینی کە چوونە خوارەوە، ئیبراهیم بەمە سەرسام ببوو، لەناکاو دەنگێک پێیووت "باشتان کرد"، بەڵام لەلایەکی ترەوە لەوە دەترسا کە شەهید بوونی تر بێتە ئاراوە، گەریلایەک بەرەو مەزڵوم کەوتەڕێ، بەڵام ئەویش وەک ئەوانی تر لێدرا، دوایش ئەوانەی تر کە هاتن دوانیان لێدرا، ئیبراهیم پڕ بە دەمی خۆی هاواری دەکرد پاشەکشێ دەکەین، دوایش ئیبراهیم دوو گەریلای بینی کەلەپشت زبلەکە سوڕانەوە، ئەو سەربازەی کە تەقەی لێیان دەکرد نەیدەزانی کە دوو گەریلا سوڕانەوە پشتی، ئەو دوو گەریلایەی سوڕابونەوە ڕێک چوونە پشت سەربازەکەوە، بینیان کە خۆی درێژ کردووە و تەقە دەکات، هەردووکیان هەردوو مەخزەنی چەکەکەیان نا بە سەربازەکەوە و کوشتیان و لە شیان کرد بە هێڵەک، ئەو گەریلایانەی چوبونە خوارەوە و لێدرابوون ٤ یان هێشتا لەژیاندا بوون، هەتا توانیان چەکیان کۆکردەوە و پاشان سەرکەوتنەوە، پاشەکشێیان کرد و هەموویان بەرەو دەمەنان کەوتنە ڕێ کەلەم کات و ساتانەدا هێشتا شەڕ لە گردی دۆلۆبابا بەردەوام بوو.

# ٢٦

پالۆ و بەرچەم و ساریا و ئاریاش لە سەنگەری جیاوازدا بوون، ئاریا و ساریا تەقەیان دەکرد و نەیاندەهێشت سەربازەکانی بەشی چەپیان بێنە پێشەوە، پالۆش تەقەی لەو سەربازانە دەکرد کە لە سەر لووتکە بەردەڵانێکەی سەرەوە دەهاتنە خوارەوە، کاتێک پالۆ یەکەمجار بینی شاهین پێکراوە نیتر لەبارەی خۆیەوە بڕیاریدابوو، لەم سەنگەرە بە زیندوویی دەرنەدەچوو، بڕیاریدابوو کە تا دوا هەناسەی لەم سەنگەرەدا شەڕ بکات، چواردەوری خۆی بەلاشەی سەربازە کوژراوەکان گرتبوو بەم شێوەیە خۆی لە فیشەکەکان دەپاراست، ئەو خۆی بۆ شەڕێکی دەم درێژ ئامادەکردبوو، هەتا شەڕەکە درێژەی بخاندایە گەریلاکانی تر ئەوەندە ئاسانتر دەیانتوانی پاشەکشێ بکەن، بەم شێوەیە بواری زیاتری بۆ دوورکەوتنەوەی گەریلاکان و بەدەست خستنی کات بۆ گەریلاکان بەرقەرار دەکرد.

بەرچەم تەماشای جەستە خوێناوێکەی شاهینی دەکرد، نەیدەویست باوەڕبکات کە شاهین شەهید بووە، شاهین چەندین ساڵە لەناو شەڕدا بەهەر شێوەیەک بێت خۆی لەفیشەکی وێڵ ڕزگار کردبوو، بەڵام بیرکردنەوە لەوەی کە ئێستا بووەتە قوربانی یەک فیشەک ئەمە مایەی دڵتەزێنی بوو، بەرچەم بەتایبەت کە بیری لە دوا شەڕەکەی نێوانیانی دەکردەوە زیاتر غەم دایدەگرت، ناخی خۆی خواردبوو، تەنانەت نەشیدەزانی کە ئایا شاهین لێی خۆش بووە یان نا، هەستی بە ئازاری ویژدان دەکرد کە نەیدەزانی کە لەم بارەیەوە شاهین چۆن بیری کردۆتەوە، دوای ئەم هەموو شتانە ئیتر هۆکارێکی گرنگ نەمابوو بۆ ژیان، شوێنەکەی بەرچەم ئەو سەنگەرەبوو کە دوژمن دەیتوانی زۆر بە ئاسانی چواردەوری بگرێت، ئەگەر سەنگەرەکەی بگیردرایە ئەوکاتە نۆبە دەهاتەسەر سەنگەری ئاریا و ساریا، پێیوابوو ئێستا لە جیاتی بیرکردنەوە لە هاتنە ئاراوەی ڕووداوەکان تەماشای جەستەی خوێناوی شاهین بکات، کاتژمێر ٨ ی بەیانی سەربازەکان چواردەوری هەموو سەنگەرەکانیان گرتبوو، پالۆ شەڕی دەکرد و نەیدەهێشت سەربازەکان لەسەرەوە بێنە خوارەوە.

پالۆ دانە، دانە فیشەکی دەتەقاند، بەرچەم بە پێویستی نەدەزانی

وەڵامی ئەو تەقانە بداتەوە کەلێی دەکرا، سەربازەکان تەقەیەکی زۆریان لە سەنگەرەکانیان دەکرد، بەرچەم حەوسەڵەی ئەو هەموو فیشەکانەی نەمابوو کە پێیانەوە دەنا، بەرچەم دانە، دانە تەقەی نەدەکرد بەڵکو وەک سەربازەکان هەتا مەخزەنەکەی خاڵی نەکردایە تەقەی ڕانەدەگرت، لەماوەی کاتژمێرێکدا هەموو فیشەکەکانی تەواوکرد، لەلایەکی تریشەوە فیشەکی مەخزەنەکانی شاهینیشی بەکار دەهێنا، کە فیشەکەکانی تەواو بوون کەوتە چاوەڕوانییەوە، سەربازەکان هاواریان لە سەنگەرەکەی بەرچەم دەکرد "خۆت ڕادەست کە"، کە گوێی لەم قسانە دەبوو خەریک بوو شێت ببێت، جارێکی تر بەرچەم کەوتە تەماشاکردنی تەرمەکەی شاهین، بەخۆشی و تاڵیشیانەوە هەموو ڕابردووەکانی خۆی هێنایەوە بەرچاو، بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە کە هاتبوو بۆ هێنانەوەی دادەی و دوایش ببوو بە گەریلا و بیریشی لە شەڕی نێوان خۆی و دادەشی دەکردەوە، ماوەیەکی زۆر بەسەر زەمانی گەریلایەتی تێپەڕی بوو، بیریکردەوە و هەر بیریکردەوە هەتا ماندوبوو، لە شوێنی خۆی نەدەجولا، بیری لەوە دەکردەوە کەلەماوەی چەند ساڵێکدا زۆر شتی بینیوە، لەناکاو دەنگی "خۆت ڕادەست کە "بەرچەمی هێنایەوە ناو سەنگەرەکە.

کەمێک سەری بەرز کردەوە، سەدان فیشەکیان پێوە نا، جارێکی تر سەری نەوی کردەوە، بەخۆی وت دەبێت دوژمن نەزانێت کە شاهین شەهید بووە، ئەگەر تەرمی شاهینیان ببینیایە بێگومان لەخۆشیاندا گەشکە دەیانگرێت و ئەمە بەسەرکەوتنێکی مەزن دەزانن، بەرچەم نەیدەویست دڵی دوژمنیان خۆشبکات، دوو ڕوومانەکەی قەدی خۆی کردەوە، پیمەکانی ڕاکێشا، خۆی دایە بان شاهین، ڕوومانەکانی لە نێوان خۆی و شاهین دانا، چاوەکانی داخست، ناو لەپی شلکردەوە، دوای چەند چرکەیەک لەناکامی تەقینەوەی ڕوومانەکان پارچە گۆشت بە ئاسماندا بەرز بۆوە.

ئاریا و ساریا و پالۆش گوێیان لەم تەقینەوەیە بوو، پالۆ تەماشای سەنگەرەکەی بەرچەمی کرد، هیچی نەووت، نەشیدەزانی کە هەست بەچی دەکات، خوێن و پارچە گۆشتی جەستەی شاهین و بەرچەم بەهەموو لایەکدا بڵاوبۆوە، بەم شێوەیە هەردووکیان نەدەناسرانەوە، سەربازەکان چوونە

سەنگەرەکەی بەرچەمەوە. ئەمجارەیان نۆبەی سەنگەرەکەی ئاریا و ساریا بوو.

بەوانیشیان دەووت کە خۆیان ڕادەست بکەن، ئەم دوو گەریلایە تازە بە تازە هۆشیان هاتبووە سەرخۆیان و یەکەم شەڕی دەستەویەخە بوو کە بەشداری تێدابکەن لەهەمانکاتدا هەستیان دەکرد کەلە کۆتایی ژیانیان نزیک بونەتەوە، ساریا وتی "ئەمجارەیان ئێرە دوا مەنزڵمانە". ئاریا تەماشای چاوە جوان و شینەکانی ساریای دەکرد، بەهێمنییەک بە ساریای وت:

"بەرچەم شەهید بوو".

"بەڵێ".

"پالۆ لە شەڕدایە".

"ئێمەش شەڕدەکەین".

"بەڵێ ئێمەش شەڕ دەکەین".

ساریا سەری کەمێک هەڵبڕی و بە هەموو توانای خۆی هاواری کرد و بە سەربازەکانی وت "بەناوی یاسای دادپەروەری پەکەکە وە بانگتان لێدەکەم خۆتان ڕادەستی ئێمە بکەن"، ئەم قسانەی ئاریاشی سەرسام کردبوو، ئەم قسەیە بۆ دوژمن زۆر گران بوو، وەک فیشەک وابوو نایبێتی بە دڵی هەریەکەیانەوە، کە سەربازەکان هیچ وەڵامێکیان نەدایەوە ساریا سەری بەرزکردەوە و ئەمجارەیان بە سەربازەکانی وتەوە "ئەگەر خۆتان ڕادەست بکەن هیچتان لێناکەین". تەقەکردن نەمابوو چواردەوریان کپ ببوو، ساریا بە ئاریای وت "حەزدەکەیت سەنگەرەکەمان دەگۆڕین و دەچینە لای پالۆ"، ئاریا تەماشای چواردەوری خۆیانی کرد، لەوەدەچوو کە هیچ سەربازێک لەو ناوە نەمابێت، ئاریا وتی "بابڕۆین"، ساریا بۆئەوەی لە سەنگەرەکە دەرچێت خۆی قیت کردەوە، ئەوکاتە تەقەیان لێکرد و فیشەکی بەرکەوت و کەوت بەسەر شانی ئاریادا، ئەو فیشەکەی بەر پشتی کەوتبوو لە سنگێوەی دەرچوو، دەموچاوی ساریا زەرد هەڵگەڕابوو، دوایش لە هەناسە کێشان ناڕەحەتی بۆ درووست بوو، لێوەکانی مۆر هەڵگەڕا و چاوەکانی بە ناڕەحەت بەیەکدا دەهات، ئاریا باوەشی پێداکرد، توند توند بەخۆیەوە گوشی، لەبەرئەوەی

هەناسەی بەباشی پێنەدەدرا ئیتر ئاریا لەباوەشیا سارىاى شل كردەوە، ئاريا پێی ناخۆش و پێی نەنگ بوو كە دواى ٤٠ ڕۆژ برسێتی نەمردن ئێستا بەیەک فیشەک ساريا گيان لەدەست بدات، ئاريا پێيووت "نەكەی بمريت"، ساريا چاوەكانى نوقاند، سۆما شينەكانی كەوتنە ژێر پەردەی پێڵوكانى، سەرى سارياى نا بە سنگێوەی، دوایش نێوچەوانی ماچكرد، دەستی كرد بە گريان، كەبيرى لەدوا شەڕەكەی نێوانيانی دەكردەوە زياتر دەگريا، فرمێسكەكانى ئەڕژانە سەر دەموچاوی ساريا، هەرچيەكی دەكرد نەيدەتوانى ساريا لەخۆی بكاتەوە، وايدەزانى ئەگەر لەباوەشی بگرێت ئاسودەتر دەبێت، ماوەيەک بێدەنگ مايەوە، تەماشايەكی دەموچاوی سارياى كرد، جگە لە ڕەنگ زەردێكەی هیچی تری نەدی، دەموچاوی وەک دەموچاوی فريشتە جوان و بێگەرد بوو، ئاريا بە ئەسپایی سارياى لە سەنگەرەكە درێژ كرد، ئيتر ڕزگاربوون مەحاڵ بوو، زاتەن ژيان هيچ مانايەكی نەمابوو، چەكەكەی گرتە دەست و قيت بۆوە، هيچی پێنەدەكرا جگە لە چاوەڕوانی تەقەی ئەو چەكانەی كە ڕوويان تێكرد بوو، لەسەرخواستی خۆی چوو بەرەو پيری مەرگەوە، لەناكاو سەدان فيشەک نران بەو بەدەنە ناسكەی ئارياوە، لەناو سەنگەرەكە لەلای ساريا بەلادا هات، بەدرێژايی ئەو بەيانييە لە گردی دۆلۆبابا دەنگی تەقە بەردەوام بوو.

پالۆ بەتەنيا بەرخودانی دەكرد، ئەوكاتەی دوائاربێجيیان پێوەنا بەتەواوەتی ڕۆژ ببۆوە، ئەو گەريلايانەی پاشەكشێيان كردبوو لە بێتەلەكەيانەوە گوێيان بۆ گۆڕانكاری ڕەوشەكە ڕاگرتبوو، بۆدواجار گوێيان لێبوو ئەفسەرێک لە بێتەلەكەوە بە سەربازەكانی دەووت "كوشتنيان بەس نييە بيانسوتێنن"، لەسەر گردی دۆلۆبابا پالۆ لەگەڵ ئاريا و ساريا و بەرچەم و شاهين بەيەكەوە سوتێنران.

.(كۆتايی).

پێشکەشە بە ڕەوانشاد محەمەد گونەش و سەیفەدین نۆزێر و عیززەت یاماچ کەلە ساڵی ١٩٩٧ لە هەرێمی دەرسیم شەهید بوون.
ئەدیب یاڵچنقایە.

ئەدیب یاڵچینقایە لە ساڵی ١٩٧١ لە شاری بیتلیس لەدایک بووە، لە ساڵی ١٩٩٠ بەشداری ناو ڕیزەکانی پەکەکە بووە، لە ساڵی ١٩٩٢ دەستگیر دەکرێت و دادگای دەوڵەتی تورک زیندانی هەتاهەتایی بەسەردا سەپاندووە، تاکو ئێستاش لە شاری چانکری لە زیندانی جۆر (ی) لەزینداندایە لە تورکیا.



Edip yalçınkaya

باگەر دەستی درێژکرد بۆ ناو قەدی دڵگەش و
دەمانچەکەی دەرهێنا، میلی هێنایەوە.
دڵگەش ووتی " پێویست بە خۆکوشتن ناکات لەوانەیە ئێرە
نەدۆزنەوە"،
دڵگەش زۆر هەوڵیدا و ئەوەی لەدەستی هات کردی تاکو باگەر
لە خۆکوشتن پاشگەز بکاتەوە، باگەر ماوەیەکی زۆر بوو
پێنەکەنی بوو بە خەندەیەکەوە بە دڵگەشی ووت:
" ئەمە جەنگە، ئێمە خۆمان بۆ مردن ئامادەکردووە وانییە؟
من ناتوانم رێگا بدەم کە بە دیلی بمگرن، ئەمە وەک خیانەت
هەژمار دەکرێت، تۆ پێویستە لەمە حاڵی ببیت، کەزانییان بە دیلی
دەگیرێین و دەکەوینە دەستی دوژمن دەبێت تۆ بمکوژیت،
ئەگەر بە دیلی بکەومە دەستی دوژمن ئەمە دەبێتە هۆکاری بەرز
بوونەوەی ورەی دوژمن،
من ناتوانم لەهەمبەر ئێوە و گەل و
خۆشمدا خیانەت بکەم.

بەرگ: ابیراهیم صاڵح